کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا

# کوردستان لە کتێبی تەقویم ئەلبولدانی ئەبولفیدای ئەیوبی

موحسین مامل محەمەد




٦

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا نامەیەکی ماستەرە پێشکەشی بەشی مێژوو/ کۆلێژی ئەدەبیات – زانکۆی سەلاحەدین کراوە لە ساڵی ٢٠٠٩



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا – (٦)**
- **کوردستان لە کتێبی تەقویم ئەلبولدانی ئەبولفیدای ئەیوبی**
- موحسین مامل محەمەد
- سەرپەرشتیاری پرۆژە: رابیعە فەتاح شێخ محەمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر
- بەرگ: هۆگر سدیق
- نرخ: (٤٠٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٤
- تیراژ: (٧٥٠) دانە
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(١٧١) ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە**

زنجیرەی کتێب (٨٦٩)

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## ناوەڕۆك

**پێشەکی و چوار چێوەی لێکۆڵینەوەکە** ........................................ ٧
شیکردنەوەی سەرچاوەکان ........................................ ١٣
بەشی یەکەم/ ژیاننامەی ئەبولفیدای ئەیوبی........................................ ١٩
تەوەری یەکەم: ژیانی ........................................ ٢١
تەوەرەی دووەم: ژیاننامەی زانستی ئەبولفیدا........................................ ٤١
تەوەری سێیەم: ڕۆلی ئەبولفیدا لە ژیانی ڕامیاری ........................................ ٥٥
**بەشی دووەم/ ڕێبازی ئەبولفیدا لە نووسینی کتێبی (تقويم البلدان)** ........................................ ٦٩
تەوەری یەکەم: کتێبی (تقويم البلدان) ........................................ ٧١
تەوەرەی دووەم: سەرچاوەکانی ئەبولفیدا لە نووسینی کتێبی (تقويم البدان) ........................................ ٨٣
تەوەرەی سێیەم: ڕێبازی پەیڕەوکراو لە نووسینی کتێبی (تقويم البدان) ........................................ ١٠١
**بەشی سێیەم / هەرێمە کوردنشینەکان لە کتێبی (تقويم البدان)**........................................ ١١١
تەوەرەی یەکەم: سروشتی جوگرافیایی کوردستان ........................................ ١١٣
تەوەرەی دووەم: هەرێمی چیاکان ........................................ ١٢٥
تەوەرەی سێیەم : هەرێمی جەزیرە ........................................ ١٣٩
تەوەرەی چوارەم: هەرێمەکانی ئەرمینیا و ئاران و ئازەربیجان ........................................ ١٥١
تەوەرەی پێنجەم: هەرێمەکانی دیکە ........................................ ١٦٣
**بەشی چوارەم/ ڕەهەندە شارستانیەکانی کوردستان لە کتێبی (تقويم البلدان)** ........................................ ١٦٧
تەوەرەی یەکەم/ لایەنی ئابوری ........................................ ١٦٩
تەوەرەی دووەم: لایەنی بیناسازی و ئاوەدانکاری ........................................ ١٨٧
تەوەرەی سێیەم: لایەنەکانی دیکە ........................................ ٢٠١
**دەرئەنجام** ........................................ ٢١٢
لیستی سەرچاوەکان........................................ ٢١٥
لیستی پاشکۆکان ........................................ ٢٣٩

# هێما کورتکراوەکان

ت: توفی

ص: الصفحه

ص ص : الصفحات

مج: المجلد

ق: القسم

ط: الطبعة

هـ: التاريخ الهجري

م: التاريخ الميلادي

د. م: دون مكان الطبع

د.ت: دون تاريخ الطبع

د.م.ت: دون مكان و تاريخ الطبع

ز: زایینی

ك: کۆچی

ل: لاپەره

ل ل : لاپەڕەکان

چ: چاپ

پ.ز: پێش زایین

p:page (لاپەڕە)

سەرنج/ لەبەر هەندێ هۆکاری هونەری دەستکاریی رێنووسی ئەم کتێبەمان نەکرد.

خانەی موکریانی

# پێشەکی

## پێشەکی و چوار چێوەی لێکۆڵینەوەکە

کورد وەکو زۆرێك لـە نەتـەوەکانی دیکـەی ناوچـەکە لـە قۆناغـە جیاوازەکـانی مێـژووی ئیسلامدا خزمەتێکی زۆری لە بوارە جۆراو جۆرەکاندا بە شارستانیەتی ئیسلامی کردووە.

یەکێك لەو بنەماڵە کوردییە دیارو بەرچاوانەش ئەیوبیەکانن، کە ڕۆڵێکی کارایان گێراوە لە ڕووبەڕووبوونەوەی خاچ دروشمەکان بە درێژایی نزیکەی هەشتا ساڵ لە تەمەنی دەوڵەتەکەیان کە سنورێکی بەرفراوانی لە وڵاتی میسرو شام و حیجازو یەمەن و بەرقـە لـە لیبیـاو بەشـێك لـە کوردستانی لە خۆگرتبوو.

وێڕای خەریك بوونیان بە کاری ڕامیاری و سەربازی، لە هەمان کاتدا لایـەنی زانستیشـیان پشتگوێ نەخستووەو گرنگی زۆریان داوە بە زانایان و ڕۆشنبیران و بگرە لەوەش زیاتر زۆرێك لە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە خۆیان کەسانی زاناو ئەدیب و هۆنراوەبێژ بوونە.

ئەو کتێبەی توێژینەوەی لە بارەیەوە دەکرێت، بەرهەمی یەکێك لە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیـە کە ئـەویش ئەبولفیـدایی ئەیوبییـە (م٧٣٢ك/١٣٣١ز) کاتێـك توانیویـەتی بەهـەوڵ و کۆششـە سەربازی و ڕامیاری و دبلۆماسیەکانی پارێزگاری لە مانەوەی دەسەڵاتیان بکات لە شـاری حـەما لەسەردەمی مەمالیکەکان و تەنانەت لەسەردەمی ئەودا ئەو شارە گەشـانەوەیەکی بەرچـاوی بـە خۆیەوە بینی بوو لە هەموو بوارێکدا، بەتایبەتی لە لایەنی زانستی و ڕۆشـنبیری، ئـەوەش زیـاتر لەبەر ئەوە بوو کە ناوبراو خۆی کەسێکی ڕۆشنبیر بوو وە شارەزایی هەبوو لە زۆر بواردا.

کتێبی (تقویم البلدان) یەکێکە لە بەرهەمە دیارەکـانی لـە بـواری جوگرافیـاو تاڕادەیـەك کورتکراوەی سەرچاوەکانی پێش خۆی بووەو لە ڕووی ڕێبازی نووسین و چـۆنیەتی دابەشـکردنی تایبەتمەندی تایبەتی بە خۆی هەبووە کاتێك سیستەمێکی نوێ ی تێدا بەکارهاتووە کە ئەویش

بەکارهێنانی خشتەیە لە خستنەڕووی زانیاریەکان، هەر بۆیە گرنگی و بایەخی زۆری پێدراوەو شوێنی زۆرێك لە سەرچاوەکانی گرتۆتەوە لەو بوارەدا.

ئەگەرچی وڵاتی کورد (کوردستان) یاخود هەرێمە کوردنشینەکان لێکۆڵینەوەی زۆری لە بارەیەوە کراوەو تەنانەت هەر هەرێمێك بەجیا توێژینەوەی لەسەر کراوە، بەڵام لێکۆڵینەوەی لە بارەی وڵاتی کورد لە یەکێك لە کتێبە جوگرافییەکان گرنگی و بایەخی زیاتری هەیە وەك لەوەی لە کتێبە مێژووییەکان بەدواداچوونی بۆ بکرێت، لەبەرئەوەی ئەو جۆرە کتێبانە زیاتر گرنگیان داوە بە ڕووداوە ڕامیاریەکان و کەمتر بڕژاونەتە سەرلایەنەکانی دیکە وەکو ئابوری وکۆمەڵایەتی و بیناسازی، وە بۆ گەڕان بە دوای ئەو زانیارانە وا پێویست دەکات بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی گەڕیدەو وڵاتناسان، ئەوانەی خۆیان سەردانی ناوچەکانیان کردووەو زانیاری وردوو دەگمەنیان بۆمارکردووەو خستوویانەتەڕوو، هەر بۆیە لێرەدا توێژەر دەیەوێت پێگەی کوردو هەرێمە کوردنشینەکان لە یەکێك لە کتێبە وڵاتناسیەکان بخاتەڕوو.

لە بارەی هەڵبژاردنی بابەتەکەش دەکرێت باس لە چەند هۆکارێك بکرێت، لە پێشەوەی هەمووشیان حەزو ئارەزووی توێژەر بوون بۆ ئەوەی بابەتێکی ئاوا دەستنیشان بکرێت پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە کوردەوە هەبێ لە مێژووی ئیسلامدا، هەروەها بەدیارخستن و زیندووکردنەوەی ژیاننامەی یەکێك لەو کەسایەتیە کوردیەکان کە لە ڕێگای کردارو چالاکیە سەربازیەکان و بەرهەمە جۆراو جۆرە زانستیەکانی خزمەتێکی زۆری بە ژیاری ئیسلامی کردووە، ئەوە سەرەڕای ئەوەی لێرەو لەوێ لێکۆڵینەوەو وتار لە بارەیەوە هەبووەو تەنانەت لە سوریاش ساڵانە چەندین کەرنەڤاڵ و ڤیستیڤاڵ بۆ یادکردنەوەی ئەو کەسایەتیە بلیمەتە سازکراوە. هەر بۆیە لێرەشدا بە پێویست و شایستەی ئەوە زانراوە کە لە دوو تۆی نامەیکدا توێژینەوەکەمان تایبەت بکەین بە (کوردستان لە کتێبی (تقویم البلدان) ی ئەبولفیدای ئەیوبی).

لە کاتی نووسینی ئەم توێژینەوەیە هەندێك کۆسپ و تەگەرە هاتۆتە ڕێگامان، لەوانە نەبوونی سنورێکی دیاریکراو بۆ کوردستان، هەروەکو دیارە شارە کوردنشینەکان دابەشکرابوو بەسەر چەند هەرێمێکداو لە پاڵ ئەوانیشدا نەتەوەی دیکەش ژیاون، ئیتر ئاستەم بووە بتوانرێت لە ڕووی نەتەوایەتی سنوور دیاری بکرێت، بۆیە ناچار بووین لە ڕووی جوگرافی دیاری بکەین، سەرەڕای ئەوەش تێبینی ئەوە دەکرێت کە ئەبولفیدا لە کتێبی (تقویم البلدان) زۆر نەپرژاوەتە سەر ڕەهەندە شارستانیەکانی کوردستان، هەر بۆیە ناچاربووین پشت ببەستین بە بیروڕای وڵاتناسانی دیکەوە بۆ خستنەڕووی زۆرترین زانیاری لەم ڕووەوە، هەروەها وەرگێڕانی هەندێك دەقی کۆنی وڵاتناسان و

مێژوونووسان بۆ زمانی کوردی یەکێکی دیکە بووە لەو گرفتانەو سەرەڕای ئەوەش بۆمان نەڕەخسا سەردانی شاری حەما بکەین و زانیاری زیاتر لە بارەیەوە کۆبکرێتەوە، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر سەرداری ئەو شارە بووەو زۆر شت لە بارەیەوە لەوێدا بە جێماوە.

ئەم لێکۆڵینەوە پێکهاتووە لە پێشەکیەك و چوار بەش لەگەڵ دەرئەنجام و چەند پاشکۆیەك.

لەبەشی یەکەمدا چەند تەوەرەیەك تەرخانکراوە بۆ خستنەڕووی زانیاری لە بارەی ژیاننامەی ئەبولفیدا، بە جۆرێك لە تەوەری یەکەمدا تیشك خراوەتە سەر خودی ژیانی لە ڕووی ناو و نازناوی و ڕەچەڵەکی لە دایك بوون و پێگەیشتنی و مردنی و هەروەها باس لە ئەندامانی خانەوادەکەشی کراوە، ئەوانەی لەسەر شانۆی ڕامیاری شاری حەماو گرنگترین ئەو ڕووداوانەی لە ناوچەکەدا ڕوویانداوە ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبووە.

هەر لەو بەشەدا باس لە پێگەیشتنی زانستی و دیارترین مامۆستایەکانی کراوە، ئەوانەی لەسەر دەستیان فێری زانستەکانی سەردەم بووە.

هەروەها لەبەرئەو پێگەو ڕۆڵە زانستیەی کە هەیبووە، باس لە بیروڕای مێژوونووسان کراوە لە بارەیەوەو سەرەڕای ئەوەش باس لە دیاترین بەرهەمە جۆراو جۆرەکانی کراوە.

لەدوا تەوەرەی ئەو بەشە باس لە رۆڵی ئەبولفیدا کراوە لە ژیانی ڕامیاری و تێدا تیشك خراوەتە سەر کردارو چالاکیە سەربازیەکانی دژ بە خاچ دروشمەکان و مەغۆلەکان، هەروەها باس لەو ماوەیە کراوە کە خۆی بۆتە سەرداری شاری حەماو تێدا باس لە پەیوەندیەکانی کراوە بە سوڵتانەکانی میسر، بە جۆرێك بۆمانەوەی دەسەلاتی لەو شارەدا هەولێداوە پەیوەندیەکی تووندو تۆڵی لەگەڵیاندا هەبێ و بەردەوام گوێڕایەڵی داواکاریەکانیان بووە.

هەرچی بەشی دووەمە، ئەوا چەند تەوەرەیەك لە خۆ دەگرێت و باس لە ڕێبازی ئەبولفیدا کراوە لە نووسینی کتێبەکەیدا و تێدا تیشك خراوەتە سەر پێناسەو ناساندنی کتێبەکە لە ڕووی ناونیشان و هۆکارو پاڵنەرەکانی نووسینی و هەروەها کات و شوێن و تەوەرە سەرەکیەکانی و چۆنیەتی دابەشکردنی و گرنگی کتێبەکە لە بواری جوگرافیادا.

هەر لەو بەشەدا باس لە دیارترین سەرچاوەکانی کراوە، ئەوانەی بۆ نووسینی کتێبەکە سوودیان لێوەرگیراوە. وەکو سەرچاوەکانی پێش خۆی و ئەو شوێنانەی کە لە ئەنجامی کردارو چالاکیە سەربازیەکانی و سەردانە فەرمیەکانی بۆی ڕەخساوە کە بیانبینی و هەروەها ئەو زانیاریانەی کە لە گەشتیارو ڕێبوارو بازرگانەکان وەریگرتووە.

بەهەمان شێوە باس لە ڕێبازی پەیڕەوکراو کراوە لە نووسینی کتێبەکەی و جەخت لەسەر ئەو تایبەتمەندیانە کراوەتەوە کە جیای کردۆتەوە لەسەرچاوەکانی دیکەی ئەو بوارە.

هەروەها لەبەشی سێیەمدا باس لە هەرێمە کوردنشینەکان کراوە لە کتێبی (تقویم البلدان)، بە پشت بەستن بەو دەقانەی ناوبراو لەم ڕووەوە خستوونیتەڕوو، بەشێوەیەك هەر هەرێمێك بە جیا باس لە دیاریکردنی سنوری و بنەچەو ڕیشەی ناوەکەی و سروشتی جوگرافیای ناوچەکانی کراوەو تێدا تیشك خراوەتە سەر سیماو ڕواڵەتە دیارەکانی لە چیاکان ڕووبارەکان و ئاووهەوای و هەروەها دیارترین شارە کوردنشینەکانیش باسیان لێوەکراوە.

لەبەشی چوارەم و کۆتاییدا جەخت کراوەتە لەسەر ڕەهەندە شارستانیەکانی کوردستان لەو کتێبەدا، بەتایبەتی ئەو لایەنانەی ئەبولفیدا زۆرترین زانیاری لە بارەیانەوە خستۆتەڕوو، بەشێوەیەك لایەنی ئابوری لە پێشەوەی لایەنەکانی دیکە دێت کە زانیاری زۆری لە بارەیەوە ئاماژەپێکراوە و تێدا باس لە کشتوکاڵ و دیارترین بەرهەمە کشتوکاڵیەکان کراوە، هەروەها تیشك خراوەتە سەر سامانەکانی دیکەی ئەو هەرێمانە وەکو سامانی ئاژەڵی و کانزایی و جگە لەوانەش باس لە پیشەی دەست و کرداری بازرگانی و بازاڕی شارە کوردنشینەکان کراوە.

هەر لەو بەشەدا باس لە لایەنی بیناسازی و ئاوەدانکاری کراوە و زیاتر ئاماژەی بە ئامرازەکانی پتەوکردن و قایمکاری شارەکان کردووە کە زیاتر خۆیان دەبینیەوە لە قەلاَ و شوڕە و قایمکاری.

بەهەمان شێوە لایەنی کۆمەلاَیەتیش پشکێکی لە زانیاریەکان بەرکەوتووەو تێدا باس لە پێکهاتەی مرۆیی هەرێمەکان کراوەو کورد زۆرینەی پێکهاتەی دانیشتوانی پێك دەهێنا، بەتایبەتی لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاو بەشی باکورو باکوری ڕۆژهەلاَتی هەرێمی جەزیرەو لە هەمان کاتدا لە پاڵ کورد نەتەوەی دیکەش ژیاون وەکو فارس و عەرەب و تورك و ئەرمەن و سریان، ئەوانەش هەندێکیان دانیشتوانی بنەڕەتی هەرێمەکان بوون و هەندێکیان لە دوای فتوحاتی ئیسلامی تیایاندا نیشتەجێ بوونە وەکو عەرەب دواتریش تورك، هەرچی پێکهاتەکانی دیکەیە ئەوا بە پێی پەرەسەندن و گۆڕانکاریەکانی سەردەم لەم هەرێمانەدا ژمارەیان زیادیکردووە نیشتەجێ بوونە، هەروەها باس لە پێکهاتەی ئایینی ئەو هەرێمانەش کراوە کە لە پاڵ ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایین و ئایننزایی دیکەش بوونیان هەبووە وەکو ئایینی یەهودی و مەسیحی و زەردەشتی و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ پێش بلاَوبوونەوەی ئیسلامیش لەو هەرێمانەدا و سەرەڕای ئەوەش تیشك خراوەتە سەر هەندێك تایبەتمەندی دیکەی کۆمەلاَیەتی خەڵکەکە، بەتایبەتی سیفات و خوڕەوشت و مۆرکە گشتیەکان، لەدوا بابەتی ئەو

بەشە باس لە لایەنی زانستی و ڕۆشنبیری هەندێك لە شارە کوردنشینەکان کراوە، بەتایبەتی ئەوانەی چەند زاناو بیرمەندێك تیایاندا بەدیارکەوتوون و لە بوارە جۆراو جۆرەکاندا خزمەتێکی زۆریان بە ژیاری ئیسلامی کردووە، لەدوای ئەوەش ئاماژە بە چەند دەرئەنجامێك کراوە کە لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیە پێیگەیشتووین.

لە کۆتاییدا توێژە بە هیوایە توانیبیەتی پێگەی کورد و هەرێمە کوردنشینەکان لە یەکێك لە کتێبەکانی وڵاتناسان بخاتەڕوو، هەروەکو دیارە هیچ لێکۆڵینەوەو بابەتێکی ئەکادیمی بەدەر نییە لە کەم و کوڕی و تەواوی تەنها بۆ خودای گەورەیە.

## شیكردنەوەی سەرچاوەكان

بۆ نووسین و ئامادەكردنی ئەم توێژینەوە، پشت بەستراوە بە كۆمەڵێك سەرچاوەی كۆن و نوێ (المصادر والمراجع) هەریەكەیان بەڕێژەو ئاستی جیاجیا بە پێی زانیاریەكانیان سوودیان لێ وەرگیراوە، لێرەدا لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆرە تەنها بە خستنەڕوو و شیكردنەوەی هەندێكیان واز دەهێنین. بەتایبەتی ئەوانەی بە پلەی یەكەم سوودیان گەیاندووە بە لێكۆڵینەوەكە و ئەوانی دیكەش لە لیستی سەرچاوەكان ئاماژەی پێكراوە.

١- كتێبی گەڕیدەو وڵاتناسان (كتێب الرحاله والبلدانیین) :

لە پێشەوەی ئەو سەرچاوانە دێن كە بە پلەی یەكەم سوودیان لێ وەرگیراوە، لەبەرئەوەی زانیاری گرنگ و بەنرخ تیایاندا بەدیدەكرێت لە لایەنەكانی ئابوری و كۆمەڵایەتی و بیناسازی و تەنانەت زانیاریەكانیشیان تاڕادەیەك وردو دەگمەنن بە بەراورد لەگەڵ سەرچاوەكانی دیكە، هەر بۆیە هیچ توێژەرێك ناتوانێت دەستبەرداری ئەو جۆرە سەرچاوانە بێت، بەتایبەتی ئەگەر لێكۆڵینەوە لە بارەی ناوچەیەكی دیاریكراو ئەنجام بدات.

لەدیارترین ئەو سەرچاوانەش، كتێبی (معجم البلدان) ی یاقوتی حەمەوییە (م ٦٢٦ك/ ١٢٢٨م) كە وەكو ئینسكلۆپیدیایەكی جوگرافی و مێژووییەو زانیاری فراوانی تێدایە دەربارەی هەڵكەوتەی جوگرافی شارو شارۆچكەكان و هەروەها زانیاری لە بارەی لایەنەكانی دیكەش وەكو ئابوری و كۆمەڵایەتی و بیناسازی و زانستی تێدا بەدیدەكرێت، هەر لەبەر ئەوە هیچ توێژەرێك ناتوانێت فەرامۆشی زانیاریەكانی بكات و لە تەواوی لێكۆڵینەوەكە سوودی لێ وەرگیراوە.

هەروەها سەرچاوەكانی وڵاتناسی سەدەی چوارەمی كۆچی / دەیەمی زایینی سوودی زۆریان بە توێژینەوەكە گەیاندووە بەتایبەتی كتێبی (صورە الارض) ی ئیبن حەوقەل (م دوایی ٣٧٧ك/ ٩٨٧ز)، كاتێك زانیاری زۆری تێدا بەدیدەكرێت لە بارەی پێگەی جوگرافی شارەكان و هەروەها سروشتی جوگرافی هەرێمەكانیش لە ڕووی دیارترین سیماو ڕواڵەتەكانیان لە چیاو ڕووبارو ئاوهەوایان، جگە لەوەش زانیاری زۆری تێدایە لە بارەی كشتوكاڵ و دیارترین بەرهەمە كشتوكاڵیەكانیان و سامانەكانی دیكەش، سەرەڕای ئەوەش باسی لە ژمارەیەك هۆزی كوردی و شوێنی نیشتەجێبوونیانی كردووە.

کتێبی (احسن التقاسيم فی معرفه الاقاليم) ی ئەلمەقدسی (م٣٧٨ك/ ٩٩٧ز) بەیەکێك لە سەرچاوە هەرە گرنگەکانی ئەم توێژینەوە دادەنرێت، لەبەرئەوەی بەتێرو تەسەلی باسی لە جیهانی ئیسلامی و لە نێویشیاندا هەرێمە کوردنشینەکانی کردووە، بەتایبەتی لە کۆتایی باسکردنی هەر هەرێمێکدا بەشێکی تایبەت کردووە بە بارودۆخی گشتی و تێدا زانیاری فراوانی لە بارەی لایەنە ئابوری بە هەموو بەشەکانی خستۆتەڕوو، تەنانەت دەکرێت باس لەوە بکرێت کە تاکە سەرچاوەیە زۆرترین زانیاری لە بارەی لایەنی کۆمەڵایەتی خستۆتەڕوو، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە پێکهاتەی دانیشتوان وئایین و ئاینزاکانیان و ویڕای ئەوەش هەندێك تایبەتمەندی دیکەی باسکردووە کە پەیوەندی هەبووە بە خەڵکەوە لە سیفات و خوڕەوشت و مۆرکە گشنیەکان.

بەهەمان شێوە کتێبی (المسالك والممالك) ی ئەستەخری (م دوایی ٣٤٠ ك/ ٩٥١م) زانیاری زۆری تێدا بەدیدەکرێت لە بارەی هەرێمە کوردنشینەکان، بەتایبەتی لە بارەی شوێنگەی جوگرافی شارو شارۆچکەکان و سیماو ڕواڵەتە سروشتیەکانی لە چیاو رووبارو هەروەها دیارترین بەرهەمەکانی لە ڕووی کشتوکاڵ و سامانە کانزایەکان و پیشەی دەست و کرداری بازرگانی بازاڕی شارەکانی باسیان لێوەرکراوە.

هەرچی سەرچاوەی گەریدەکانە، ئەوا سوودی زۆر وەرگیراوە لە کتێبی (رحلە بنیامین) ی گەڕیدەی جولەکە بنیامین توتەیلی (م ٥٦٩ك/ ١١٧٣ز)، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە بارودۆخ و گوزەران و ژمارەی جولەکەکان لە شارە کوردنشینەکان، لەگەڵ ئەوەی زێدەڕۆیی زۆری کردووە لە بارەی ژمارەیان لە شارەکان، بەڵام لەم بوارەدا کەڵکی زۆری لێوەرگیراوە.

گرنگی کتێبی (رحلة ابن بطوطة)ی گەڕیدەی مەغریبی ئیبن بەتووتە (م٧٧٩ك/ ١٣٧٧ز) لەوەدایە کە زانیاری باشی لە بارەی هەندێك لە شارەکانی هەرێمی جەزیرە خستۆتەڕوو، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە وەسفکردنی شارەکان لە ڕووی گەورەو بچووکی و نەشونماکردنیان و هەروەها لەگەڵ هەندێك تایبەتمەندی گشتی دانیشتووانی ناوچەکەش.

جگە لەو سەرچاوانەی ئاماژەیان پێکرا، کەڵك وەرگیراوە لە ژمارەیەك سەرچاوەی دیکەش وەکو کتێبی (اثار البلاد واخبار العباد) ی قەزوینی (م٦٨٢ك/١٢٨٣ز) کتێبی (البلدان) ی یەعقوبی (م ٢٩٢/٩٠٥ز) کتێبی (نزهه القلوب) ی حەمەدوڵڵا مستەوفی قەزوینی (م٧٥٠ك/ ١٣٤٩ز)، کتێبی (سفرنامە) ی ناسر خەسرو (م٤٨١ك / ١٠٨٨ز)، هەروەها گەشتەنامەکەی ئیبن جوبەیر (م ٦١٤ك/ ١٢١٧ز).

٢- سەرچاوەکانی مێژووی گشتی (كتيب التواريخ العامه):

ئەو جۆرە سەرچاوانە لە ناوەکەیانەوە دیارە کە لە ڕووداوەکانی تەواوی جیهان بە شێوەیەکی پوخت دواون و زۆرجار جەختیان لەسەر لێکۆڵینەوەی مێژووی ئیسلامی یان هەندێك لایەنی کردۆتەوە، دیارە ئەو کتێبانەش لە ڕووی شێوازی خستنەڕووی زانیاریەکان دەکرێت پۆلێن بکرێت بۆ چەند بەشێکەوە، ئەوەتا هەندێك شێوازی پیشاندانی ساڵانەی ڕووداوەکانیان پەیڕەوکردووە، واتە بە شێوەی ساڵنامە (الحوليات) وەکو ئەبولفیدا (م٧٣٢ك/ ١٣٣١ز) لە کتێبەکەی (المختصر فى اخبار البشر)، هەندێکیان شێوازی پیشاندانی بابەتیان پەیڕەوکردووە، واتە دابەشکردنی مێژووی ئیسلامی بۆ ژمارەیەك لە دەوڵەت و میرنشینی دیاریکراودا، هەروەکو ئیبن خەلدون (م٨٠٨ك/ ١٤٠٦ز) لە مێژووەکەی (العبر)، هەشە شێوازێکی دیکەی گرتۆتەبەر تیایدا لە نێوان پیشاندانی ڕووداوەکانی بە پێی ساڵەکان و ژیاننامەی مردووەکانی هەر ساڵێکی کۆکردۆتەوە، وەك ئەوەی بەدرەددین ئەلعینی (م٨٥٥ك/ ١٤٥١ز) لە کتێبی (عقد الجمان فى تاريخ اهل الزمان).

کتێبی (المختصر فى اخبار البشر) گرنگیەکی تایبەتی هەبووە بۆ توێژینەوەکە، هەرچەندە تەواوکەرو پوختکراوی سەرچاوەکانی پێش خۆی بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەشەی تایبەتە بە ماوەی ژیانی خۆی سوودی زۆری لێوەرگیراوە، لەبەرئەوەی خۆی وەکو گەواهیدەرێك بەشداربووە لە ڕووداوەکان و تۆماریکردوون، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندی هەبووە بە کارو چالاکیە سەربازیەکانی خۆی دژ بە خاچ دروشمەکان و مەغۆڵەکان.

گرنگی کتێبی (السلوك لمعرفه دون الملوك) ی ئەلمقریزی (م٨٤٥ك/ ١٤٤٣ز) لەوەدایە کە سەرچاوەیەکی گرنگی بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە بووە، هەرچەندە هاوسەردەمی ڕووداوەکان نەبووە، بەڵام لە ئەنجامی گەڕان و بەدواداچوونی بۆ سەرچاوەکانی پێش خۆی زانیاری زۆری خستۆتەڕوو لە بارەی مەمالیکەکانی میسرو شام، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە شەڕو شۆڕەکانیان لەگەڵ خاچ دروشمەکان و مەغۆڵەکان و بەشداریکردنی سوپای شاری حەما تیایاندا.

ئیبن خەلدونیش لە مێژووەکەی (العبر) زانیاری زۆری خستۆتەڕوو لە بارەی شەڕەکانی مەمالیك لەگەڵ خاچ دروشمەکان و مەغۆلەکان، هەروەها چۆنیەتی بەشداریکردنی هێزەکانی شام لەم شەڕانەدا، ئەوەی شیاوی باسکردن بێت زانیارێکی نوێ باسی نەکردووە، بەڵکو زیاتر قسەکانی سەرچاوەکانی پێش خۆی دووبارە کردۆتەوە.

سەرەڕای ئەوانەی کە باسکران کەڵك وەرگیراوە لە سەرچاوەی دیکەش وەکو کتێبی (البدایە والنهایە) ی ئیبن ئەثیر (م٧٧٤ك/ ١٣٧٢ز)، کتێبی (تاریخ ابن الوردی) ی مێژوونووس ئیبن ئەلوەردی (م٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز)، وە کتێبەکانی (دول الاسلام والعبر فی خبر من غبر) ی زەهەبی (م ٧٤٨ك/ ١٣٤٨ز)، کتێبی (شذرات الذهب) ی ئیبنولعمیاد ئەلحەنبەلی (م١٠٨٩ك/١٦٧١ز).

٣- سەرچاوەکانی مێژووی دەوڵەت و میرنشینەکان (کتب تواریخ الدول والامارات) :

ئەو سەرچاوانەش باس لەو دەوڵەت و میرنشینانە دەکەن کە لە ماوەیەکدا لە چوارچێوەی کات و شوێنێکی دیاریکراودا سەریان هەڵداوە وەکو دەوڵەتی سەلجوقی و ئەیوبی و مەمالیك.

بەو پێیەی ئەبولفیدا خۆی ئەیوبییە و لەسەردەمی مەمالیکەکاندا ژیاوە، هەر بۆیە سوود وەرگیراوە لەو سەرچاوانەی لە بارەی ئەو دوو دەوڵەتەوە نووسراون، لەم جۆرە سەرچاوانەش، کتێبی (ذیل مفرج الکروب في اخبار بني ایوب)ی ئیبن ئەلمغیەزل (م٧٠١ك/ ١٣٠١ز) هاوسەردەمی زۆرێك لە ڕووداوەکان بووەو و وەکو گەواهیدەرێك باسی لە چۆنیەتی بەشداریکردنی هێزەکانی حەما کردووە لە شەڕەکاندا و هەروەها هەواڵی سەرکەوتنی زۆرێك لە شەڕەکانی تۆمارکردووە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە فەتح کردنی سەرکەوتنی زۆرێك لە شەرەکانی تۆمارکردووە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە فەتح کردنی قەڵای مەرقب لە ساڵی (٦٨٤ك/ ١٢٨٥ز) و تەواوی ئەو سەرکەوتنانەی لەو ماوەیەدا هاتوونەتەدی تاوەکو ساڵی (٦٩٠ك/ ١٢٩١ز).

کتێبی (نزهە الممالك والملوك) ی سەفەدی (م دوایی ٦٩٠ك/ ١٣١٧ز) وێڕای ئەوەی زانیاریەکانی کورتن، بەڵام کەڵکی زۆری لێوەرگیراوە لەبەشی یەکەمی توێژینەوەکە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە شەڕەکانی مەمالیك لەگەڵ خاچ دروشمەکان و مەغۆلەکان و چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەیان.

گرنگی کتێبی (شفاء القلوب فی مناقب بنی ایوب) ی حەنبەلی(م٨٧٦ك/ ١٤٧٢ز) لەوەدایە کە وەکو مێژووی ژیاننامەیماڵباتی ئەیوبیەکان وایە، کاتێك لە دروستبوونیان تاوەکو کۆتاییان بەپێی قۆناغەکان دابەشیکردوون بەسەر دەچین و ئەندامانی هەر چینێکی بەپێی پلەو پایەی خۆی باسکردووە بەشێوەیەکی کورت و نەپڕژاوەتە سەر زۆر بابەتەوە، وە ئەوەی پەیوەندی هەیە بە ئەبولفیداو شاری حەما کەڵکی زۆری لێوەرگیراوە.

هەرچی کتێبی (الاعلاق الخطیرة في ذکر امراء الشام والجزیرة) ی ئیبن شەدادە (م٦٨٤ك/ ١٢٨٥ز) ئەوا زانیاری زۆری تێدایە لە بارەی ناوچەکانی شام و جەزیرە، لێرە زیاتر سوود وەرگیراوە لە بەشی سێیەمی بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە هەرێمی جەزیرەوە، کاتێك

باسی زۆرێك لە قەڵا و قایمکاری ئەو هەرێمە کردووەو تەنانەت ناوی هەندێك قەڵای هێناوە کە لەسەرچاوەکانی دیکەدا باسی لێوەنەکراوە.

جگە لەوانەش سوود وەرگیراوە لە کتێبی (النفعه المسکیه فی الدوله الترکیه) ی ئیبن دقماق (م ٨٠٩ك/ ١٤٠٦ز)، کتێبی (مفرج الکروب فی اخبار بنی ایوب) ی ئیبن واصل (م٦٩٧ك/ ١٢٩٧ز).

٤- کتێبەکانی ژیاننامەو چینەکان (کتب التراجم والطبقات):

ئەوانەش بەرهەمی مێژوونووسان لەبارەی ئەو کەسانەی هاوچەرخیان بوون یان بیستوویانن یاخود لە بارەیانەوە خوێندویانەتەوەو نووسیویانە، ئەو جۆرە کتێبانەش زانیاری گرنگیان تێدا بەدیدەکرێت، بەتایبەتی لە بارەی کەسایەتیە دیارو بەرچاوەکان، ئەوانەی لە بوارە جۆراو جۆرەکاندا کاریان کردووە.

لەدیارترین ئەو سەرچاوانەش، کتێبی (المنهل الصافی والمستوفی بعد الوافی) ی ئبین تغری بەردیە (م٨٧٤ك/ ١٤٦٩ز)، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەبووە بە ژیاننامەی ئەبولفیدا لە ڕووی پێگەیشتنی و دیارترین ئەو نازناوانەی لە ماوەی ژیانیدا وەریگرتووە، هەروەها تیشکی خستۆتە سەر زۆرێك لە بەرهەمەکانیشی.

هەروەها پشت بەستراوە بە کتێبیی (الوافی بالوفیات) ی سەفەدی (م٧٦٤ك/ ١٣٦٣ز)، کە تێدا باس لە ژمارەیەکی زۆری کەسایەتی بەناوبانگی ئیسلامی کراوە لە نێویشیاندا ئەبولفیدای ئەیوبی.

کتێبی (فوات الوفیات) ی کتێبی (م٧٦٤ك/١٣٦٣ز) کەڵکی زۆری لێوەرگیراوە بۆ ناساندن و پێناسەکردنی ژیانی ناوبراو و هەروەها زۆرێك لە ژیانی سەرچاوەکانی بۆ کتێبەکەی.

وێڕای ئەوانەی کە باسکران سوود وەرگیراوە لە کتێبی (الطبقات الشافعیة الکبری) ی سەبکی (م٧٧١ك/١٣٦٩ز)، کتێبی (الدرر الکامنه فی اعیان المائه الثامنة) ی ئیبن حەجەری عەسقەلانی (م٨٥٢ك/ ١٤٤٨ز)، کتێبی (البدر الطالع بمحاسن من بعد القرن التاسع) ی شەوکانی (م١٢٥٠ك/١٧٥٣ز).

٥- سەرچاوە ئینسکلۆپیدیەکان (المصادر الموسوعیه):

یەکێکی دیکەیە لەو جۆرە سەرچاوانەی سوودی بە توێژینەوەکە گەیاندووە، بەتایبەتی کتێبی (صبح الاعشی فی صناعه الانشا) ی قەلقەشەندی (م٨٢١ك/ ١٤١٨)، هەرچەندە ئینسکلۆپیدیایەکی فراوانەو زانیاری زۆری لە بارەی بوارەکانی مێژوو جوگرافیاو کارگێری و ڕامیاری لە خۆدەگرێت، بەڵام زیاتر کەڵك وەرگیراوە لە بەشی چوارەمی کتێبەکە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بە هەرێمە کوردنشینەکان و ئەو هۆزانەی تێدا نیشتەجێ بوونە، جێگای

ئاماژەپێکردنە ئەو زانیاریانەی خستۆتیەڕوو بەشێکی لە کتێبی (مسالك الابصار) ی ئیبن فەزلولڵای عومەری (م٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز) و هەروەها (تقویم البلدان) ی ئەبولفیدا (م٧٣٢ك/ ١٣٣١ز) وەرگرتووە.

٦- سەرچاوە نوێیەکان (المراجع):

ئەو جۆرە سەرچاوانەش بە زانیاریەکانیان توێژینەوەکەیان سوودمەند کردووە، هەرچەندە هەندێکیان زانیاریەکانیان دووبارەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکیان زانیاری شیکاری و دەرئەنجامی باشیان لە خۆگرتووە، لە نموونەی ئەو جۆرە کتێبانەش (تاریخ الادب الجغرافی العربی) ی کراتشکوفسکییە، کە زانیاری گرنگی لە بارەی کتێبی (تقویم البلدان) و هەروەها ڕێبازی لە نووسینیدا خستۆتەڕوو، هەر بۆیە لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە کەڵکی زۆری لێوەرگیراوە.

هەروەها کتێبی (التراث الجغرافی العربی) ی محەمەد محەمەدیین، سوودی زۆری لێوەرگیراوە، بەتایبەتی بۆ ناساندنی کتێبی (تقویم البلدان) و چۆنیەتی دابەشکردنی و ڕێبازی لە نووسینیدا.

بەهەمان شێوە کەڵکی زۆر وەرگیراوە لە کتێبی (المؤرخ الجغرافي ابو الفداء صاحب حماة)، کە تێدا پێنج توێژینەوە لە شێوەی وتار بڵاوکراوەتەوە کاتێك باسیان لە ژیاننامەی ئەبولفیداو زۆرێك لە بەرهەمەکانی کردووە.

هەرچی کتێبی (بلدان الخلافە الشرقیە) لسترنجە، ئەوا زانیاری چاکی تێدا بەدیدەکرێت لە بارەی هەرێمە کوردنشینەکان و تەنانەت کەڵکی زۆر وەرگیراوە لەو نەخشانەی کە بۆ ڕوونکردنەوە بەکاریهێناون.

سەرەڕای ئەوانەش ئەم توێژینەوەیە سوودمەند بووە بە زانیاریەکانی کتێبی حەکیم ئەحمەد مام بەکر لە ژێر ناوی (الکرد وبلادهم عند البلدانیین والرحالە المسلمین) و هەروەها نامەی ماستەری فائزە محەمەد عزەت کە ئەویش لە بارەی کوردە لە هەرێمی جەزیرەو شارەزوور بەناوی (الکرد فی اقلیم الجزیرە و شهرزور فی صدر الاسلام)

لە کۆتاییدا جگە لەو سەرچاوانەی کەوا باسکرا سوود وەرگیراوە لە ژمارەیەك بابەتی مێژووی زانستی، ئەوانەی وەکو وتارو لێکۆڵینەوە لە گۆڤارە ئەکادیمیەکان بڵاوکراونەتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندی هەبووە بە لێکۆڵینەوەکە، وەکو توێژینەوەکەی پ.ی.د. موسی مستەفا الهسنیانی کە تایبەتە بە هەڵسەنگاندنی کتێبی تقویم البلدان لە ژێر ناوی (تقیین تقویم البلدان).

# تەوەرەی یەکەم

## ژیانی

### یەکەم / ناو و نازناوی و ڕەچەڵەکی:

سەرچاوەکان زۆربەیان کۆکن لەسەر ئەوەی کەوا ناوی ئیسماعیل کوڕی عەلی کوڕی مەحمودی کوڕی محەمەدی کوڕی تەقییەددین عومەری کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەیوبی کوڕی شادیە [1]، و ناسراوە بە ئەبولفیدا [2]، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کەوا ئەو کەسانەی هەڵگری ناوی عیمادەددین ئیسماعیلن ناسراون بە ئەبولفیدا [3].

ناوبراو لە ماوەی ژیانیدا کۆمەڵێك نازناوی هەبووە، وەکو (مەلیك صالح) [4] لە ساڵی (٧١٠ك/ ١٣١٠ز) پێی بەخشراوە [5]، هەروەها نازناوی (مەلیك ئەلمؤەید)[1]یشی هەبووە، دیارە

---

١ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، تحقيق: مصطفى عبدالقادر احمد عطا، (بيروت :١٩٩٩)، ٥/ ٢٢٢، العسقلاني: الدرر الكامنة في اعيان المائة الثامنة، تحقيق: عبدالوارث محمد علي، (بيروت :١٩٩٧)، ٢١٦/١، الشوكاني: البدر الطالع بمحاسن من بعد القرن السابع، وضع حواشية، خليل المنصور، (بيروت :١٩٩٨) ١/ ١٠١.

٢عباس القمي: الكني والالقاب، (النجف :١٩٥٦)، بسام عبدالوهاب الجالي: معجم الاعلام معجم تراجم لاشهر الرجال والنساء من العرب والمستربين والمستشرقين، (دمشق :١٩٨٧)، ص١٠٤، محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، (الرياض:١٩٩٩)، ص١٨٧.

٣ قتيبة الشهابي، معجم القاب ارباب السلطان في الدولة الاسلامية من العصر الراشدي حتى بدايات القرن العشرين، (دمشق :١٩٩٥)، ص٢٩٤.

٤ الصفدي: الوافي بالوفيات، تحقيق: احمد الارناووط وتركي مصطفى (بيروت:٢٠٠٠)، ٧/ ١٠٤، الكتبي : فوات الوفيات والذيل عليها، تحقيق احسان عباس، (بيروت :د.ت)، مج ١، ١٨٤.

٥ابن تغري بردي: المنهل الصافي والمستوفي بعد الوافي، منشور على الموقع الالكتروني www.al-mostafa.com، ٢٦١/١.

پێدانی ئەو نازناوەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٧٢٠ک/ ١٣٢٠ز) کاتێك لە لایەن محەمەدی کوڕی قلاون[٢]ی سوڵتانی مەمالیکی [٣] میسرو شام پێی بەخشراوە[٤].

هەروەها نازناوی (صاحب حماه)[٥] شی هەبووە وەکو ئەندامانی تری بنەماڵەکەی ئەوانەی فەرمانڕەوایەتی شاری حەمایان کردووە ئەو نازناوەیان هەبووە[٦].

سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ئەبولفیدا دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی ئەیوبی کوردی و بنەچەی ئەو ناوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەجمەددین ئەیوبی کوڕی شادی[٧].

---

١ العيني: السيف المهند في سيرة الملك المؤيد، حققه: فهيم محمد شلتون، راجعة: محمد مصطفى زيادة، (القاهيرة :٢٠٠٣)، ص٩٣ ، المرتضى الزبيدي : ترويع القلوب في ذكر ملوك بني ايوب، تحقيق : صلاح الدين المنجد، (دمشق : ١٩٦٩)، ص١٣٦.

٢ محەمەدی کوردی قلاون: کوڕی عەبدوڵڵای صالحی لە ساڵی (٦٨٤ک/ ١٢٨٥ز) لە قاهیرە لە دایك بووەو لە ساڵی (٦٩٣ک/ ١٢٩٤ز) جڵەوی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست و بۆتە سوڵتانی میسرو شام بۆماوەیەك لادراوە، دواتر دووبارە لە ساڵی (٦٩٨ک/١٢٩٨ز) گەڕاوەتەوە دەسەڵات و پاش ماوەیەك دوورخراوەتەوە تا ساڵی (٧٠٩ک/ ١٣٠٩ز) دووبارە گەڕاوەتەوە دەسەڵات و بەردەوام بوو تاوەکو لە ساڵی (٧٤١١ک/ ١٣٤١ز) کۆچی دوایی کرد، الکتبی: فوات الوفيات، مج ٤/ ٣٥- ٣٦، وە بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ژیانی بڕوانە: حياه ناصر الحجى: السلگان الناصر محمد بن قلاون و نقام الوقف فى عهده، (الكويت:١٩٨٣)، ص ص ١٧- ٣٥.

٣ بۆ زیاتر زانیرای لە بارەی مەمالیکەکان و چۆنیەتی پەیدابوونیان لە جیهانی ئیسلامی بڕوانە: ابن دقماق : الجوهر الثمين في سير الملوك والسلاطين، تحقيق : محمد كمال الدين عزالدين علي : (بيروت :٢٠٠٧)، ص٢٨٠، علي ابراهيم حسن: تاريخ المماليك البحرية، (القاهرة : ١٩٦٧) ص ص ٢٣- ٣٥، احمد مختار العبادي: قيام دولة المماليك الاولى في مصر والشام، (بيروت : ١٩٨٦)، ص ص ١١- ١٤٣.

٤ ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، علق عليه ووضع حواشية: محمود ديوب، (بيروت :١٩٩٧)، ٢/ ٤٣٣، المقريزي: السلوك لمعرفة دول الملوك تحقيق: محمد عبدالقادر عطا (بيروت:١٩٩٧)، ٣/ ٢٤.

٥ الذهبي: ذيل تاريخ الاسلام و وفيات والمشاهير والاعلام، حوادث (٧٠١- ٧٤٦هـ) تحقيق عمر عبدالسلام تدمري، (بيروت:٢٠٠٤)، ص٢٩٣، ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، (مصر : د.ت)، ٩/ ٢٩٣.

٦ الصفدي: الوافي بالوفيات، ٤/ ٢٥٩، الكتبي: فوات الوفيات، مج ٤/ ١٢.

٧ ابو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين النورية والصلاحية، تحقيق: ابراهيم الزيبق (بيروت:١٩٩٧)، ١/ ٣- ٤، ابن خلكان : وفيات الاعيان وانباء ابناء الزمان، تحقيق: احسان عباس، (بيروت:١٩٩٧)، ٧/ ١٣٩، ابن اياس : المختار من بدائع الزهور في وقائع الدهور، (مصر:١٩٦٠)، ١/ ٥٥

به پێی بیرو بۆچوونی زۆر له سەرچاوەکان ڕەچەڵەکی ئەو بنەماڵەیە دەگەڕێتەوە بۆ تیرەی ڕاوادی[1] کە ئەوانیش لە لایەن خۆیانەوە تیرەیەکن لە هۆزی هەزبانی[2].

ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە نیشتەجێ ی شاری دوێن[3] و سەرجەم دانیشتوانی ئەو شارە لە کوردەکانی ڕەوادین[4].

ئەوەی لێرەدا شیاوی باسکردن بێت ئەم شارە شارێکی ئەوەندە دیارو بەرچاو نیەو لەهەمان کاتیشدا زۆر ناسراویش نیە، بەڵام لەبەر بوونی ماڵباتی ئەیوبیەکان لەم شارەدا وایکردووە کەوا ببێتە شارێکی گرنگ و پڕ بایەخ بە تایبەتی لە لایەن ئەو کەسانەی کەوا پەیوەستن بە بواری مێژووەوە[5].

وە لەلایەکی تر زۆر جار خەڵکی شامیش ڕەچەڵەکی کوردیان خستۆتە پاڵ ماڵباتی ئەیوبیەکان[6]، هەروەکو دیاریشە ئەو بنەماڵەیە خانەدان و دیارو بەرچاویش بوونە هەر بۆیە سەرچاوەکان بە ((بەرێزترینی خانەوادەی کوردانیان دادەنێن))[7].

---

١ ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٧/ ١٣٩ ، ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، وقف على تصحيحة : انطوان صالحاني اليسوعي، (بيروت:١٩٨٣)، ص٣٧٠، الديار بكري: تاريخ الخميس في احوال انفس النفيس (بيروت :د.ت)، ٢/ ٣٧٨.

٢ هەزبانيەكان : يەكێكە لە گەورەترين هۆزە كورديەكانى سەردەمى ئيسلامى و شوێنى نيشتەجێبوونيان زياتر ئەربل (هەولێر) و ئازربيجان و جەزيرەى قوراتى بووە، المسعودي:التنبيـة والاشراف، (بيروت : ١٩٩٣)، ص٩٤، بۆ زياتر زانيارى لە بارەى هەزبانيەكان بڕوانە: احمد عبدالعزيز محمود : الامارة الهذبانية الكردية في اذربيجان واربيل والجزيرة الفراتية من (٢٩٣- ٦٥٦هـ/ ٩٠٥- ١٢٥٨م) دراسة سياسية حضارية، (اربيل : ٢٠٠٦)، ص ص ٣٩- ٤٥.

٣ دوين : شارۆچكەيەكە دەكەوێتە دەوروبەرى ئاران لە كۆتايى سنورى ئازربيجان نزيك شارى تەفليس، ياقوت الحمودى: معجم البلدان، (بيروت: ١٩٩٥)، ٢/ ٤٩١.

٤ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ٧/ ١٣٩.

٥ محسن محمد حسين: نناشد صلاح الدين ان نحاسب انفسنا استجواب قائد بعد ثمانمائة سنة، لقاء اجراة: بدران احمد حبيب، (اربيل :٢٠٠٢)، ص٢١.

٦ نيشتمان بشير محمد: الملك ابو الفداء الايوبي (٦٧٢- ٧٣٢هـ/١٢٧٣- ١٣٣١م) دراسة تاريخية في اثارة العلمية، مجلة زانكۆ- جامعة صلاح الدين، العدد (٢٨)، (اربيل :٢٠٠٦) ص١٠٨.

٧ ابن الاثير : الكامل في التاريخ، (بيروت:٢٠٠٥)، ٣٤١/١١، وينظر ايضا كتابه: التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية (بالموصل)، تحقيق : عبدالقادر احمد طليمات، (القاهرة:١٩٦٣)، ص١١٩، ابو شامة : الروضتين في اخبار الدولتين، ١/ ٤٠٣.

لەگەڵ ئەوەی زۆربەی سەرچاوەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی بنەماڵەی ئەیوبییەکان کوردی ڕەوادین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێك سەرچاوەکاندا بیروڕای جیاواز بەدی دەکرێت سەبارەت بەو هۆزەی کەوا بنەماڵەی ئەیوبیەکان بۆی دەگەڕێنەوە، ئەوەتا هەندێك پێیان وایە کەوا بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی زرزاری [1]، وە هەندێکی تر دەیان گێرنەوە بۆ هۆزی حەمیدی[2]، وە ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت بە تەنیا ئەو سەرچاوانە باس لەوە دەکەن کەوا بنەماڵەی ئەیوبیەکان لە کوردەکانی ڕەوادی نین.

سەرەڕای ئەوەی زۆربەی مێژوونووسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەوا بنەماڵەی ئەیوبییەکان لە ڕەچەڵەکدا کوردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جار لە لایەن چەند کەسانێك هەوڵدراوە ڕەچەڵەکی خۆیان بگێڕنەوە بۆ عەرەب، دیارە زیاتر ئەو جۆرە هەوڵانەش دەگەڕێتەوە بۆ دوای دروست بوونی دەوڵەتی ئەیوبی[3] کاتێك خەڵکانێك هەبوون لە خودی بنەماڵەی ئەیوبییەکانیش بوون ڕەچەڵەکی خۆیان دەگێڕایەوە بۆ عەرەب و ئومەویەکان بۆ ئەوەی پلەو پایەی بەرز بەدەست بهێنن[4]، وە

---

١ ابن كثير : البداية والنهاية، (القاهرة:٢٠٠١)،١٢/ ٢٥٩،سەبارەت بە زرزاری: یەکێکە لەو تیرانەی سەر بە هۆزی هەزبانیەکانە و لە شاری هەولێر قەڵا بەناویانەوە بووەو هەر لە ناوچەکانی هەولێردا نزیکەی دوانزە گوندیان ئاوەنکردۆتەوە، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٣٤٠، محمد مەردۆخی: مێژووی کوردو کوردستان، وەرگێرانی : عبدالكريم محمد سعيد، (سليمانی:٢٠٠٧)، ل١٢٢

٢ القرماني: اخبار الدول واثار الاول في التاريخ، (بيروت :د.ت)، ص١٩٤، سەبارەت بە حەمیدیەکان: یەکێکە لە هۆزە کوردیە بڵاوەکانی هەرێمی جەزیرەو زیاتر ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان لە ناوچە لە موصلدا ابن حوقل : صورة الارض،(بيروت:١٩٧٩)، ص٣١٥.

٣ مەبەستمان ئەو دەوڵەتەیە سوڵتان صەلاحەددین توانی لە ماوەی ژیانیدا بە هەوڵ و کۆششە سەربازی و ڕامیاریەکانی بنیادی بنێ، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ابن شدادا: النوادر السلگانيه والمحاسن اليوسفيه، تحقيق : احمد ايبش، (دمشق: ٢٠٠٥) مقدمه المحقق، ص ص ٩- ١٣، الاسدى : التيسر والاعتبار والتحرير والاختبار، تحقيق : عبدالقادر احمد گليمات، (مصر:١٩٦٧)، ص٦٨.

٤ احمد الاوتاني: دمشق في العصر الايوبي، تقديم سهيل زكار، (دمشق:٢٠٠٧)، ص٥٧، احمد مختار العبادي، في تاريخ الايوبيين والماليك، (بيروت:١٩٩٥)، ص٤٣.

ئەوەشیان بە نموونە دیارە کاتێك مەلیك موعیز ئیسماعیل[1] لە ساڵی (٥٩٨ك/ ١٢٠١ز) بانگەشەی خیلافەتی کردو وای نیشاندا قورەیشییەو نەوەی ئومەویەکانە[2].

دیارە ئەم هەواڵەش دەنگدانەوەیەکی زۆری لێکەوتووە، بەتایبەتی لە لایەن مەلیك عادل (٥٩٦- ٦٢٥ك/ ١١٩٩- ١٢١٨ز) زۆر تووڕە بوو نکۆڵی لەو هەواڵە کرد تاوەکو دوا ئەندازە[3] هەروەها گووتی ((ئیسماعیل درۆی کردووە، ئێمە هەرگیزو لە بنەڕەتدا لە بنەماڵەی ئومەویەکان نەبووینە))[4].

هەروەها ئیبن خەلکەکانیش ئاماژە بەوە دەکات سوڵتان صەلاحەددینیش لەسەردەمی خۆیدا ئەو هەواڵانەی بە درۆ خستۆتەوەو دەیگوت : ((ئەو هەواڵانە هیچ بنەمایەکی ڕاستیان نیەو دوورن لە ڕاستی ))[5].

بەو شێوەیە لەبەر رۆشنایی بیرو بۆچوونی سەرچاوەکان بۆمان بەدیار دەکەوێت ڕەچەڵەکی ئەبولفیدا دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی ئەیوبی کوردی و هەروەها لە نەوەی تەقییەددین عومەری کوڕی شاهەنشای ئەیوبییە[6] کە ئەویش کوڕی برای سوڵتان سەلاحەددینە[7].

---

١ مەلیك موعیز ئیسماعیل: کوڕی سەیف و ئیسلام گغتکین کوری ئەیوب، دوای مردنی باوکی لە یەمەن لە ساڵی (٥٩٣ك/ ١١٩٣ز) جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست وە لە ساڵی (٥٩٨ك/ ١٢١١ز) کوژرا، ابن خلكان : وفيات الاعيان، ٢/ ٥٢٤، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی بڕوانە: دلير فرحان اسماعيل: الكورد فى اليمن (٥٦٩- ٨٠٨ك/ ١١٧٣- ١٤٥٤م) دراسه فى تاريخهم السياسى والحچارى، رساله ماجستير غير منشوره مقدمه الى كليه الاداب جامعه صلاح الدين، (اربيل:٢٠٠١)، ص ص ٤٣- ٤٨.

٢ ابن الديبع الزبيدى: قرة العيون باخبار اليمن الميمون، حققه و علق عليه: محمد بن علي الاكوع الحوالي، (القاهرة : ١٩٥٠)، ق١/ ٣- ٤.

٣ نفس المصدر والصفحة .

٤ ابن واصل : مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق : جمال الدين الشيال، (القاهرة:١٩٥٣)، ١/ ٤.

٥ وفيات الاعيان، ٧/ ٣٤١.

٦ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ژیانی تەقییەددین عومەر کوڕی شاهەنشای ئەیوبی، بڕوانە: سازان حسين ابراهيم: الملك المقفر تقى الدين عمر بن شاهنشاه الايوبى (٥٣٤- ٥٨٧هـ/ ١١٣٩- ١١٩١) دراسة في سيرته و عصره، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الاداب جامعة صلاح الدين، (اربيل :١٩٩٤)، ص ص ٢٨- ٣٩.

٧ ابو شامة: الروضتين في اخبار الدولتين، ١/ ١٢٧، ابن خلكان : وفيات الاعيان، ٣/ ٢٥٦.

### دووەم/ خانەوادەکەی :

هەروەکو دیارە خانەوادەی ئەبولفیدا یەکێکە لە خێزانە هەرە دیارو بەرچاوەکانیماڵباتی ئەیوبییەکان و لە هەمان کاتدا ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لە زۆر بواردا، لەبەرئەوە لە سەرچاوەکاندا زانیاری زۆر خراوەتە ڕوو لە بارەیانەوە، هەر بۆیە لێرەدا بە پێویست دەزانرێت زانیاری دەربارەی ئەو کەسایەتیانە لە خانەوادەکەیدا بخرێتە ڕوو ڕاستەوخۆ ڕۆڵیان هەبووە لەسەر شانۆی ڕامیاری شاری حەماو گرنگترین ئەو ڕووداوانەی بە گشتی لەناوچەکەدا ڕوویانداوە.

### أ- باوکی:

عەلی کوڕێ مەحمودی کوڕی محەمەدی کوڕی تەقییەددین عومەری کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەیوبی کوڕی شادیە[1]، وە نازناوی (مەلیك ئەفضە ل) بووە[2]، لە ساڵی (٦٣٥ك/ ١٢٣٧ز) لە شاری حەما لە دایك بووە[3].

لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەکان زۆر نەپرژاونەتە سەر ژیانی بەشێوەیەکی تایبەتی، بەڵام ئەو گۆڕانکاری و شەڕو شۆڕانەی لەو ماوەیەدا هاتنە ئارا لە ناوچەکەدا ئەوەی سەلماند کەوا چەندە کاریگەری هەبووە لەسەر ڕووداوەکان، بەتایبەتی لەو کاتەی مەلیك مەنصور محەمەد[4] ی برای فەرمانڕەوای شاری حەما بووەو لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیشدا یارمەتیدەر و دەستە ڕاستی بووە[5].

---

١ الصفدي: الوافي بالوفيات، ٢٢/ ١١٦، الزركلي: الاعلام، (بيروت: ١٩٧٩)،٥/ ٢٠.

٢ الصفدي : الوافي بالوفيات: ٢٢/ ١١٦، الزبيدى: ترويح في القلوب، ص٥٤.

٣ ابو الفداء: المختصر، ٢/ ٢٦٥، الحنبلي: شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، تحقيق: ناظم رشيد، (بغداد: ١٩٧٩)، ص٤٤٦.

٤ مەلیك مەنصور محەمەد: کوڕی مەحمودی کوڕی مەحمەدی کوڕی تەقییەددین عومەری کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەیوبی کوڕی شادیە لە ساڵی (٦٣٢ك/ ١٢٣٤ز) لە شاری حەما لەدایك بووە، وە لە ساڵی (٦٤٢ك/ ١٢٤٤ز) لە دوای مردنی باوکی فەرمانڕەوایەتی شاری حەمای وەرگرتووە و لە بەردەوام بووە تاوەکو لە ساڵی (٦٨٣ك/ ١٢٨٤ز) بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد دوای ئەوەی بۆ ماوەی پەنجاو یەك ساڵ ژیا. المقريزي: السلوك لمعرفه دول الملوك، ٢/ ١٨٣.

٥ احمد غسان سبانو: مملك حماه الايوبية، (دمشق: ١٩٨٤)، ص٩٩.

هەروەها لەبەرئەوەی کەسێکی زیرەك و لێهاتوو بووە بەتایبەتی لە بوارەکانی سەربازی و کارگێڕیدا زۆر لە مەلیك و دەسەلآتدارەکان پرس و ڕاو ڕاوێژیان پێکردووە[1].

سەبارەت بە کارو چالاکیە سەربازیەکانیشی لە ماوەی ژیانیدا بەژداریکردووە لە ژمارەیەکی زۆر لەو شەڕانەی کەوا لە ناوچەکەدا ڕوویانداوە، هەر بۆ ئەو مەبەستە بەشداریکردووە لە ڕووبەڕووبوونەوەی مەغۆلەکان لەو کاتەی ڕوویان لە ناوچەکانی شام کردبوو، بە هەمان شێوە سەیفەددین قطز[2] سوڵتانی مەمالیك ئامادەباشی بۆ ئەو شەڕە کردبوو کاتێك بەخۆی و سوپایەك بەرەو ناوچەکانی شام هات و زۆرترینی ئەو سوپایەش پێکهاتبوو لە مەمالیکە تورکەکان و کورد[3] و کوردە قەیموریەکان[4] و هەروەها سوپاسی حەماش لە ژێر سەرکردایەتی مەلیك مەنصور و ئەفضەلی برای بووە [5].

---

١ عبدالرحمن حميدة: ابو الفداء، بحث منشور في كتاب (المؤرخ الجغرافي ابو الفداء صاحب حماه) (دمشق: ١٩٧٥)، ص١١.

٢ سەیفەددین قگر: کوڕی عەبدوڵلای موغیری لە ساڵی (٦٥٧ك/ ١٢٥٩ز) جلەوی دەسەلآتی لە میسر گرتە دەست، وە لە ساڵێ (٦٥٨ك/١٢٦٠ز) لەلایەن دارو دەستەیەوە خزمەتکارو لاینگرەکانی کوژرا دوای ئەوەی بۆ ماوەی ساڵێك حوکمی کرد. ابن دقماق : النفحة المسكية في الدولة التركية، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، (بيروت: ١٩٩٩)، ص ص ٤٥- ٥٢، العصامي: سمط النجوم الحوالي في ابناء الاوائل والتوالي، منشور على موقع الكتروني : www.alwarraq.com، ٢/ ٢٩١.

٣ لە بارەی بەشداری کورد لەم شەڕەدا بڕوانە: موسى مصطفى الهسنياني: السنوات الاخيرة من حياة دولة الكورد الايوبية في مصر وبلاد الشام، (اربيل: ٢٠٠٧)، ص ص ٤٦٤- ٤٧٥.

٤ کوردە قەیموریەکان: یەکێکە لەو هۆزە کوردیانەی لەسەردەمی ئەیوبیەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە بوارەکانی ڕامیاری و ئابوری و ئاوەدانکاریدا، وە خۆشیان نیشتەجێ ی قەلآی قەیمور بروونە لە ناوچەکانی نێوان هەردوو باژێری سعرت و جەزیرەی بۆتان وە ناویشیان هەر لە ناوی قەلآکەوە هاتووە. یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٤/ ٤٢٤، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: زرار صديق توفيق: چەند لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی مێژووی کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، (دهۆك: ٢٠٠٨)، ل ل ٧٦- ١٠٣.

٥ ابو الفداو : المختصر فى اخبار البشر: ٢/ ٣١٥.

ئەوەبوو سوپای هەردوولا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە لە ساڵی (٦٥٨ك/ ١٢٦٠ز) لە شیوی عین جالوت[١] لە ئەنجامدا موسڵمانەکان توانیان شکستێکی گەورە بە سوپای مەغۆلەکان بهێنن و سەرکەون بەسەریاندا[٢].

ئەوەی لێرەدا شیاوی ئاماژە پێکردن بێت، یەکێك لە دەرئەنجامە هەرە گرنگەکانی ئەو شەڕە یەکخستنەوەی میسر و شام بوو لە ژێر سەرکردایەتی یەك سەرکردە کە ئەویش سەیفەددین قطز بوو[٣] وە هەروەها ڕزگارکردنی میسرو شام بوو لە هێرشی مەغۆلەکان و گۆرینی هەڵوێستی موسڵمانەکان لەبەرگریکردن بۆ هێرش بردن[٤].

هەر لەو سەرو بەندەدا مەغۆلەکان دوای شکست خواردنیان لە شیوی عین جالوت دووبارە ڕوویان لە ناوچەکانی شام کردو ئەو جارەیان شاری حمصیان گەمارۆداو لە هەر لەو کاتەدا مەغۆلەکان لەم شارەدا نزیك بوونەوە مەلیك مەنصور مەحمەدو عەلی برای ڕوویان لە شاری حمص کردوو لەوێدا دووبارە خۆیان یەکخستەوە، وە لە ساڵی (٦٥٩ك/ ١٢٢٩ز) دووبارە شەڕ ڕوویدا لەنێوان موسڵمانەکان و مەغۆلەکان، هەرچەندە ژمارەو قەبارەی سوپای مەغۆلەکان گەلێك زیاتر بوو بەڵام دووبارە توانرا گورزێکی کوشندە لە سوپای مەغۆلەکان بدرێت[٥].

هەروەها یەکێکی تر لەو چالاکیە سەربازیانەی کە ئەمیر عەلی بەشداری تێداکردووە فەتح کردنی قەڵای صەفد[٦] بووە لە ساڵی (٦٦٤ك/ ١٢٦٥ز) دوای ئەوەی سوڵتان ظاهر بیبرس[١] بە

---

١ عين جالوت: شارۆچکەیەکە دەکەوێـە نێوان بیسان و نابلس لە دەوروبەری فەلەستین . یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٤/ ١٧٧.

٢ ابو الفداء : المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣١٥، ابن دقماق : النفحة المسكية، ص ص ٥٠- ٥١.

٣ محمود ياسين احمد: الايوبيون في شمال الشام والجزيرة، (بغداد : ١٩٨١)، ص٣١٥.

٤ فايد حماد عاشور: العلاقات السياسية بين المغول والماليك في الدولة المملوكية الاولى، راجعة : جوزيف نسيم، (القاهرة: ١٩٧٦)، ص ص ٥٥- ٥٦.

٥ ابن واصل : مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق : عمر عبدالسلام تدمري، (بيروت: ٢٠٠٤)، ٦/ ٣٠٦، ابو الفداء : المختصر، ٢/ ٣٢٠.

٦ قەڵای صەفد: یەکێکە لە قەڵا قایم و سەخت و دژوارەکان دەڕوانێـە سەر دەریای تەبەریە لە ئـوردن لـە ناوچـەکانی شام. ابو الفداء : تقويم البلدان، اعتني به: رينو والبارون ماك كوكين ديسلان، (باريس: ١٨٤٠)، ص٢٤٣.

خۆی و سوپاکەی بەرەو شام هاتن و لەوێوە بەرەو ئەو قەلاٌیە بەڕێکـەوتن و دوای گـەمارۆدانی شارەکە ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانەکان کوژران، بەلاٌم لەگـەڵ ئەوەشـدا تـوانرا لـە کۆتاییـدا بەشەڕ قەلاٌکە فەتح بکرێت[2].

هەروەها یەکێکی تر لەو شەڕانەی کە ئەمیر عەلی ڕۆڵێکی جوامێرانەی تێدا بینیووە شەڕی ساڵی (٦٦٤ك/ ١٢٦٥ز) یە کاتێك سوڵتانی مەمایك سوپایەکی گەورەی ئامـادەکردوو بـەرەو وڵاٌتی ئەرمەن بەرێکەوتن و تێدا سەرکردایەتی ئەو سوپایە درایە مەلیك مەنصور ئەمیر عەلی برای[3]، ئەوەبوو ئەو سوپایە بەڕێکەوت تـاوەکو گەیشـتە شـاری سـیس[4] لـەولاٌتی ئـەرمینیا و ئـەوانیش لـە لایـەن خۆیانـەوە قایمکـاری زۆریـان لـە ناوچـەکانی خۆیانـدا کردبـوو لـە ژێـر فەرمانڕەوایەتی هێثوم کوڕی قسـطنطین کوڕی باسیل پادشای ئەرمەنی کـە ئـەو کـات لـەوێ نەبوو سەرکردایەتی سوپاکەی خستبووە ئەستۆی کوڕەکانی[5]، ئەوەبوو شەڕێکی گەورە لە نێوان هەردوولا ڕوویداو لە ئەنجامدا سوپای موسڵمانەکان توانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن و یەکێك لە کوڕەکانی پادشا لە مەیدانی شەڕودا بکوژن و ئەویتری یەخسیر بکەن[6].

---

١ ظاهر بیـبرس: کوڕی عەبدوڵلا ی مەنصوری لە ساڵی (٦٥٨ك/ ١٢٦٠ز) بووە سوڵتانی میسرو لە سەردەمی ئەودا بوژانەوەیەکی زۆری بەخۆیەوە بینیووە لە هەموو بوارێکدا، لە ساڵی (٦٧٦م/ ١٢٧٧ز) دوای ئـەوەی بـۆ ماوەی حەڤدە ساڵ حوکمی کر کۆچی دوایی کرد. ابن تغری بردی: المنهل الصافی، ١/ ٤٣٥- ٤٣٦.

٢ الصفدي: نزهة المالك والملوك في مختصر سيرة من ولـي مصـر مـن الملـوك، تحقيـق: عمـر عبدالسـلام تـدمري، (بيروت :٢٠٠٣)، ص١٥٣، كارل بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية، نقلـة الى العربيـة : نبيـة امـين و مـنير البعلبكي، (بيروت :١٩٧٧)، ص٣٦٦.

٣ ابو الفداء : المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٣٣.

٤ سیس: یەکێکە لە شارە هەر گەورەکانی ناوچە(ثغور) سنوریەکانی شـام و دەکەوێتـە نێـوان هـەردوو شـاری ئەنتاکیەو تەرتوس، ياقوت الحموى: معجم البلدان، ٣/ ٢٩٧.

٥ ابو الفداء : المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٣٣، فايد حماد محمد عاشور: الجهـاد الاسـلامي ضـد الصـليبيين والمغول في العصر الملوكى الاولى، (د.م: ١٩٩٥)، ص٢٣٠.

٦ الصفدي: نزهة المالك والملوك، ص١٥٣، ابن دقماق : النفحة المسكية، ص٥٩، عبـاس اقبـال : تـاريخ المغـول منذ حملة جنكيزخان حتى قيام الدولة التيمورية، ترجمة : عبدالوهاب علوب، (ابو ظبي:٢٠٠٠)، ص٢٢٤.

ئەو کوڕەی بەدیل گیرابوو مەلیك مەنصور محەمەد ئەرکی چاودێریکردنی خستە ئەستۆی ئەمیر عەلی برای و ئەویش لەلایەن خۆیەوە پاراستی و تاوەکو هێنایە بەردەستی سولتان[1].

وە هەر لەو ماوەیەدا شەڕو شۆڕ بەردەوام بووە، ئەوەتا لە ساڵی (٦٨٠ك/ ١٢٨١ز) مەغۆلەکان دووبارە ڕوویان لە ناوچەکانی شام کردوو بەرەو شاری حمص هاتن[2] و بەهەمان شێوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان سوپای موسڵمانەکانیش بەرەو ناوچەکانی شام هاتن، وە لێرەدا سولتانی مەمالیك زیرەکانە سوپاکەی دابەشکردو کاتێك باڵی ڕاستی سوپاکەی خستە ژێر سەرکردایەتی مەلیك مەنصور و ئەمیر عەلی برای و هەر ئەوەش وایکرد لەسەر دەستی ئەوان موسڵمانەکان سەربکەون و ژمارەیەکی زۆر لە مەغۆلەکان بکوژن[3].

وە لەلایەکی دیکە دوای ئەوەی لە ساڵی (٦٨٣ك/ ١٢٨٤ز) مەلیك مەنصور محەمەد کۆچی دوایی کردو کوڕەکەی مەلیك موزەفەر مەحمود هاتە شوێنی و هەروەکو چۆن ئەمیر عەلی دەستە ڕاستی باوکی بووە لە بەڕێوەبردنی کاروبارو کردارە سەربازیەکاندا، بە هەمان شێوە بەگرو تینێکی زۆر ترەوە لە خزمەتی کوڕەکەیدا کاریکردووە[4] و لەو ماوەیەشدا بەژداریکردووە لە زۆربەی چالاکیە سەربازیەکاندا.

سەرەڕای ئەوەی لە لایەنی سەربازیدا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو و لە هەمان کاتدا پەیوەندیەکی توندو تۆڵی لەگەڵ سولتانەکانیشدا هەبووە، ئەوە زیاتر لەبەرئەوە بووە کەسێکی زیرەك و لێهاتوو قسەخۆش بووە، لەبەرئەوە پایەیەکی تایبەتی هەبووە لە لای سولتانەکانی میسردا هەر بۆیە لەو کاتانەی سولتان دەرچووبایە بە مەستی ڕاوکردن بانگهێشتی دەکرد، چونکە شارەزایەکی تەواویشی هەبوو لەو بوارەدا[5].

ئەوەبوو لەو کاتەی ئەمیر عەلی لە شاری حەلەب بوو کاتی ڕاوکردن بوو سولتانیش بەدوایدا ناردو ئەویش لە لایەن خۆیەوە لە شاری حەلەب بەرەو دیمەشق بەڕێکەوتن و لە ڕێگادا

---

١ ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر،٢/ ٣٣٣

٢ ابن المغيزل:ذيل مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، (بيروت :٢٠٠٤) ص٩٨، ابم دقماق : النفحة المسكية، ص ص ٧٧- ٧٨.

٣ ابو الفداء: المختصر، ٢/ ٢٣٧- ٣٤٨ ، ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، اعتني به: ابو صهيب الكرمي، (د.م.ت)، ص١٤٦٥.

٤ احمد غسان سبانو: مكلة حماة الايوبية، ص٩٢.

٥ ابو الفداء: المختصر، ٢/ ٣٦٥.

نەخۆش کەوت، لە ساڵی (٦٩٢ك/ ١٢٩٢ز) لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کرد [1] لە تەمەنی پەنجاو حەوت ساڵیدا[2]. دوای ئەوە تەرمەکەی گێڕدرایەوە بۆ شاری حەما لەوێ لەلای باوك و باپیرانی نێژرا[3].

## ب- براکانی:

سەرچاوەکان زۆر بە کەمی پڕژاونەتە سەرژیانی براکانی، ڕەنگە ئەوەش زیاتر پەیوەندی هەبێ بەو ڕۆڵ و کاریگەریەی کەوا لەسەر شانۆی ڕامیاری گێراویانە، بۆیە لێرەدا ئەو زانیاریانە دەخەینە ڕوو کە لە سەرچاوەکاندا لە بارەیانەوە ئاماژەی پێکراوە:

### ١- بەدرەددین حەسەن:

حەسەن کوڕی عەلی کوڕی مەحمودی کوڕی محەمەدی کوڕی تەقییەددین عومەری کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەیوبی کوڕی شادیە[4]، وە نازناوی (ئەمیر بەدرەددین ) بووە [5].

سەبارەت بە لە دایك بوونی بیروڕای جیاواز بەدیدەکرێت، ئەوەتا ئەبولفیدا لە مێژووەکەی خۆیدا لە ڕووداوەکانی ساڵی (٧٢٦ك/ ١٢٣٥ز) ئاماژە بە مردنی براکەی بەدرەددین حەسەن دەکات و دەڵێت : ((لەو کاتەی کە مرد تەمەنی پەنجاو حەوت ساڵ بوو وە بە سێ ساڵ لە من گەورەتر بوو))[6]، بەو پێیە دەبێ لە ساڵی (٦٦٩ك/ ١٢٧٠ز) لە دایك بوو بێ.

لەلایەکی تر هەندێك ئاماژە بەوە دەکەن لە ساڵی (٦٦٧ك/ ١٢٦٨ز) لە دایك بووە، ئەو ڕایەش زیاتر لە گێڕانەوەی ئیبن رافع سەرچاوەی گرتووە کاتێك کە دەڵێت : ((لێم پرسی کەی لە

---

١ ابو الفداء: المختصر ٢/ ٣٦٥، ابن الوردي: تاريخ ابن الوردي، (بيروت: ١٩٩٦)، ٢/ ٢٣١، الحنبلي : شفاء القلوب، ص٤٤٦.

٢ المقريزى: السلوك لمعرفة دول الملوك، ٢/ ٢٤٣.

٣ ابن الجزري: تاريخ حوادث الزمان وانبائه ووفيات الاكابر والاعيان من ابنائه، تحقيق : عمر عبدالسلام تدمري، (بروت: ٢٠٠٦)، ١/ ١٧٣.

٤ ابو الفداء: المختصر، ٢/ ٣٨٠، ابن كثير : البداية والنهاية، ١٣/ ٣٠٩، الزبيدي: ترويح القلوب، ص٥٥، الصويركي: معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها، (السليمانية:٢٠٠٥)، ص٢١١.

٥ العسقلاني : الدرر الكامنة، ٢/ ١٧، ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ١/ ٤١٩.

٦ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٤٤٣.

دایك بووی، ئەویش لە وڵامدا گووتی لە مانگی ڕەجەبی ساڵی (٦٦٧ك/ تەموزی ١٢٦٨ز) لە بەغدا لە دایك بووم))[١].

لەبەر ڕۆشنایی ئەو بیرو بۆچوونانە دەكرێت بووترێت قسەكانی ئەبولفیدا زیاتر نزیكە لە ڕاستی ئەوەش لەبەر چەند هۆكارێك، گرنگترینیان: یەكەمیان ئەو سەرچاوانەی لەبەردەستدان هیچیان ئاماژە بەوە ناكەن خانەوادەی ئەبولفیدا لەو ماوەیەدا لە بەغدا بووبن، دووەمیان ئەمیر بەدرەددین لەسەردەمی ئەبولفیدا مردووە، وە خودی ئەبولفیدا لە هەموو مێژوونووس و كەسانی تر زانیاری دەربارەی خانەوادەكەی خۆی زیاتر هەبووە، لەبەرئەوە دەكرێت پشت ببەستین بە قسەكانی و زیاتر جەخت لەسەر بیروڕاكانی ئەو بكرێتەوە.

بەو پێیەیماڵباتی ئەیوبییەكان زۆربەیان كەسانی زانست دۆست و خوڕەوشت بەرزبوونە وە ئەویش بەدەر نەبووە لەم لایەنانە بەڵكو كەسێكی خوڕەوشت بەرزبووە و هەروەها هەڵسوكەوتی زۆر باش بووە لەگەڵ خەڵكداو لە زۆر زانستدا شارەزایی هەبووەو زانست دۆستیش بووە[٢]، سەرەڕای ئەوانەش كەسێكی دەوڵەمەندو خاوەن موڵك و زەوی و زارێكی زۆر بووە[٣].

ناوبراو لە ماوەی ژیانیدا زۆرجار هەوڵیداوە دەسەڵات وەربگرێت بە تایبەتی دوای مردنی مەلیك موزەفەر مەحمود لە ساڵی (٦٩٨ك/ ١٢٩٩ز) كاتێك هیچ منداڵی لە دوای خۆی جێ نەهێشت، لەو كاتەدا نەیتوانی دەسەڵاتداریەتی لە شاری حەما وەبگرێت دوای ئەوەی لەگەڵ براكانی كۆبوونەوە بۆ دەست نیشانكردنی كەسێك بۆ فەرمانڕەوایەتیكردنی شارەكە بەڵام لە ئەنجامی ململانێیان لەسەر دەسەڵات نەگەیشتنە هیچ دەرئەنجامێك لەو ساڵەدا شاری حەما دەرچوو لە ژێر مالباتی ئەیوبییەكان[٤].

هەروەها لەسەردەمانی دواتریش بەردەوام بووە لە هەوڵەكانی بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات، ئەوەتا لە ساڵی (٧١٠ك/ ١٣١٠ز) دووبارە هەوڵو كۆششەكانی خستەگەڕ بۆ وەرگرتنی

---

١ العسقلاني : الدرر الكامنة، ٢/ ١٧.

٢ ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ١/ ٤١٩، الصويركي: معجم اعلام الكرد، ص٢١١.

٣ االعسقلاني : الدرر الكامنة، ٢/ ١٧.

٤ ابو الفداء : المختصر، ٢/ ٣٨٠، فواد افرام البستاني : دائرة المعارف، (بيروت:١٩٩٤)، مج ٥/ ٢٧.

فەرمانڕەوایەتی شاری حەما بەو پێیەی لە ئەبولفیدا گەورەتر بووە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت سولْتان ئەبولفیدای بە پێش خستوو کردی بە دەسەڵاتداری شارەکە[1].

وە لە ساڵی (٧٢٦ك/ ١٣٢٥ز) لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەبولفیدای برای لە شاری حەما کۆچی دوایی کرد[2].

**٢- ئەسەدەددین عومەر:**

عومەر کوڕی عەلی کوڕی مەحمودی کوڕی محەمەدی کوڕی تەقییەددین عومەری کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەیوب[3].

هیچ زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەر دەستدانیە لەسەرچاوەکاندا دەربارەی لە دایك بوونی و چۆنیەتی ژیانی و تەنانەت خودی ئەبولفیدا خۆشی تەنیا ناوی دەهێنی بەتایبەتی لە ڕووداوەکانی ساڵی (٦٩٨ك/ ١٢٩٩ز) لەو کاتەی مەلیك موزەفەر مەحمود مردووە ئەویش ئامادەبوو لەو کاتەی کۆبوونەوە کراوە بۆ دانانی کەسێك لە شوێنی مەلیك موزەفەر، بەڵام دەرئەنجامی کۆبوونەوەکە لەبەر ململانێ نەگەیشتنە هیچ ئەنجام و دەرچوونی شاری حەما بوو لەو ساڵەدا[4].

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت ئەبولفیدا کەمتر قسەو باس لە براکانی دەکات، ئەوەش زیاتر لەبەرئەوە بووە کە بەردەوام ململانێیان لە نێواندا هەبووە لەسەر دەسەڵات.

**سێیەم / لەدایك بوون و پێگەیشتنی:**

ئەبولفیدای ئەیوبی لە جەمادی یەکەمی ساڵی (٦٧٢ك/ تشرینی دووەمی ١٢٧٣ز) [5] لە خانووە زەنجیلی [6] لە شاری دیمەشق لە دایك بووە[1]، لێرەدا ئەبولفیدا خۆی باسی لە هۆکاری چوونیان

---

١ االعسقلاني : الدرر الكامنة، ٢/ ١٧.

٢ المقريزى : السلوك لمعرفة دول الملوك، ٣/ ٩٣، ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٩/ ٢٦٧.

٣ ابو الفداء : الكناش في فنى النحو والصرف، تحقيق : رياض بن حسن الخوام، (بيروت :٢٠٠٤)، ١/ ١٢، احمد غسان سبانو: مملكة حماة الايوبية، ص٩٨.

٤ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٨٠.

٥ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٩/ ٢٩٢، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب في اخبار من ذهب، (بيروت: د.ت)، ٦/ ٩٨، محمد امين زكي: مشاهير الكردو كردستان، ترجمة : السيدة كريمته، (دمشق: ٢٠٠٦)، ١/ ٨٤.

٦ خانووى زةنجيلي: خانوويَكة لة ديمةشق باوكى ئةبولفيدا وةكو ميرات لة باثيرانى بؤى بةجيَمابوو . عبدالرحمن حميدة: ابو الفداء، ص١٠.

دەكات بۆ شاری دیمەشق، كاتێك خاو خێزانیان گشتیان لە شـاری حـەمابوون بـەلآم ((لـە ئـەنجامی بلآوبوونەوەی هەواڵی هاتنی تەتەر بۆ ناوچەكانی شام حەما ڕوویان لە شاری دیمەشق كرد))[2].

سەبارەت بە پێگەیشتنی، هەرچەندە سەرچـاوەكان زانیاریـەكی ئـەتۆ نـادەن بـە دەسـتەوە دەربارەی ژیانی منداڵی و چۆنیەتی پێگەیشتنی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێت بووترێـت لـە خێزانێكدا پەروەردە كراوە كە یەكێكە لە بنەماڵە هەرە دیارو بەرچاوەكانی مێژووی ئیسـلامی و سەرەڕای ئەوەش لە ناوچەیەكدا پێگەیشـتووە كـەوا دەیـان سـاڵ بـوو لـە ژێـر قەڵـەمڕەوی بنەماڵەكەیاندا بەڕێوە دەبردا[3]، ئەوەش كاریگەری زۆری هەبووە لەسەر پێگەیشتنی كەسایەتی ئەبولفیدا بەشێوەیەك لە سەرەتاكانی ژیانی منداڵیدا قورئانی پیرۆز و چـەند كتێبێكـی لەبـەر كردووەو هەروەها سوودی لە زۆربەی زانستەكانی سەردەمی خۆی وەرگرتـووە[4]، ئـەوەش زیـاتر لێرەدا ئەوەمان بۆ بەدیار دەخات كەوا بنەماڵە ناودارە موسڵمانەكان چەندە پەرۆش بوونـە بـۆ منداڵەكانیان بۆ ئەوەی بە زانستە ئاینیەكانی سەردەمی خۆیان ڕۆشنبیریان بكەن[5].

لە پاڵ ئەوەی پەروەردەكراوە بە زانسـتە ئاینیـەكانی سـەردەمی خـۆی لـە هـەمان كاتـدا ڕاهێنراویشە لەسەر كاری سەربازیش[6]، ئەوەش زیاتر پەیوەندی بە بارودۆخی ناوچـەكە هـەبووە لەو ماوەیـەدا بـەردەوام شـەڕو شـۆڕ لـە ئـارادابووە لەگـەڵ خـاچ دروشمـەكان[7] و ئـەو هێـزە داگیركەرانەی ڕوویان لە ناوچەكەدا دەكرد، هەر بۆیە ببووە پێداویستیەكی زێدەكی بـۆ ئـەوەی منداڵەكانیان ڕابهێنن لەسەر كاری سەربازی.

---

١ الحنبلي: شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، ص٤٥٨، محمد علي الصويركي: معجم اعلام الكرد، ص٩٩.

٢ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٣٩.

٣ احمد غسان سبانو: مملكة حماة الايوبية، ص١١٣.

٤ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة٩/ ٢٩٢- ٢٩٣، وينظر ايضا كتابه: المنهل الصافي والمستوفي بعد الوافي، ١/ ٣٦٠.

٥ ارسن موسى رشيد واسماعيل شكر رسول: الملك المؤيد ابو الفداء: دراسة في حياته السياسية والعلمية (٦٧٢-٧٣٢هـ/ ١٢٧٣- ١٣٣١م)، مجلة كلية التربية، عدد (١)، (بغداد:٢٠٠٠)، ص٣٠.

٦ كراتشكوفسكي : تاريخ الادب الجغرافي العربي، نقله الى العربية : صلاح الدين عثمان هاشم، قـام بمراجعتـه: ايغور بليايف، (القاهرة:١٩٦٣)، ق١/ ٣٩٠، محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٨٧.

٧ بۆ زیاترزانیاری لە بارەی شەڕی خاچ دروشمەكان بڕوانە: قاسم عبده قاسم:ماهيه الحروب الصليبيه، (الكويـت :١٩٩٠)، ص ص ٩- ١٠٩، سعيد عبدالفتاح عاشور: الحركةالصلبية صفحة مشرقة في تاريخ الجهاد الاسلامي في عصور الوسطى، (القاهرة: ١٩٩٧)، ١/ ١٧- ٢٥.

هەربۆیە ئەوەی دەکرێت ئاماژەی پێ بکرێت لەو ماوەیەدا ئەبولفیدا بەدەر نەبووە لە چالاکی سەربازی، بەڵکو باوکی لە زۆربەی شەڕەکانیدا لەگەڵ خۆیان بەشداری پێدەکرد[1]، ئەوەتا لە تەمەنی هەرزەکاریدا بەشداربووە لە پاکردنەوەی قەڵای مەرقب[2] لە خاچ دروشمەکان، هەروەکو چۆن خۆی باس دەکات و دەڵێت: ((ئامادەبوومە لە گەمارۆدانی قەڵای مەرقب، ئەو کاتە تەمەنم دوانزە ساڵ بوو، ئەمە یەکەمین شەڕ بوو کە بینیوومە و لەگەڵ باوکمدابووم...))[3]، هەروەها هەر لەو ماوەیەدا بەشداریکردووە لە زۆربەی شەڕەکانداو لەبەر ئازایەتی و دلێری لە مەیدانەکانی جەنگدا لە ساڵی (٦٩٠ك/ ١٢٩١) پایەی (ئەمیر عشرە)[4]ی پێدراوە، هەروەها لە ساڵی (٦٩٢ك/ ١٢٩٢ز) پایەی (طبلخانە)[5] ی پێدراوە لە لایەن مەلیك موزەفەر مەحمود[6] ی کوڕی مامی کە ئەو کاتە فەرمانڕەوای شاری حەما بووە.

---

١ العیني: عقد الجمان في تاریخ اهل الزمان، حققه ووضع حواشیه: محمد محمد امین، (القاهرة : ١٩٨٨)، ٣٣٩/٢، شاکر خصباك کتابات مضیئة في التراث الجغرافي العربي، (بغداد: ١٩٧٩)، ص ٢٢٠.

٢ مەرقب : یەکێکە لە قەڵا قایم و سەختەکان وە دەڕوانێتە سەر دەریای ناوەڕاست، ابو الفداو: تقویم البلدان، ص٢٥٥.

٣ المختصر فی اخبار البشر، ٢/ ٣٣٥.

٤ ئەمیر عشرە: پایەکی سەربازی بوو لەسەردەمی مەمالیکەکان سەرپەرشتی دە جەنگاوەر یاخود سەرباز تا بیست جەنگاوەری دەکرد، القلقشندی: صبح الاعشی فی صناعه الانشا، شرحه وعلق علیه: محمد حسین شمس الدین، (بیروت:١٩٨٧)، ١٥/٤، ابن کنان: حدائق الیاسمین في ذکر قوانین الخلفاء والسلاطین، تحقیق: عباس صباغ، (بیروت:١٩٩١)، ص١٠٨.

٥ ئەمیر طلبخانة : لە چینی دووەم بووە لە پلەو پایەکانی سەردەمی مەمالیك کاتێك سەرپەرشتی چل جەنگاوەر تا هەشتا جەنگاوەری دەکردو هەروەها دەهۆڵیش لەبەر دەرگایدا لێدەدرا. القلقشندی: صبح الاعشی٤/ ١٥، حسان حلاق و عباس صباغ: المعجم الجامع في المصطلحات الایوبیة والمملوکیة والعثمانیة ذات الاصول العربیة والفارسیة والترکیة، (بیروت:١٩٩٩)، ص٢٤.

٦ مەمالیك موزەفەر مەحمود: کوڕی مەحمەدی کوڕی مەحمودی کوڕی محەمەدی کوڕی تەقییەددین عومەری کوڕی شاهەنشای کوڕی ئەیوب لە ساڵی (٦٨٣ك/ ١٢٨٤ز) لە دوای مردنی باوکی بووە فەرمانڕەوایی شاری حەماوە بەردەوام لە دەسەڵات تاوەکو مردنی لە ساڵی (٦٩٨ك/ ١٢٩٨ز) وە بۆ ماوەی پانزە ساڵ حوکمی کرد لە شاری حەما، الحنبلی : شفاء القلوب، ص ص ٤٥٣- ٤٥٨.

بۆیــە لێــرەدا بۆمــان بــەدیار دەكــەوێت ئەبولفیــدا هــەر لــە ســەرەتایی تەمــەنی لاویــدا بەشداریكردووە لە زۆربەی كرداره سەربازیەكان و بەرگریكردن لە جیهانی ئیسلامی لە دژی ئەو هێزو لایەنانەی كە لە ناوچەكەدا بوونیان هەبووە یاخود ڕوویان تێكردووە.

**چوارەم/ منداڵەكانی:**

سەبارەت بە منداڵەكانی ئەبولفیدا، زۆربەی سەرچاوەكان باس لەوە دەكەن كوڕێكی هەبووە بەناوی محەمەدی كوڕی ئیســماعیل كــوڕی عــەلی كــوڕی مــەحمودی كــوڕی محەمــەدی كــوڕی تەقییەددین عومەری كوڕی شاهەنشای كوڕی ئەیوبی كوڕی شادی[1].

لە بارەی ژیانی، سەرچاوەكان باس لە ساڵی لە دایك بوونی ناكەن، تەنیا ئەبولفیدا خۆی لە ڕووداوەكانی ساڵی (٦١٢ك/ ١٢١٥ز) ئاماژە بە ساڵی لە دایك بوونی دەكات و دەڵێت : ((لــە ڕۆژی پێنج شەممەی مانگی ڕەجەبی ساڵی (٦١٢ك/ تشرینی دووەمی ١٢١٥ز) محەمەدی كــوڕم لە دایك بوو))[2].

ناوبراو لە ماوەی ژیانیدا چەند نازناوێكی هەبووە، ئەوەتا باوكی لە ماوەی ژیانیدا نازنــاوی (مەلیك مەنصور) ی پێدابوو[3]، هەروەها لە دوای مردنی باوكی و وەرگرتنــی فەرمانڕەوایــەتی شاری حەما نازناوی (مەلیك ئەفضــە ل)ی پێدراوە لە لایەن سوڵتان مەحەمەدی كــوڕی قــلاون وەكو نازناوی باپیری[4].

ئەبولفیدا گرنگیەكی زۆری بە كوڕەكەی داوە بە جۆرێك بە هەموو شێوازێك كــاری لەســەر كردووە بۆ ئەوەی بە شێوەیەكی دیار بەدیاربكەوێت لەســەر شــانۆی ڕامیــاری بەتایبــەتی لــەو كاتانەی سەردانی میسری كردووە لەگەڵ خۆیا بردوویەتی بۆ ئەوەی لە نزیكەوە ئاشنایی بكات بە سوڵتانی مەمالیك و هەروەها لەدوای خۆی ئەركی وەرگرتنی پۆستی فــەرمانڕەوای حــەمای بۆ ئاسان بكات[5]، وە تا ڕادەیەكی زۆریش لەبەدیهێنانی ئەو ئامانجە سەركەوتوو بوو.

---

١ الذهبي: وفيات سير اعــلام النــبلاء، حققــه ورتبــه: خليــل بــن مــامون شــيحار، (بــيروت:٢٠٠٧)، ص٨٣٠، الصفدي: الوافي بالوفيات،٢/ ١٦٠، الحنبلي : شفاء القلوب، ص٤٦٢.

٢ المختصرفي اخبار البشر، ٢/ ٤١٤.

٣ الصفدي: الوافي بالوفيات، ٢/ ١٦٠.

٤ الذهبي: وفيات سير اعلام النبلاء، ص٨٣٠، الصفدي: الوافي بالوفيات، ٢/ ١٦٠، ابن الــوردي: تــاريخ ابــن الوردي، ٢/ ٢٨٨.

٥ ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، ٢/٤٤٥.

ئەوەبوو لە دوای مردنی باوکی لەساڵی (٧٣٢ك/ ١٣٣١ز) لـە تەمـەنی بیسـت سـاڵیدا [١] پۆستی فەرمانڕەوایەتی شاری حەمای وەرگرت[٢].

وە لە ماوەی دەسەلاَتی خۆیدا هەوڵیداوە وەکو باوکی دڵسۆز بێ بۆ سوڵتانەکانی مەمالیك، بەلاَم بە تێپەڕبوونی کات نەیتوانیووە سەرکەوتوو بێ، چونکە خـاوەن یـەك هەڵوێسـت نـەبووە بەڵکو هەندێك کات لاینگری سوڵتانی کردووەو هەندێك کات پشتگیری لە جێگرەکەی کـردووە لە شام و هەندێك کات خۆی بەلای خزم و لایەنگرانی خۆی داوە[٣].

بەو شێوەیە دوای ئەوەی نەیوانی پارێزگاری لە متمانەی سوڵتانی میسر بۆ خۆی مسـۆگەر بکات لە دیمەشق دەست بەسەر کرا[٤] و لەوێدا وەکو ئەمیرێك مایەوە تاوەکو لە ساڵی (٧٤٢ك/ ١٣٤١ز) کۆچی دوای کرد[٥].

جێگای ئاماژەپێکردنە پێش مردنی، هاوسەرەکەی بە سەختی نەخۆش کـەوت ئـەویش زۆر شپرزە بوو دارمەیتێکی بۆ ئامادەکرد بۆ ئەوەی لە دوای گیان سپاردنی تەرمەکەی پێ بباتەوە شاری حەما، بەلاَم قەدەر وابوو خۆی پێش هاوسەرەکەی مردوو بە هەمان دارەمەیت بردیانـەوە شاری حەما[٦] و لە تەنیش باوکی نێژرا[٧].

---

١ ابن الوردي: تاريخ ابن الوردى، ٢٨٨/٢.

٢ الصفدي: الوافي بالوفيات، ١٦٠/٢، ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ١٠٠/٩.

٣ الصفدي: الوافي بالوفيت، ١٦٠/٢.

٤ محمد امين زكي: تاريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامى، عربه: محمد علي عوني (د.م:١٩٤٥)،ص٢٧٠.

٥ الذهبي: وفيات سير اعلام النبلاء ص ٨٣٠، المقريزي: السلوك،٣٧٢/٣، محمد امين زكي: مشاهير الكرد وكردستان،٤١١/٢.

٦ الصفدي: الوافي بالوفيات،١٦٠/٢.

٧ فؤاد افرام البستاني: دائرة المعارف، مج٢٧/٥،احمد غسان سبانو : مملكة حماة الايوبية، ص١٣٥.

بە مردنی مەلیك ئەفضەل كۆتایی بە دەسەلاّتی مالباتی ئەیوبیەكان هات لە شاری حەما[1] و دەسەلاّتی ئەو شارە درایە (طقز تمر)[2]، ئەوەش بووە جێگای نیگەرانی خەڵكی حەماو لەو ساتەوە بە چاوی ڕق و كینە دەیان ڕوانیە سوڵتانی مەمالیك لە میسر[3].

هەروەكو باس كرا سەرچاوەكان گشتیان باس لەوە دەكەن كە ئەبولفیدا تەنیا كوڕێكی هەبووە، تەنیا حەنبەلی باس لەوە دەكات كە كچێكیش هەبووە بەلاّم ئاماژە بەناوەكەی ناكات[4].

**پێنجەم/ مردنی**

سەبارەت بە مردنی ئەبولفیدا، لەمانگی محەرەمی ساڵی (٧٣٢ك/ تشرینی یەكەم ١٣٣١ز) دوای ئەوەی بۆ ماوەی دوانزە ڕۆژ نەخۆش كەوت[5] لەشاری حەما كۆچی دوایی كرد[6]، كاتێك شەست ساڵی لەتەمەندا تەواو نەكردبوو[7]، لێرەدا مێژوونوسان باس لەوە دەكەن كە ئەبولفیدا زۆرجار دەیگوت: ((پێم وانیە شەست ساڵ تەواو بكەم چونكە هیچكیان لە ئەندامانی بنەماڵەكەم تەواویان نەكردووە))[8].

---

١ الحنبلي: شفاء القلوب، ص٤٦٥، استانلة لين بول: تاريخ الخلفاء والسلاطين والملوك والامراء والاشراف في الاسلام، ترجمة: مكى طاهرالكعب، (بيروت: ٢٠٠٦)، ص٨٦، زمباور: معجم الانساب والاسرات الحاكمة في التاريخ الاسلامي، اخرجه: زكي محمد حسن و حسن احمد محمود، (د.م:١٩٥١)،١/١٥٤.

٢ طقز تمر: كوڕی عەبدوڵلای حەمەوی، یەكێك بوو لە خزمەتكارەكانی ئەبولفیدا دواتر ڕووی كردە لای سوڵتان محەمەدی كوڕی قلاّون و كچی دایە كوڕەكانی سوڵتان هەر بۆیە بوو بەیەكێك لە گەورەترین ئەمیرەكانی، الحنبلی: شفاء القلوب، ص٤٦٥.

٣ محمد فريد وجدي: دائرة المعارف القرن العشرين، (بيروت:١٩١٠- ١٩١٨)، نيشتمان بشيرمحمد، الملك ابو الفداء الايوبي، ص١٣٠.

٤ شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، ص ص ٤٦٥- ٤٦٦.

٥ ابن الجزري: تاريخ حوادث الزمان وانبائه، ٢/٥٤٠.

٦ الداوداري: كنز الدرر والجامع الغرر (الدر الفاخر في سيرة الملك الناصر)، تحقيق: هانس روبر رويمر، (القاهرة:١٩٧١)،٩/٣٦٤. اليافعي: مراة الجنان وعبرة اليقظان في مايعتبر من حوادث الزمان، تحقيق: خليل منصور، (بيروت:١٩٩٧)، ٤/٢١٣، ابن كثير : البداية والنهاية،١٤/١٤٩.

٧ العسقلاني: الدرر الكامنة،١/٢١٧، كراتشكوفسكي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/٤٩١.

٨ الصفدي: الوافي بالوفيات،٩/١٠٦، ابن تغري بردي: المنهل الصافي،١/٦١.

وه دوای مردنی له نزیك گۆڕی باوكی له قەراخی شاری حەما[1] لەو گۆڕستانەی كە خۆی پێش چوار ساڵ لەمردنی بنیادی نابوو نێژرا له نزیك مزگەوتی (الحیات)[2].

دوای مردنی ئەبولفیدا له ساڵی (٧٣٢ك/١٣٣١ز)دەست بەجێ هاوسەرەكەی [3] هەڵسا بە شاردنەوەی هەواڵی مردنی و ڕاستەوخۆ ڕووی له دیمەشق كرد بۆ بینینی ئەمیر تنكز[4] كە ئەو كات یاریدەدەری سوڵتان بوو له وڵاتی شام وه لەگەڵ خۆیان كۆمەڵێك دیاری بەنرخی هێنابوو، وه داوای لێكرد یارمەتی بدات بۆ ئەوەی كوڕەكەی محەمەد وەكو باوكی ببێتە فەرمانڕەوا له شاری حەما، وه داوای لێكرد یارمەتی بدات بۆ ئەوەی كوڕەكەی محەمەد وەكو باوكی ببێتە فەرمانڕەوا له شاری حەما، ئەویش لەلایەن خۆیەوە ڕازی بوو لەسەر داواكاریەكەی و نامەیەكی بۆ سوڵتان محەمەدی كوڕی قلاون ناردو هەواڵی مردنی ئەبولفیدای پێڕاگەیاند وه داوای لێكرد كه كوڕەكەی له شوێنی باوكی بكاته فەرمانڕەوا له شاری حەما، دیاره سوڵتانیش بە مردنی ئەبولفیدا زۆر پەشۆكاو غەمبار بوو ڕازی بوو لەسەر داواكاریەكەیان[5].

هەربۆیە لێرەدا بەدیاردەكەوێت كەوا هاوسەری ئەبولفیدا چەندە ڕۆڵێكی كاریگەری هەبووە له دانانی كوڕەكەی و دەرنەچوونی شاری حەما له ژێرماڵباتی ئەیوبیەكان.

---

١ ابن كثير : البداية والنهاية، ١٤٩/١٤.

٢ مزگەوتی (الحیات): ناسراوه به مزگەوتی ئەبولفیدا چونكه خۆی له ساڵی سبانو: مملكه حماه الايوبيه، ص ص ١٢٩-١٣٠.

٢ لەسەرچاوەی ژینامەو چینەكان و تەنانەت ئەبولفیدا خۆشی زانیاریەكی ئەوتۆ نادات بەدەستەوە له بارەیەوە. (٧٢٧ك/ ١٣٢٧ز) بنیادی ناوه وه هەروەها ناسراوه به مزگەوتی مارەكان چونكه دینگەكانی له شێوەی مار هاتۆتەوە سەر رووباری عاصی و هەروەها لەبەر جوانیەكەی مزگەوتی (الدهشە)ی پێ گوتراوە. كراتشكوفسكی: تاريخ الادب الجغرافي العربي،ق٤٩١/١، احمد غسان سبانو: مملكه حماه الايوبيه، ص ص ١٢٩-١٣٠.

٣ لەسەرچاوەی ژینامەو چینەكان و تەنانەت ئەبولفیدا خۆشی زانیاریەكی ئەوتۆ نادات بەدەستەوە له بارەیەوە.

٤ ئەمیر تنكز: سەیفەددین كوڕی عەبدوڵڵای تاهری لەساڵی (٦١٢ك/١٢١٥ز) بووه و یاریدەدەری سوڵتان له شام وه له ساڵی (٧٤٠ك/ ١٣٣٩ز) دەست بەسەركراو له شاری ئەسكەندەریە ژەهر خواردكرا. الذهبي: دول الاسلام، حققه وعلق عليه: حسن اسماعيل مروة، قدم له: محمد الارناووط، (بيروت:١٩٩٩)،٢٨٥/٢، ابن كثير : البداية والنهاية،٨٢/١٤.

٥ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٩/ ١٠٠.

به مردنی ئەبولفیدا خەڵك لە هەموو لایەکەوە لە شاری حەما پەشۆکاو غەمبار بوون بەتایبەتی زانایان و رۆشنبیران، چونکە لەسەردەمی ئەودا لەوپەڕی خۆشگوزەرانی ژیانیان دەبردەسەر[1]، ئیبن نەباتە[2] ی هونراوە بێژ شیوەنی بۆ کردوو بە هۆنراوە ماتەمینی بۆ دەربڕی و گووتییەتی :

| | |
|---|---|
| ماللندي مايليي صوت داعية | اظن ان ابن شادي قام ناعية |
| ماللرجاء قد اشتدت مذاهبة | ماللزمان قد اسودت نواحية |
| مالي ارى الملك فضت مواقفة | مالي ارى الوفد قد فاضت مافيه |
| نعي المؤيد ناعية فوا اسفا | للغيث كيف غدت عنا غودايه[3] |

(ئەم مردووە ناتوانێ وەڵامی بانگکەرانی بداتەوە وا پێدەچێت کوڕی شادی شیوەنی بۆ بکات، ڕێچکەکانی خۆزگەکانمان زۆر بە پێز بوو ئەم سەردەمە بۆ بارەکەی تاڵ وە ڕەش بوو، بۆچی هەموو کاتێك کارەکانی پادشا بە باشی لێکدەدرێتەوە وە بۆچی نەم دیت ئەم ئاگردانە فرمێسکی ئاگری کۆتایی بێت، مەلیك موئەیەدیش مردنی ئەو کەسە ڕادەگەیەنێ کە شیوەنی بۆ کراوە داغ بۆ ئەو بارانەی لە هەموو لایەکەوە ئاوی بۆمان هەڵساند).

---

١ محمد اميم زكي: مشاهير الكرد وكردستان، ١/ ٨٥.

٢ ئیبن نەیاتە: ئەبو بکر جەمالەددین محەمەد لە ساڵی (٦٨٦ك/ ١٢٨٦ز) لە قاهیرە لە خێزانێکی ئایین پەروەرو زانست دۆست لە دایك بووە، تاوەکو تەمەنی سی ساڵی لە میسر بووە دواتر ڕوویکردە ناوچەکانی شام و پەیوەندی کرد بە ئەبولفیدا لە خزمەتیدا بووە بە هۆنراوەو دوای مردنی لە خزمەتی کوڕەکەشی بووە دواتر لە ساڵی (٧٦٠ك/ ١٣٥٨ز) گەڕایەوە میسرو لە ساڵی (٧٦٨ك/ ١٣٦٦ز) لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردو یەکێك بوو لە هۆنراوە بێژە هەرە گەورەکانی سەردەمی خۆی. الصفدی: الوافی بالوفیات،١/١٣٦.

٣ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة،٢٩٣/٩. وينظر ايضا كتابه: المنهل الصافي،٢٦١/١.

# تەوەرەی دووەم

## ژیاننامەی زانستی ئەبولفیدا

### یەکەم/ پێگەیشتنی زانستی و دیارترین مامۆستاکانی:

هەروەکو لە پێشتردا باسکرا زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نیە دەربارەی ژیانی منداڵی و چۆنیەتی پێگەیشتنی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت ئاماژە بە چەند فاکتەرێك بکرێت کە یارمەتیدەر بوون لەوەی هەر لە سەرەتایی تەمەنی منداڵیدا پێگەیشتنێکی زانستی بەخۆ بگرێت. زاناو ڕۆشنبیرو هۆنراوە بێژ وە هەروەها لە زۆر بواردا چەندین دانراویان هەبووە[1]، ئیتر ئەوەش کاریگەری لەسەر کەسایەتی ئەبولفیدا هەبووە بە جۆرێك لە تەمەنێکی زوودا قورئانی پیرۆز و چەندین کتێبی لەبەرکردووە[2].

وە هەروەها ئەو گۆڕانکاریە ڕامیاریانەی کە لە جیهانی ئیسلامی هاتبوونە ئارا دوای ئەوەی مەغۆلەکان دەستیان بەسەر بەغدا داگرت لە ساڵی (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز) ژمارەیەکی زۆر لە زاناو بیرمەندو رۆشنبیر بە خۆیان وخاو خێزانیان ڕوویان لە ناوچەکانی شام و میسر کردبوو[3]، ئەوەش وایکرد لەسەردەمانی دواتردا ڕۆڵی کاریگەریان هەبێ لە پێشخستنی لایەنی زانستی لە ناوچەکەداو بە جۆرێك سوودیان لێ وەربگیرێت لە زۆر بواردا[4]، هەر لەو سەروبەندەدا قاهیرە شوێنی بەغدای گرتەوەو بووە شوێن و پێگەی دالدەدانی زانایان و ڕۆشنبیران و دواتریش ئەوانە

---

١ احمد الاوتاني: دمشق في العصر الايوبي، ص٣٣٧.

٢ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٩/ ٢٩٢.

٣ ابن عبدالظاهر: تشريف الايام والعصور في سيرة الملك المنصور، حققه مراد كامل، راجعه: محمد علي نجار، (القاهرة:١٩٦١) ص٢٧٨.

٤ موسى باشا: الادب في بلاد الشام عصر الزنكيين الايوبيين والماليك، (بيروت:١٩٨٩)، ص١٢٠.

سوودی زۆریان لێوەرگیرا لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی مەمالیك بەتایبەتی لەناوچەکانی میسرو شامدا[1].

وە لەلایەکی تر ئەو شوێنەی تێیدا پێگەیشتووە لە ڕووی کەش و هەواوە، ئاو و هەوایەکی خۆش و لە باری هەبووەو هەروەها ناوچەکانی شامیش هەر خۆی ناوچەیەکی ستراتیژی گرنگ بووە کاتێك دەکەوێتە نێوان حیجازو عێراق و میسر و ناوچەیەکی سەرە ڕێگای گرنگ بووە بۆ کاروانی حاجیان و بازرگانەکان[2]، لەبەر ئەوە دەکرێت بڵێین ئەو فاکتەرەش تا ڕادەیەك کاریگەری هەبووە لەسەر پێگەیشتنی زانستی، چونکە هەموو کات ئاوهەوای لەبار زیاتر دەرفەت دەڕەخسێنی بۆ ئەوەی تاکەکانی لە ڕووی جەستەو بیروهۆشەوە بە ئاسایی گەشە بکەن.

سەرەڕای ئەو فاکتەرانەش دەکرێت ئاماژە بە ژمارەیەك مامۆستا بکرێت کە ئەبولفیدا لەسەر دەستیان فێری زانستەکانی سەردەم بووە، وەك:

**أ- ئەثیرەددین ئەلئەبهەری:**

عبدالرحمان کوڕی عومەری کوڕی محەمەدی سیواسی، یەکێکە لە زانایە هەرە گەورەکان، ئەبولفیدا لەسەردەمی خۆیدا مووچەی بۆ بڕییەوەو دوای مردنی ئەبولفیدا شاری حەمای جێ هێشت و ڕووی کردە شاری حەلەب و لەوێ قوتابییانی فێری زانستی پزیشکی دەکرد[3].

ئەم زانایە شارەزایەکی چاکی هەبووە لە بوارەکانی پزیشکی و زانستی شێوە ناسی[4] و ژمێریاری و ئەندازیاری، هەر بۆیە ئەبولفیدا لەو کاتەدا لەسەردەستی ئەو زانایە فێری ژمارەیەکی زۆر لەو زانستانە بووە[1].

---

١ عمار محمد النهار: عصر المماليك البحرية دراسة فكرية، (دمشق:٢٠٠٧)، ص ص١٢- ١٥.

٢ المقدسي: احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، علق عليه ووضع حواشية: محمد امين الضناوي، (بيروت:٢٠٠٣) ص ص ١٥٠- ١٥١، محمد كرد علي: خطط الشام، (بيروت:١٩٦٩)، ١/ ١٤-١٦.

٣ العسقلاني : الدرر الكامنة، ٢/٢٠٤.

٤ زانستی فەلەکناسی (علم الهيئه) : یەکێکە لەو زانستانەی دەڕوانێتە جوڵەی هەسارە جێگیرو گەڕۆکەکان و بەشێوەو دوورو نزیکیان لە یەکترەوە بە مەبەستی دیاریکردنی کات، وە زیاتر لەو کاتانەی کە لە بیابات یاخود لە دەریا بێت کاتی پێ دیاری دەکرێت، طاش كبرى زادة: مفتاح السعادة ومصباح السيادة في موضوعات العلوم، (بيروت:١٩٨٥)، ١/ ٣٤٨، عبدالمنعم ماجد: تاريخ الحضارة الاسلامية في العصور الوسطى، (القاهرة:١٩٧٢)، ص ص ٢٢٤- ٢٢٩.

**ب- جەمالەددین محەمەد کوڕی واصل:**

جەمالەددین محەمەد کوری واصل کوڕی سالم کوڕی نەصرولڵای کوڕی سالمی حەمەویە لە ساڵی (٦٠٤ك/ ١٢٠٧ز) لە شاری حەما لە دایك بووەو لە ماوەی ژیانیدا زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی گەڕاوەو پەیوەندیەکی بەتینی هەبووە لەگەڵ سوڵتانەکانی سەردەمی خۆی، و هەروەها لە زۆر بواردا زۆر شارەزابووە بەتایبەتی لە خستنەڕووی ڕووداوە مێژوویەکان بە شێوەیەکی سادە، وە لە ساڵی (٦٩٧ك/١٢٩٧ز) کۆچی دوایی کردووە[٢].

یەکێکی ترە لە مامۆستاکانی ئەبولفیدا هەروەکو خۆی لە ڕووداوەکانی ساڵی (٦٩٧ك/ ١٢٩٧ز) بەو شێوەیە باسی لێوەدەکات و دەڵێت: ((پێشەوایەکی چاکەکەرو دیارو بەرچاو بوو لە زۆر زانستدا وەکو ژێر بێژی و ئەندازیاری و هەروەها کۆڵەگەو بنەماکانی ئیسلام و زانستی شێوەناسی و مێژوو))[٣]، وە هەروەها لەدرێژەی قسەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات ((چەندین جار بە پەرۆشەوە لە شاری جەما چوومەتە خزمەتی و ئەو کێشەو ناڕوونیانەی لە کتێبی ئەقلیدس[٤] هەبووە خستوومەتە بەردەستی و سوودی زۆرم لێوەرگرتووە))[٥] .

بەپێی قسەکانی ئەبولفیدا سوودی زۆری لە جەمالەددین وەرگرتووەو دووریش نیە ئەو زانستانەی کە ئەو شارەزایی تێدا هەبووە لەسەر دەستی فێربووبێ.

**ج- شەرەفەددین ئەبو لقاسم هیبەتوڵلا:**

شەرەفەددین ئەبو لقاسم هیبەتوڵلا کوڕی عەبدولرەحیم کوڕی ئیبراهیم بارزی جوهەینی حەمەوی لە ساڵی (٦٤٥ك/ ١٢٤٧ز) لە شاری حەما لە دایك بووە، وە زۆربەی ژیانی

---

١ قدري الگيلانى و كامل شحادة:المؤيد ابو الفداء وعالما، بحث منشور في كتاب (المؤرخ الجغرافي ابو الفداء صاحب حماه)، ص٢٤٢.

٢ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٨/ ١١٣، ابن العماد الحنبلي : شذرات الذهب، ٥/ ٤٣٨.

٣ المختصر في اخبار البشر، ٢/٣٧٦.

٤ کتێبی ئەقلیدس: خودی ئەو کتێبە هەر بەناوی دانەرەکەیەوە کە ناوی ئەقلیدس کوڕی نوقگرس کوڕی برنیقیس، یەکێك بووە لە فەیلەسوفە یۆنانیە کۆنەکان و شارەزا بووە لە بواری ئەندازیاری و کتێبەکەشی هەر تایبەتە بەو بوارەوە، ئەم کتێبە لەسەردەمی عەباسیەکان دووجار وەرگێردراوە تە سەر زمانی عەرەبی، یەکێکیان لەسەردەمی خەلیفە هارون ئەلڕەشید و ئەویتریان لەسەردەمی خەلیفە مەئمون. ابن النديم: الفهرست، ضبطة و شرعة وعلق عليه: يوسف على طويل، وضع فهارسة: احمد شمس الدين، (بيروت:٢٠٠٢)، ص ص ٤٢٧- ٤٢٨.

٥ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٧٦.

تەرخانکردبوو بۆ لێکۆڵینەوەو دانانی کتێب و چەندین کتێبی جۆراو جۆری لە زۆر بواردا هەبووە، وە هەروەها چەندین جار داوای لێکراوە ببێتە دادوەر لە میسر، بەڵام ڕەتیکردۆتەوە هەر لە شاری حەما ماوەتەوەو لە کۆتاییەکانی ژیانی چاوی لە دەستداوە، لە ساڵی (٧٣٨ك/ ١٣٣٧ز) لە شاری حەما کۆچی دوایی کرد[١].

بەو پێیەی دادوەری شاری حەما بووە شارەزایەکی چاکی هەبووە لە زانستە شەرعیەکان و بابەتی فقهی، وە کاتێك باس لە ڕووداوەکانی ساڵی (٧٣٨ك/ ١٣٣٧ز) دەکرێت، باس لەوە دەکات کە یەکێك بووە لە زانا هەرە گەورەکانی سەردەمی خۆی [٢].

بەو شێوەیە ئەبولفیدا سوودی زۆری وەرگرتووە لە زاناو بیرمەندەکانی سەردەمی خۆی و تا وای لێهاتووە شارەزایەکی زۆری پەیدا کردووە لە زۆر بواردا وەکو قورئانی پیرۆزو زانستە ئاینیەکان و مێژوو و جوگرافیاو هونەرو زانستی پزیشکی و ژیربێژی و شێوەناسی و فەلسەفەو چەندان زانستی تریش[٣].

## دووەم/ گرنگیدان بە زانایان و ڕۆشنبیران:

شاری حەما لەسەردەمی ئەبولفیدا گەشانەوەیەکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی بوو بەتایبەتی لەلایەنی زانستی و رۆشنبیری، دیارە ئەو پێشەکەوتنە بەرچاوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی پێش ئەبولفیدا چونکە بنەماڵەکەی ماوەیەکی دوورودرێژ بوو حوکمی ئەو شارەیان دەکردو هەروەها خۆیان کەسانی زاناو ئەدیب و هۆنراوە بێژبوون، لەبەرئەوە گرنگیان زۆر بەو لایەنە دەداو هەر بۆیە لەو ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە زانایان ڕوویان تێدەکرد[٤].

دیارە ئەبولفیداش لەلایەن خۆیەوە درێغی نەکردووە لەم لایەنەدا بەڵکو کەسانی زاناو ڕۆشنبیری زۆر لا خۆشەویست بووەو بەردەوام لە خۆی نزیك دەکردنەوە[٥] ئەوەی زیاتر وایکردبوو لێیان نزیك بێت ئەوەیە کە خۆی بەوە ناسرابوو کە کەسێکی دەستکراوە بوو لە بەخشیندا وە هەر ئەوەش وایکردبوو خۆشەویست بێ لەلایان[٦]، هەر بۆیە لەم بارەیەوە جاحظ پێیوایە ((ئەگەر

---

١ ابن الوردي : تاريخ ابن الوردي، ٢/ ٢٠٩، الزركلي : الاعلام، ٨/ ٧٣.

٢ المختصر في اخبار البشر،٢/ ٤٨٢، ابن الوردي: تاريخ ابن الوردي، ٢/ ٣٠٩- ٣١٠

٣ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة،٩/ ٢٩٢، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب في اخبار من ذهب، ٦/ ٩٨- ٩٩.

٤ احمد غسان سبانو: مملكة حماة الايوبية، ص ص ١٧٦- ١٧٩.

٥ ابن كثير: البداية والنهاية، ١٤/ ١٤٩، الحنبلي: شفاء القلوب، ص٤١٦.

٦ ابن الوردي: تاريخ ابن الوردي، ٢/ ٢٨٨.

دەسەڵاتداران یاخود پادشایان ڕانەهاتبوون لەسەر دەستکراوەیی و بەخشین، پێویستە لەسەریان ئەو خۆڕەوشتە لە خۆیان بهێننەدی))[1].

سەرەڕای ئەوەی لێیان نزیك بووەو لە هەمان کاتیشدا چاودێری و سەرپەرشتی کردوون بە جۆرێك مووچەی بۆ ژمارەیەکیان بڕییەوە[2] و بە نموونە دیارە کاتێك مووچەی بۆ ئەثیرەددین ئەلئەبهەری بڕییەوە لەو کاتەی لە شاری حەما بوو، هەروەها ساڵانە (٦٠٠) درهەمی مووچە دەدایە ئیبن نەباتەی هۆنراوە بێژی میسری لەو کاتەدا لە شاری دیمەشقیش بوو[3].

وە هەروەها سەبارەت بە هەڵسوکەوتی لەگەڵ زانایان و ڕۆشنبیران پایەکی تایبەتی هەبووە لە نێو ئەو کەسانەی فەرمانڕەوایەتی شاری حەمایان کردووە بە جۆرێك ڕێزێکی زۆری لێدەنان[4]هەروەها کۆشك و دیوەخانەکەی بەردەوام شەپۆلیداوە لە کەسانی زاناو ڕۆشنبیر[5].

لەبەرئەوە هەندێك باس لەوە دەکەن دیوەخانی هیچ دەسەڵاتدارو فەرمانڕەوایەك ئەوەندە زاناو ڕۆشنبیرو هۆنراوە بێژی تێدا کۆنەدەبووەوە لەدوای سەیف ئەلدەولەی حەمدانی[6] ئەوەندەی لە دیوەخانی ئەبولفیدا کۆدەبوونەوە[7]، هەر بۆیە لەم ڕووەوە ستایشی زۆر لە پادشاو دەسەڵاتداران کراوە بەڵام هیچکیان وەکو سەیف ئەلدەولەو ئەبولفیدا ستایش نەکراون کاتێك

---

١ التاج في اخلاق الملوك، (بيروت: ١٩٥٥)، ص٢٤١.

٢ العسقلاني: الدرر الكامنة، ١/ ٢١٧، الشوكاني: البدر الطالع، ١/ ١٠٢.

٣ الصفدي، الوافي بالوفيات، ٩/ ١٠٤، ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ١/ ٢٦١.

٤ ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ١/ ٢٦١.

٥ محمد امين زكي: مشاهير الكرد وكردستان، ١/ ٨٥.

٦ سەیف ئەلدەولە: عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەمدان لەساڵی (٣٠٣ك/ ١٩١٥ز) لە شاری میافارقین لە دایك بووە و کەسێکی دەستکراوە بووە لەبەخشیندا وە هەروەها لە دوای خەلیفەکان لەدیوەخانی هیچ کەسێك ئەوەندە خەڵکانی ڕۆشنبیر کۆنەدەبوونەوە ئەوەندەی لەلای ئەو کۆدەبوونەوە وە لە ساڵی (٣٥٦ك/ ٩٦٧ز) لە شاری حەلەب کۆچی دوایی کرد وە دواتر هێنراوەیە میافارقین و لەوێ نێژرا. ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٣/ ١- ٤، وە بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی بڕوانە: مصطفى الشكعة: سيف الدولة الحمداني مملكة سيف والاقلام، (القاهرة:٢٠٠٠).

٧ احمد غسان سبانو: مملكة حماه الايوبية، ص١٣١.

زۆر نزیك بوونە لە زانایان و هەروەها دەرگـای دیوەخـان و کۆشـکەکانیان والآبـووە بۆیـان لـە هەموو کات و ساتێکدا[1].

بۆیە لێرەدا دەکرێـت بووترێـت فاکتـەری سـەرەکی گرنگیـدان بـە زانایـان لەلایـەن ئەبولفیـدا دەگەڕێـتەوە بۆ خودی کەسایەتی ئەبولفیدا کە خۆی کەسێکی زاناو ڕۆشنبیر بووە وەکـو زۆرێـك لـە ئەندامانی ماڵباتەکەی و هەروەها لەم ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە زانایان ڕوویان لـە شـاری حـەما کردبوو، لەبەرئەوە دەبوایە لەوێدا چاودێریان بکرابایە و یارمەتیان بدرابایە لە هەموو لایەکەوە.

**سێیەم/ بیروڕای مێژوونووسان لە بارەیەوە:**

لێرەدا بە گرنگ دەزانرێت بیروڕای مێژوونووسان لە بارەیەوە بخرێتەڕوو، چـونکە ئـەو پلـەو پایەی ئەبولفیدا هەیبوو جیای کردۆتەوە لە زۆربەی سەرکردەو زاناکانی تر، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە ئەبولفیدا کەسایەتیەکی ڕامیاری و سەربازی بووە وە لـە هـەمان کاتـدا زاناو ڕۆشنبیریش بووە، ئیتر هەر ئەوەش وایکردووە کـە ببێتـە جێگـەی سـەرنج و بایەخـدانی مێژوونووسان و لە بارەیەوە بدوێن.

ئەوەتا هەندێك لە مێژوونووسان زۆر ستایشیان کردووە وە پێیاندا هەڵگوتووە، وەکـو ئـیبن کەثیر لەو بارەیەوە دەڵێت: ((شارەزایی لە زۆر زانستدا هەبووە وەکو فقهـی ئـاینی و زانسـتی شێوەناس و پزیشکی وە لەو بوارانـەدا چـەندین دانـراوی هـەبووە و لـە لایـەنی زانسـتیدا بـە چاکترینی ماڵباتی ئەیوبیەکان دادەنرێت))[2].

هەروەها ئیبن تغری بەردیش زۆر ستایشی کردووەو بەو شێوەیە باسی لێوە دەکـات ((پێشـەوایەکی بە توناو لێهاتوو بووە لە زۆر بواردا وەکو فقه و ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆزو فەلسەفەو هـەروەها زانسـتی ژیربێژی و پزیشکی و لە هەمان کاتدا شارەزایی هەبووە لە بواری هۆنراوەشدا))[3].

هەروەها هەندێك لە مێژوونووسان باس لـەوە دەکـەن لـە هەنـدێك زانسـتدا شـارەزایەکی تەواوی هەبووە وەکو صەفەدی باس لەوە دەکات((زۆر شارەزا بـووە لـە زانسـتی گەردوونناسـی (علم الهیئە) و بەشداریکردووە لە زانستەکانی تریش))[4].

---

١ العسقلاني: الدرر الكامنة، ١/ ٢١٧، الشوكاني: البدر الطالع، ١/ ١٠٢.

٢ البدائية والنهاية، ١٤/ ١٤٩.

٣ المنهل الصافي، ١/ ٢٦٠.

٤ الوافي بالوفيات، ٩/ ١٠٤.

وە هەندێکی تر لە مێژوونووسان پایەی زۆر بەرز دەکەنەوە لە بواری زانستی بـە شـێوەیەك ((کانگایەك بووە بۆ هەموو جۆرە زانسـتێك و ئـەوەش وایکـردووە ببێتـە یـەکێك لـە دیـارە سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان))[1].

هەروەها لە بواری پزیشکیدا زۆر ستایش کراوە، ئەوەتا لە گێڕانەوەیەدا باس لـەوە دەکـرێ جارێکیان ئەبولفیدا هاتە میسرو بانگهێشت کرا بۆ دانیشتنێك کە تێـدا ژمارەیـەك پزیشـکی بەناوبانگیش تێدا ئامادەبوون، ئەوەبوو قسەو باس دەربارەی زۆر زانست کرا تاوەکو هاتنە سەر قسەو باس دەربارەی زانستی گژوگیاو ڕووەك ناسی، ئەوەبوو بـاس لـە هـەر ڕووەکێـك دەکـرا ئەبولفیدا دەیزانی لە کوێ دەڕۆی و چۆن بەکاردێ و بـۆ چ نەخۆشـیەك بـە سـوودە، بێگومـان ئەوەشیان زانستێکی تایبەتی بوو تەنیا پزیشکانی پسپۆڕ شتیان دەربارەیەوە دەزانی لەبەرئەوە بووە جێگای سەرسوڕمانی پزیشك شێخ زەینەددین و گووتی : ((نەمزانییوە هیچ پادشایەك لـە پادشاکانی موسڵمانان گەیشتبێتە ئەو ئاستە لە ب بواری زانستیدا))[2].

بە هەمان شێوە لە سەردانێکی ئەبولفیدا بۆ میسر محەمەدی کوڕیشی لەگەڵ خۆیدا بردووەو لەوێدا نەخۆش کەوت، ئەوەبوو سوڵتانی مەمالیك بەدوای جەمالەددین ئیبراهیمی مەغریبی دا نارد کە ئەو کات لە میسر سەرۆکی پزیشکان بوو بۆ چارەسـەرکردنی کوڕەکـە، ئـەوەبوو لـەو کاتەدا ئەبولفیدا خۆی کەوتە خۆ بۆ دیاریکردنی نەخۆشی کوڕەکـەی و ئامـادەکردنی دەرمـان بۆی، هەر بۆیە سەرۆکی پزیشکان پێی ووت : ((ئەری سەردار، سوێند بە خوا هیچ پێویسـتیت بە من نیە لەبەر داواکاری سوڵتان هاتووم)).

هەروەها هەندێك لە مێژوونوسان باس لەوە دەکەن کە گوێیان لێبووە کەوا باس لەوە کـراوە ((ئەو پاشاو فەرمانڕەوایانەی لە دوای خەلیفە مەئمون(١٩٦- ٢١٨ك/ ٨١٣- ٨٣٣ز) هاتوون ئەبولفیدا لەلایەنی زانستی لە گشتیان زیرەك و بە تواناتر بووە))[3].

هەروەها شارەزایەکی چاکی هەبووە لە بواری جوگرافیـاش، هـەر بۆیـە لـەم ڕووەوەش زۆر ستایش کراوە بە جۆرێك هەندێك پێیان وایە ((گەورەترین زانای جوگرافی سەردەمی خۆی بووە،

---

١ الاسنوي: طبقات الشافعية، (بغداد:١٩٧٠)، ١/ ٤٥٥.

٢ ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ٢/ ٢٦٠.

٣ العصقلاني : الدرر الكامنة، ١/ ٢١٨، بطرس البستاني: دائرة المعارف، (بيروت:د.ت)، ٢/ ٢٩٩.

نەك تەنیا لە ناوچە ئیسلامیەكان بەڵكو لەسەرتاسەری جیهـان))[1]، وە ئـەوەش وایكـرد نـاوی ئەبولفیدا لەسەر دیواری (كۆمەڵەی جوگرافیناسە فەرانسـیەكان) لـە پـاریس لـە پـاڵ گـەورە جوگرافیناسە جیهانیەكان بنووسرێت [2].

**چوارەم/ بەرهەمەكانی:**

ئەبولفیدا ئەیوبی یەكێكە لە كەسایەتیە هەر دیارەكـانی ماڵبـاتی ئەیوبیـەكان، هـەروەكو چۆن كەسێكی دیاربووە لە مەیدانەكانی شەڕدا، بەهەمان شێوە بلیمـەت و لێهـاتوو بـووە لـە بواری زانستیدا، هەر بۆیە لە دوای خۆی كۆمەڵێك بەرهەمی جۆراو جۆری لە بوارەكانی (مێژوو جوگرافیا، زمان، شیكردنەوەی فەرموودەو زانستی پزیشكی) جێ هێشتووە، لێرەدا بە كـورتی تیشك دەخەینە سەر هەر یەكێك لەو بەرهەمانە:

١- المختصر فی اخبار البشر:

یەكێك لەبەرهەمە هەرە دیارەكانی ئەبولفیدا لە بواری مێژوودا كتێبی (المختصر فی اخبـار البشر)[3]ە، وە لە لای هەندێك سەرچاوەو ژێردەرەكانیش بە (تاریخ ابی الفداء)[4] ناوی هاتووە.

ئەو كتێبە پێك هاتووە لە دوو بەرگی گەورە و چوار بـەش لـە خـۆ دەگرێـت وە زیـاتر لـە ڕێگەی ئەو كتێبە ئەبولفیدا ناوبانگی دەكردووە[5].

لەسەرەتایی ئەو كتێبە باس لە هۆكاری نووسینی دەكات و بەشێوەیەك وا بـەدیار دەخـات كە شتێكی وای بە كورتی هێناوەتە كایـەوە لـە مێـژووی كـۆن و سـەردەمی ئیسـلام تـاوەكو خوێنەران لە ڕێگەی ئەو كتێبەوە بەدواداچوونی بۆ بكەن لە كتێبـە درێـژەكان، چـونكە خـۆی سوودی لە زۆر سەرچاوەكانی پێش خۆی وەرگرتووە و كۆیكردۆتەوە لە چوارچێوەی ئـەو كتێبـە كە مێژووی سەردەمی پێش ئیسلام و سەردەمی ئیسلام لە خۆ دەگرێت.

وە لەلایەكی تر بیروڕای جیاواز بەدیدەكرێت لە بارەی ئەو ساڵەی كۆتایی بە نووسینی كتێبەكەی هێناوە، [1]، وە هەروەها هەندێكی تر ساڵی (٧٢٩ك/ ١٣٢٨ز) بە ساڵی كۆتایی نووسینی كتێبەكـە

---

[1] ابن الوردي : تاريخ ابن الوردي، ٢/ ٢٨٨.

2 G.Sarton; lntroduction to History of Science, (Baltimore;1944) .p.200.

٣ عبدالرحمن حميدة: اعلام الجغرافيين العرب، (دمشق:١٩٩٥)، ص٥٣٧.

٤ ابن كثير: البداية والنهاية، ١٤/ ١٤٩، ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ١/ ٢٦١، العماد الحنبلي : شذرات الذهب، ٦/ ٩٩.

٥ عبدالرحمن حميدة: اعلام الجغرافيين العرب، ص٥٣٧، الزركلي: الاعلام، ١/ ٣١٩.

دادەنێن[2]، وە هەندێکی تر جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە ساڵی (٧٣١ك/ ١٣٣٠ز) دوایین ڕووداوی کتێبەکەیە[3]، لە ڕاستیدا ئەو بۆچوونە لەوانی پێشووتر ڕاسترە چونکە کاتێك سەیری ناوەڕۆکی کتێبەکە دەکەین باس لە ڕووداوەکانی ساڵێك پێش مردنی خۆی دەکات.

سەبارەت بە ڕێبازی نووسینی لەم کتێبەدا شێوازی ساڵنامەی گرتۆتە بەر بە شێوەیەك باس لە ڕووداوی هەر ساڵێك بە جیادەکات و دواتریش لە هەندێك ساڵدا باس لەو کەسانە دەکات کە لەو ساڵەدا مردوون، وە دیاریشە ئەو ڕێبازە نزیکە لە ڕێبازی نووسینی ئیبن ئەلئەثیر (٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز) لە کتێبی (الکامل فی التاریخ)، هەر بۆیە هەندێك پێیان وایە مێژووی ئەبولفیدا کورتکراوەو تەواوکەری مێژووی ئیبن ئەلئەثیرە[4]

هەروەکو دیاریشە ئەو بەرهەمە بەیەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی مێژووی ئیسلامی دادەنرێن لەبەرئەوە هەر زوو چەندین جار بە چاپگەینراوەو وەرگێڕدراوەتە سەر چەندین زمانی جیاجیا لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسانەوە[5].

٢- مختصر للطائف السنیه فی التواریخ الاسلامیه :

ئەو بەرهەمەشیان تایبەتە بە بواری مێژوو، لە ڕاستیدا ئەو کتێبە خۆی بەرهەمی فەخرەددین عوسمانی حمصیە[6] و ئەبولفیدا هەڵساوە کورتیکردۆتەوە لە کتێبێکی بچووك و ناوی ناوە (مختصر اللطائف السنیه فی التواریخ الاسلامیه)[7].

٣- التبر المسبوك فی تواریخ اکابر الملوك:

بەرهەمێکی تر لە بواری مێژوو، لە هەندێك سەرچاوەی نوێدا ناوی بە (التبر المسبوك فی تاریخ الملوك) هاتووە[1].

---

١ حاجي خليفة: كشف الظنون عن اسامی الکتب والفنون (بیروت:١٩٩٩)، ٢/ ٥١٨، شاكر مصطفى : التاريخ العربی والمؤرخون، (بیروت:١٩٩٣) ٤/ ٤٠

٢ حاجي خليفة: كشف الظنون، ٢/ ٥٧١.

٣ هاملتون كب: دائرة المعارف الاسلامية، مادة (ابو الفداء) (القاهرة:د.ت) ١/ ٥٦٥، عبدالرحمن حميدة : اعلام الجغرافيين العرب، ص٥٣٧.

٤ فؤاد افرام البستاني: دائرة المعارف، مج٥/ ٢٨.

٥ فليب حتي: تاريخ سوريا ولبنان وفلسطين، ترجمة: كمال اليازجي، مراجعته: جبرائيل جبور، (بيروت:١٩٧٢)، ٢/ ٢٩٤.

٦ الزركلي: الاعلام، ١/ ٣١٩: دائرة المعارف الاسلامية، مادة (ابو الفداء)، ١/ ٥٦٦.

٧ حاجي خليفة: كشف الظنون، ٢/ ٥٧١.

وه ئەم کتێبە خۆی لە خۆیدا دەستنووسە لە دەزگای کتێب لە میسر هەڵگیراوە لە ژێر ناونیشانی ژمارە (٨٦) ی کتێبە مێژوویەکانە وە تەنها (٣٦) لاپەڕەیە[2] کە تێدا ئەبولفیدا ئاماژە بە هەندێك زانیاری دەکات دەربارەی پادشاکانی سەلجوقی و سوڵتانەکانی میسرو شام[3].

٤- تقويم البلدان:

ئەو کتێبەی لەبەردەستماندایە توێژینەوەی لەبارەیەوە دەکەین بە یەکێك لە بەرهەمە هەرە دیارەکانی ئەبولفیدا دادەنرێت لە بواری جوگرافیا[4].

دیارە هەر زوو ئەو کتێبە بووە جێگای سەرنج و بایەخدان لەلایەن ڕۆژئاوایەکان لەبەر ئەوە وەرگێڕدرایە سەر چەندین زمان بە تایبەتی لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسەکان[5].

٥- اليواقيت والضرب في تاريخ حلب:

بەرهەمێکی تری ئەبولفیدا لە بواری مێژوودا، وە لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات لە کاتی نووسینی ئەو کتێبە سوودی زۆر وەرگیراوە لە کتێبی (زبده الحلب في تاريخ حلب) ی ئیبن ئەلعەدیم[6] و هەروەها ئاماژە بەوە دەکات ئەو زانیاریانەی دەست ئەو کەوتوون بەدەست کەسانی تر نەکەتووەو بۆ ئەو کتێبە زیادیکردووە وە ناوی لێناوە (اليواقيت والضرب في تاريخ حلب)[7].

---

١ ابو الفداء: الكناش في فنی النحو والصرف، ١/ ٢٢

٢ احمد غسان سبانو: مملكة حماة الايوبية، ص١٩٠.

٣ محمود شاكر: التاريخ العربي والمؤرخون، ٤/ ٤١.

٤ قدري الگيلاني وكامل شحادة: المؤيد ابو الفداء ملكا وعالما، ص٢٤٨.

٥ ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ١/ ٢٦١، السخاوي: الاعلان بالتوبيخ لمن ذم التاريخ، (بيروت: ١٩٨٣)، ص١٣٦، ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ٦/ ٩٩.

٦ كراتشكوفسكي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ٣٩٤، فؤاد البستاني: دائرة المعارف، مج٥/ ٢٨، هاملتون كب: دائرة المعارف الاسلامية، مادة (ابو الفداء)، ١/ ٥٦٦.

٧ ئیبن ئەلعەدیم: کەمالەددین ئەبو لفاسم عومەری کوڕی ئەحمەد لە ساڵی (٥٨٨ك/ ١١٩٢ز) لە شاری حەلەب لە دایك بووەو لەگەڵ باوکیا زۆربەی ناوچەکانی شام گەڕاوەو چەندین پلەو پایەی بەرزی وەرگرتووە وەکو پایەی دادوەری لەسەردەمی سوڵتانەکانی ئەیوبیداو لە ساڵی (٦٦٠ك/ ١٢٦٢ز) لە میسر کۆچی دوایی کرد. القرشي: الجواهر المضيئة في طبقات الحنفية، اعتني به: محمد عبدالله الشريف، (بيروت:٢٠٠٥)، ص٢٥٠.

هەروەها زیاتر ناوەرۆکی کتێبەکە باس لەناوی حەلەب و هەروەها چۆنیەتی دروست کردنی شارەکەو دیارترین پادشکانی لە کۆندا و چۆنیەتی فەتح کردنی لەلایەن موسڵمانەکان و تاوەکو ڕووداوەکانی ساڵی (٤٠٥ك/ ١٠١٤ز) بە کورتی ئاماژەی پێکراوە.

٦- نظم الحاوی:

یەکێکی ترە لە بەرهەمەکانی و تایبەتە بە فقهی شافعی[١].

٧- الدوله الخوارزمیه:

هەندێك لەسەرچاوەکان بە یەکێك لەبەرهەمەکانی دادەنێن[٢] و لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرچاوە ڕەسەنەکان ئاماژەی پێنەکراوە.

٨- الکناش:

یەکێکی ترە لەبەرهەمە دیارەکانی ئەبولفیدا[٣] و وەکو ئینسکلوپیدیایەکەو چەند کتێبێك لە خۆ دەگرێت وەکو کتێبی (الکناش فی فنی النحو والصرف) کە هەندێك لە ژێدەرەکان باس لەوە دەکەن کە لە ساڵی (٧٢٧ك/ ١٣٢٦ز) نووسیووە[٤]، هەروەك کتێبێك دەربارەی فقهە و یەکێکی تر دەربارەی زانستی پزیشکی و چەند زانستێکی تری جیاواز[٥].

٩- الموازین:

کتێبێکی بچووکەو چەند زانستێکی جیاواز لە خۆ دەگرێت[٦].

١٠- نوادر العلم :

بەرهەمێکی تری ئەبولفیدایە[٧].

١١- کشف الوافیه فی شرح الکافیه:

---

١ ابـو الفـداء: اليوقيـت والضـرب في تـاريخ حلـب، منشـور علـى الموقـع الالكترونـي: www.almostafa.coml، ص ٢٥٠

٢العسقلاني: الدرر الكامنة، ١/ ٢١٧، عمر رضا كحالة: معجم المؤلفين، (بيروت:د.ت)، ٢/ ٢٨٣.

٣ شاكر مصطفى : التاريخ العرب والمؤرخون، ٤/ ٤٢، احمد خليل: مشاهير الكرد في التاريخ الاسلامی، (الملك المؤرخ ابو الفداء) بحث منشور على موقع الكتروني: www.Tirejafrin.com، ص٦

٤ الصفدي : الوافي بالوفيات، ٩/ ١٠٤، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ٦/ ٩٩

٥قدرى الگيلانى وكامل شحادة: المؤيد ابو الفداء ملكا وعالما، ص٢٤٥

٦ابو الفداء: الكناش في فنى النحو والصرف، ١/ ٢٧.

٧ الصفدي: الوافي بالوفيات، ٩/ ١٠٤، فؤاد افرام البستاني: دائرة المعارف، مج٥/ ٢٧.

تایبەتە بەڕێزمان کە خۆی لە ڕاستیدا ئەو بەرهەمە دەگەڕێتەوە بۆ شێخ جەمالەددین ئەبو عومەر عوسمان ناسراوە بە ئیبن حاجب، لە ساڵی (٦٤٦ك/ ١٢٤٨ز) کۆچی دوایی کردووە، ئەبولفیدا لە ساڵی (٧٢٢ك/ ١٣٢٢ز) دووبارە ڕاڤەی کردووەو قسەو باسی لەسەر کردووە[١].

١٢- کۆمەڵە وتارێك لە بارەی خوڕەوشت و هەڵسوکەوت و چەند ئامۆژگاریەك:

هەندێك ئاماژە بەوە دەکەن بەرهەمێکی تری ئەبولفیدایە، دەستنووسەو ژمارەی لاپەڕەکانی (٧٠) پەڕە لە وڵاتی مەغریب هەڵگیراوە لە ژێر ژمارە (٦٧٩٤)[٢].

لێرەدا دەکرێت بووترێت لەبەر ئەوەی کۆمەڵە وتارێکە دەربارەی خوڕەوشت و هەڵسوکەوت و چەند ئامۆژگاریەك ڕەنگە هەر بەشێك بێ لە کتێبی (الکناش).

١٣- الطريق الرشاد الى تعريف الممالك والبلاد:

هەندێك لە ژێدەرەکان بە بەرهەمێکی ئەبولفیدای دادەنێن[٣].

١٤- چەند پارچە هۆنراوەیەك:

هۆنراوەش یەکێك بووە لەو بوارانەی ئەبولفیدا زۆر مەیلی بۆ چووەو هەروەها دەستی نووسین و توانای ڕێکخستنی هەبووە[٤]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە خۆی هۆنراوەبێژ نەبووە[٥] بەڵام لەسەرچاوەکاندا بە نمونە ئاماژە بە چەندین هۆنراوە کراوە ئەبولفیدا گوتوویەتی نموونەش:

سرى مسرى الصبا فعجبت منه  من الهجران كيف حبا اليا

وكيف الم بى من غير وعد  وفارقني ولم يعطف عليا[٦]

(لەسەر ڕێڕەوی منداڵی ڕۆیشت و سەیرم بەو کۆچکردووە هات کە بۆ لامان گەڕایەوە، چۆن هەستی بە نەهامەتی ئێمە کرد بەبێ هیچ بەڵێنێك وە لێم جیابۆوە بەبێ هیچ پەرۆشیەك)

---

١ اسماعيل باشا البغدادي: هدية العارفين في اسماء المولفين واثار المصنفين، (بغداد: د.ت)، ١/ ٣١٤، الزركلي: الاعلام، ١/ ٣١٩.

٢ اسماعيل باشا البغدادي: هدية العارفين، ١/ ٢١٤، قدري الگيلانى وكامل شحادة: المؤيد ابو الفداء ملكا وعالما، ص٢٤٩.

٣ اسماعيل باشا البغدادي: هدية العارفين، ١/ ٢١٤، قدري الگيلانى وكامل شحادة: المؤيد ابو الفداء ملكا وعالما، ص٢٤٩.

٤ محمد امين زكي: مشاهير الكرد وكردستان، ١/ ٨٧، الصويركي، معجم اعلام الكرد، ص١٠٠.

٥ الكتيي: فوات الوفيات، مج١، ١٨٥، العسقلاني: الدرر الكامنة، ١/ ٢١٧، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ٦/ ٩٩.

٦ الصفدي:الوافي بالوفيات، ٩/ ١٠٦، الكتيي: فوات الوفيات والذيل عليها، مج١، ١٨٦.

هەر سەبارەت بە هۆنراوە، ئەبولفیدا هۆنراوەی پیاهەلگوتن (الموشحات)[1] یشی هەبووە و لەو جـۆرە هۆنراوەیەدا کێبڕکێ و ململانێ لەگەڵ گەورە هۆنراوە بێژانی سەردەمی خۆی کردووە[2].

یەکێك لە پارچە هۆنراوەکانی وەکو نموونە:

عسى ويا قلما تفيد عسى      ارى لنفسي من الهوى نفسا

مذبان عني قد كلفت به     قليي قد لج في تقلبه

وبي اذى شوق عاتي        ومد معي يوم شاقي

لااترك اللهو والهوى ابدا   وان اطلت الغرام والفندا[3].

(خۆزگە پێنووسەکەم مانای خۆزگـەکانی بدابایـە وە ئارەزووەکـانی نـاخم زۆر بـە کـەمی دەبینم، لەو کاتـەی ئـەوەی بەسـەرم داهـاتووە دڵـی خـۆم داوەتـێ بـەڵام ئـەو بـەردەوام لـە گۆڕانکرایدایە، ئەوەی ناخۆشی و ژانە تووشم هاتووە بە درێژایی ڕۆژگار لە دڵـم دایـە، واز لـە ڕابوردن و ئارەزووەکانم ناهێنم ئەگەر هەموو ژیانم لە ناویدا کۆتایی بێت).

---

١ هۆنراوەی پیاهەڵگوتن(الموشحات): هونەرێکی نوێیـە لـە هـۆنراوەدا جیـاوازە لـە جۆرەکـانی تـری هـۆنراوەو لـە کۆتاییەکانی سەدەی سێ یەمی کۆچی/ نۆیەمی زایینی لە ئەندەلوس بەدیارکەوت و لەلایـەن هـۆنراوە بێـژانی ئـەوێ هاتەکایەوە، ئەم جۆرە هۆنراوەیە ڕێساو بنەمای تایبەتی خۆی هەیە زۆرجار دەردەچـێت لـە کـێش و سـەرواداو زیـاتر پشت دەبەستێ بەو زمانەی کە لەناو کۆمەڵگادا باوەو وە هەروەها بەستراوەتەوەش بە گۆرانی. ابراهيم سلمان الكـروى وعبدالتواب شرف الدين: المرجع فى الحچاره العربيه الاسلاميه (الكويت:١٩٨٧)، ص٢٦١.

٢ الكتبي: فوات الوفيات والذيل عليها، مج١/ ١٨٧.

٣ الصفدي: الوافي بالوفيات، ٩/ ١٠٦، ابن تغري بردي: المنهل الصافي والمستوى بعد الوافي، ١/ ٢٦٤.

# تەوەری سێ یەم

## ڕۆڵی ئەبولفیدا لە ژیانی رامیاری

**یەکەم: چالاکیە ڕامیاری و سەربازیەکانی ئەبولفیدا لە نێوان ساڵانی (٦٨٤- ٦٩٨ك/ ١٢٨٥- ١٢٩٨ز):**

چالاکی ئەبولفیدا لەم ماوەیەدا زیاتر خۆی دەبینیەوە لەبەشداریکردن لە کردارە سەربازیەکان و ئەو شەڕو شۆڕانەی لەو ماوەیەدا ڕوویانداوە.

ئەوەتا یەکەمین چالاکی سەربازی بەشداریکردووە لە فەتح کردنی قەڵای مەرقب لە ساڵی (٦٨٤ك/ ١٢٨٥ز) لە هێزی خاچ دروشمەکان[1].

دیارە فەتح کردنی ئەو قەڵایەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی پەیوەندی لەنێوان خاچ دروسمەکان و مەغۆلەکان وە لە هەمان کاتدا زۆر جار لەم قەڵایەوە هێرش دەکرایە سەر کاروانی بازرگانی موسڵمانەکان[2].

ئەوەبوو سوڵتانی مەمالیك سەیفەددین قلاون (٦٧٨- ٦٨٩ك/ ١٢٧٩- ١٢١٩ز) بەخۆی و هێزێکی گەورە لە میسریەکان و هێزەکانی شام بە بەشداری سوپای حەما بەرەو قەڵاکە بەڕێکەوتن و بۆ ماوەی سی و هەشت ڕۆژ گەرمارۆیاندا بە کۆمەڵێك مەنجەنیقی [1] گەورەو بچووك[2].

---

١ ابن المغيزل: ذيل مفرج الكروب، ص ص ١١١- ١١٢، ابو الفداء : المختصر، ٢/ ٢٥٥.

٢ محمد سهيل طقوش: تاريخ المماليك في مصر وبلاد الشام، (القاهرة :١٩٩٩)، ص١٨٢.

وه دوای ئەوەی بۆ دانیشتوانی ناو قەڵاکە بەدیارکەوت ناتوانن بەرگری بکەن و هەروەها قەڵاکەیان تێك نەدرێ بڕیاریاندا خۆیان بەدەستەوە بدەن وە لەو کاتەشدا سوڵتان ڕازی بوو لەسەر داواکاریەکەیان و هەر لەو ساڵەدا بەبێ شەڕ توانرا ئەو قەڵایە فەتح بکرێت[3].

دەست بەسەرداگرتنی ئەو قەڵایە هەنگاوێکی گەورە بوو بۆ موسڵمانەکان بۆ ئەوەی بتوانن لە ئایندەدا گشت قەڵاو بنکەکان پاك بکەنەوە لە خاچ دروشمەکان و هەروەها لەلایەکی تر ئەو سەرکەوتنە خۆشی و شادی خستە دڵی موسڵمانەکان، چونکە توانرا یەکێك لە قەڵا هەرە سەخت و قایمەکان بگێڕنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[4].

هەر لەو سەروبەندەدا بەشداریکردووە لە یەکێك لە شەڕە هەرە گرنگەکان ئەویش فەتح کردنی شاری تەرابلس[5] بوو لە ساڵی (٦٨٨ك/ ١٢٨٩ز) هەروەکو ئەبولفیدا خۆی باس دەکات و دەڵێت : ((گەمارۆدانی تەرابلس یەکێکی ترە لەو شەڕأنەی کە خۆم بینیوومەوتێدا ئامادەبوومە لەگەڵ باوکم و مەلیك موزەفەر و ئامۆزام کە ئەو کاتە فەرمانڕەوای حەما بووە))[6].

ئەوەبوو سوڵتانی مەمالیك بەخۆی و هێزێکی گەورە لە میسرەوە بەرەو شام هات و لەوێشەوە بەرەو شاری تەرابلس بەڕێکەوت و دوای گەیشتنیان شارەکە بۆ ماوەی سێ و سێ رۆژ گەمارۆدرا بە کۆمەڵێك مەنجەنیقی گەورە[7].

---

١ مەنجەنیق: یەکێکە لەو چەکە سەربازیە گرنگ و کاریگەرانەی لەسەدەکانی ناوەڕاست بۆ مەبەستی گەمارۆدان بەکاردەهێنراو وەکو تۆپی ئێستا وابووە ئەو کات بەردی گەورەی پێ دەهاویشترا، بهاوالدین ابن شداد: النوادر السلگانیه والمحاسن الیوسفیه، هامش (٢)، ص٨٣.

٢ الدواداری: کنز الدرر و جامع الغرر (الدرة الزکیة في اخبار الدول الترکیة)، ٨/ ٢٦١، الکتیبي: عیون التواریخ، تحقیق : فیصل السامر ونبیلة عبدالمنعم، (بغداد:١٩٩١)، ٢١/ ٣٥٦، المقریزی : السلوك، ٢/ ١٨٩.

٣ الصفدي: نزهة المالك و الملوك، ص١٦٣، الذهبي: العبر في خبر من غبر، تحقیق : صلاح الدین المنجد، (الکویت:١٩٩٦)، ٥/ ٣٤٦.

٤ سعید عبدالفتاح عاشور، الحرکة الصلیبیة، ٢/ ٩٢٣.

٥ تەرابلس: یەکێکە لە شارەکانی وڵاتی شام و دەکەوێتە کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست، یاقت الحموی: معجم البلدان، ٤/ ٢٦.

٦ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٥٨.

٧ ابن خلدون: تاریخ ابن خلدون، ص١٤٦٦، محمد کرد علي: خطط الشام، ١/ ١٢٠.

وە دوای ئەوەی شەڕو کوشتارێکی زۆر ڕوویدا لەنێوان هەردوولا توانرا لـەو سـاڵەدا بەشـەڕ شارەکە فەتح بکرێت[1] و موسلمانەکان ژمارەیەکی زۆر لە دەسکەوتیان لە ئـافرەت و منـداڵ و دەسکەوتی ماددی بەدەست کەوت[2].

بە گوێرەی وتەکانی ئیبن ئەلموغیزل کە خۆی وەکو گەواهیدەرێك بەشـداربووە لـەم شـەڕەدا باس لەوە دەکات کە مەلیك موزەفەر و سەربازەکانی ڕۆڵێکـی بەرچـاویان هـەبووە لـە فـەتح کردنی شارەکەدا[3].

دوای ئەو سەرکەوتنە سوڵتانی مەمالیك بڕیاریدا شارەکە تێك بدرێت، لەبەرئەوەی بەشـەڕ دەستی بەسەرداگیربوو، وە لە دووری نیو فەرسـەخ[4]/ سـێ کیلۆمـەتر شـارێکی تـر بنیـادنراو موسڵمانەکان تێدا نیشتەجێ بوون[5].

هەر لە درێژەی کردارە سەربازیەکاندا بەشداریکردووە لە فەتح کردنی شاری عەککا[6]، دوای ئەوەی سوڵتان ئەشرەف خەلیل[7] سوڵتانی نـوێی مـەمالیك بـۆ تـەواوکردنی کارەکـانی بـاوکی پاکردنەوەی کەنارەکانی شام بوو لە خاچ دروشمەکان هێزێکـی گـەورەی ئامـادەکردو لـە سـاڵی (٦٩٠ك/ ١٢٩١ز) بەرەو شاری عەککا بەڕێکەوتن و لـە هـەمان کاتـدا داوای لـە هێزەکـانی شامیش کرد ئامادەباشی بکەن و بەرەو ئەو شارە بەڕێبکەون[8].

---

١ الذهبي: العبر في خبر من غبر، ٥/ ٣٥٧، ابن دقماق : النفعة المسكية، ص٨٢.

٢ ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٥٨، العينى: عقد الجمان، ٢/ ٣٨٠.

٣ ذيل مقرج الكروب، ص١٢٠.

٤ فەرسخ: وشەیەکی فارسیەو تەعریبکراوە لە بنچینەدا لە (فەرسەنگ) وەرگیراوە لەسەردەمە ئیسلامیەکاندا بۆ ڕووپێوکردن بەکارهاتووە، هەر فەرسەخێك (٣) میلەو دەکاتە (٦) کیلۆمەتر، فالترهانتس: المكاييل والاوزان الاسلامية و مايعادلها في النظام المتري، ترجمة : كامل العسلي، (عمان:١٩٧٠)، ص٩٤.

٥ الذهبي: دول الاسلام، ٢/ ٢١٤، المقريزى: السلوك، ٢/ ٢١١.

٦ عەککا: یەکێکە لە شارە گەورەکانی کەنارەکانی وڵاتی شام و نێوان لەگەڵ شـاری تەبەرەیـە بیسـت و چـوار میلە/ ٤٨ کیلۆمەترە، ابو الفداء: تقويم البلدان، ص٢٤٣.

٧ ئەشرەف خەلیك: صەلاحەددین خەلیل کوری مەنصور قلاون لە سـاڵی (٦٨٩ك/ ١٢٩٠ز) لـە دوای مردنـی باوکی بووە سوڵتانی میسرو شام لە ساڵی (٦٩٣ك/ ١٢٩٣ز) لەسەردەستی مەمالیکەکانی باوکی کوژرا دوای ئەوەی بۆ ماوەی سێ ساڵ حوکمی کرد. ابن دقماق : الجوهر الثمين في سير الملوك والسلاطين، ص٣٢٧.

٨ ابو الفداء: المختصر، ٢/ ٣٥٩، ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ص١٤٦٨.

لێرەدا ئەبولفیدا بەڕوونی باس لە چۆنیەتی بەشداریکردنی خۆی دەکات لەو شەڕەداو دەڵێت: ((لە کاتی چوونمان بۆ ئەو شەڕە، گالیسکەیەکیان پێدام، لەبەرئەوە ئەو کات فەرماندەی دە جەنگاوەر بووم... وە لە ڕێگادا تووشی چەندین ناخۆشی و مەینەتی بووینەوە. لەبەرئەوە کۆتاییەکانی وەرزی زستان بوو باران و بەفرێکی زۆر بەسەرماندا باری و ئەوەشیان تەگەرەی دەخستە بەردەم ڕۆیشتنمان))[1]، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو ماندووبوون و ناخۆشیە هێزەکان توانیان بگەنە شاری عەککاو بۆ ماوەی چل و چوار ڕۆژ شارەکە گەمارۆدرا بە نزیکەی نەوەدو دوو مەنجەنیق[2]، دواتر توانرا لە مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی (٦٩٠ك/ شوباتی ١٢٩١ز) بەشەڕ دەست بەسەر شارەکە دابگیرێت[3]، وە دواتر سوڵتان بڕیاریدا شارەکە تێك بدرێت نەوەك دووبارە دوژمنان سوودی لێوەربگرن چونکە یەکێك بوو لەو شارانەی کەوا قەڵایەکی هەرە سەختی تێدابوو کاتێك دەست بەسەر داگرتنی بەردەوام زۆر ئاستەم بوو[4].

بەم شێوەیە بەدەست بەسەرداگرتنی ئەو شارە توانرا دوا پێگەی خاچ دروشمەکان پاك بکرێتەوە لە ناوچەکانی کەناری شام[5].

دوای پاکردنەوەی کەنارەکانی شام لە خاچ دروشمەکان دووبارە سوڵتان ئەشرەف خەلیل کەوتەخۆ بۆ فەتح کردنی قەڵای ڕۆم[6]، ئەوەبوو بەخۆی و سوپایەکەوە هاتە دیمەشق و لەوێشەوە بەخۆی و هێزەکانی شام بەرەو ئەو قەڵایە بەڕێکەوتن، لێرەدا ئەبولفیدا خۆی ئاماژە بەوە دەکات ((کە ئەوەشیان یەکێك بوو لەو گەمارۆدانانەی کە خۆم تێدا بەشداربوومە))[7].

---

١ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٥٩.

٢ المقريزي: السلوك، ٢/ ٢٢٤.

٣ الخزنداري: تاريخ مجموع النوادر مما جرى والاواخر، تحقيق : عمر عبدالسلام تدمري،(بيروت:٢٠٠٥) ص، ٣٢٦، الذهبي: دول الاسلام، ٢/ ٢١٣.

٤ ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ص١٤٦٨، محمد سهيل طقوش: تاريخ المماليك، ص٢٠٧.

٥ فايد حماد عاشور: الجهاد الاسلامى ضد الصلبيين والمغول، ص٢٠٠٣.

٦ قەڵای ڕۆم: یەکێکە لە قەڵایە قایم و سەختەکان دەکەوێتە ڕۆژئاوای رووباری فورات بەرامبەر شاری بیرە. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٣٩٠.

٧ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٦٢.

دوای ئەوەی بۆماوەی سی و سێ ڕۆژ قەڵاکە گەمارۆ درا[1] توانرا لە مانگی ڕەجەبی ساڵی (٦٩١ك/ تەموزی ١٢٩١ز) بەشەڕ قەڵاکە فەتح بکرێت[2].

بەهەمان شێوە بە پێی ئاماژەکردنەکانی کاتی خۆی بەژداریکردووە لەو هەڵمەتانەی لە ساڵی (٦٩٧ك/١٢٩٧ز) کراوەتە سەر ناوچەکانی سیس و بەو شێوەیە باس دەکات ((ئەو شەڕەش یەکێك بووە لەو شەڕانەی کە خۆم تێدا بەشداربوومە لەسەرەتاکانی تاوەکو کۆتایی))[3].

جێگای ئاماژەپێکردنە، لەم ماوەیەدا ڕووداوێك هاتە ئارا ئەویش مردنی مەلیك موزەفەر مەحمودی فەرمانڕەوایی شاری حەما بوو لە ساڵی (٦٩٨ك/ ١٢٩٨ز) ئەوەش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر دوارۆژی دەسەڵاتی ئەیوبیەکان لە شارەکەدا بە جۆرێك دوای مردنی مەلیك موزەفەر مەحمود ئەبولفیدا و براکانی و گەورەکانی شاری حەما کۆبوونەوە بۆ دەستنیشانکردنی کەسێك وەکو فەرمانڕەوا لە شوێنی، بەڵام ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت لە ئەنجامی ململانێ لە نێوانیان لەسەر وەرگرتنی دەسەڵات نەگەیشتنە هیچ دەرئەنجامێك و کاتێك ئەو هەواڵە گەیشتە سوڵتانی مەمالیك لە میسر بڕیاریدا بە دانانی قرانسنقر[4]، وەکو جێگری خۆی لەو شارەدا و لەو ساڵەدا شاری حەما دەرچوو لە ژێر مالباتی ئەیوبیەکان[5].

لێرەدا دەکرێت ئاماژە بە چەند هۆکارێك بکرێت کە بوونە هۆی دەرچوونی شاری حەما لەژێر دەسەڵاتیماڵباتی ئەیوبیەکان، ئەوە یەکەمیان مردنی مەلیك موزەفەر مەحمود بوو کاتێك هیچ منداڵی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشت بۆ ئەوەی لە دوای خۆی ببێتە جێگرەوەی، هەروەها ململانێ ی ئەبولفیدا و براکانی هۆکارێکی تر بووە هەرچەندە ئەبولفیدا لە مێژووەکەی خۆیدا ئاماژە بەو ململانێیە دەکات، بەڵام ئاماژە بە هۆکارەکانی ناکات بەڵام دیارو بەرچاوە زیاتر لەسەر بەدەست هێنانی دەسەڵات بووە، هەروەها لەو ماوەیەدا وڵاتی میسر بە بارودۆخێکی ناهەموار تێدەپەڕی بەشێوەیەك هەر زوو سوڵتانێك دادەنراو یەکێکی تر

---

١ الذهبي: دول الاسلام، ٢/ ٢١٦.

٢ ابو الفداء: المختصر، ٢/ ٣٦٢، المقريزي: السلوك، ٢/ ٢٣٤.

٣ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٧٢.

٤ قراسنقر: شەمسەددین جوکنداری مەنصوری، لە ماوەی ژیانیدا پۆستی فەرمانڕەوایەتی دیمەشق و حەمای پێ سپێردراوە لەسەردەمی سوڵتان محەمەدی کوڕی قلاون، الصفدي : امراء دمشق في الاسلام، تحقيق : صلاح الدين المنجد، (دمشق: ١٩٥٥)، ص٦٨.

٥ ابو الفداء : المختصر، ٢/ ٣٨٠، فؤاد افرام البستاني: دائرة المعارف، مج٥/ ٢٧.

لادەدرا بەشێوەیەك بارودۆخێكی شڵەژاوی هێنابووە كایەوەو هەر لەو كاتــەدا ســوڵتان محەمــەد كوڕی مەنصور قلاون تازە گەڕابووەوە دەسەڵات و بۆ ڕازیكردنی هەندێك لە مەمالیكــەكانی و هەروەها دوورخستنەوەی مەترسی هەندێكیان لەسەری هەندێك گۆڕانكاری لــە دەســەڵاتەكاندا كرد، لەوانە دانانی قرانسقر بوو وەكو جێگری خۆی لە شاری حەما.

**دووەم/ چالاكیە ڕامیاری و سەربازیەكانی ئەبولفیــدا لــەنێوان ســاڵانی (٦٩٨- ٧١٠ك/ ١٢٩٨- ١٣١٠ز):**

دوای دەرچوونی شاری حــەما لــەژێر ماڵبــاتی ئەیوبیــەكان، وا پێویســتی دەكــرد لەســەر كەسایەتی ئەبولفیدا زیاتر هەوڵ و كۆششەكانی بخاتە گەڕ بۆ ئەوەی بتوانی متمانەی سوڵتان بۆ خۆی مسۆگەر بكات و ئەو شارە بگێڕنەوە ژێر فەرمانڕەوای ماڵباتی خۆیــان، هــەر بۆیــە لــەم قۆناغەدا بەگڕوتینێكی زۆرتر هاتۆتە مەیدان و بەشداریكردووە لەو چالاكیە ســەربازیانەی لــەو ماوەیەدا ڕوویانداوە.

ئەوەتا لە ساڵی (٧٠١ك/ ١٣٠١ز) بەشداریكردووە لــەو هەڵمەتانــەی كــە كراوەتــە ســەر ناوچەكانی سیس وە لەو كاتەدا زەینەددین كەتبغا[١] جێگری سوڵتان بووە لە شاری حەما، دوای ئەوەی توانیان چەند سەركەوتنێك لەوێدا بەدەست بهێــنن و بەدەســكەوتێكی زۆرەوە گەڕانــەوە شاری حەما[٢].

هــەروەها لــە ســاڵی (٧٠٢ك/ ١٣٠٢ز) دووبــارە بەشــداریكردووە لــە ڕووبەڕووبوونــەوەی مەغۆلەكان لەو كاتەی ڕوویان لە ناوچەكانی شام كردبوو[٣].

وە لەلایەكی تر هەر لەو ســاڵەدا واتــە (٧٠٢ك/ ١٣٠٢ز) هەوڵــەكانی خســتۆتە گــەڕ بــۆ گێرانەوەی شاری حەما بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەتایبــەتی دوای مردنــی زەینــەددین كــەتبخا هەروەكو خۆی باس دەكات و دەڵێت : ((لە دوای مردنی زەینەددین كتبغا نامەیكم ڕەوانەكرد

---

١ زەینەددین كەتبغا: كوڕی عەبدوڵلای مەنصوری لــە ســاڵی (٦٣٩ك/ ١٢٤١ز) لــەدایك بــووە و لــە ســاڵی (٦٩٤ك/ ١٢٩٤ز) بەهێز خۆی كردە سوڵتانی میسرو شام، دواتر لادراو ڕووی لە شاری صەرخەد كرد تــاوەكو ساڵی (٦٩٩ك/ ١٢٩٩ز) كاتێك محەمەدی كوڕی مەنصور قلاون كردی بە جێگری خۆی لە شاری حــەما وە لــە ساڵی (٧٠٢ك/ ١٣٠٢ز)كۆچی دوایی كردو تەرمەكەی ڕەوانەی شاری دیمەشق كرا. الزركلي: الاعلام، ٥/ ٥.

٢ ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٨٦.

٣ المصدر نفسه، ٢/ ٣٧٨- ٣٨٩، اليافعي: مراة الجنان، ٤/ ١١٦- ١١٧.

بۆ سوڵتان بۆ ئەوەی بمکاتە فەرمانڕەوا لە شاری حەما وەکو ئەنـدامانی تـری بنەماڵەکـەم))[١]، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت کات بەسەرچووبوو، چونکە بڕیاریـدا بـوو بـە دانـانی سـەیفەدین قبجق وەکو جێگری خۆی لەو شارەدا، وە لەهـەمان کاتـدا بـەڵێنی بـە ئەبولفیـدا دا کـە لـە داهاتوودا بیکاتە جێگری خۆی لەو شارەدا[٢].

شایەنی باسە بارودۆخ لەو ماوەیەدا ئاسایی بوو تاوەکو سـاڵی (٧٠٨ك/ ١٣٠٨ز) کاتێـك دوای ئەو ساڵە گۆڕانکاری بەسەرداهات لەو کاتەی سوڵتان محەمـەدی کـوڕی مەنصـور قـلاون سەردانی مەککەی پیرۆزی کردو لە کاتی گەڕانەوەیدا بڕیاریدا لە شاری کەرك[٣] نیشتەجێ بێت هۆکارەکەشی زیاتر لەبەرئەوە بـوو زۆربـەی دەسـەڵاتەکانی لێ زەوت کرابـوو لەلایـەن بیـبرس جاشنکیر[٤]، تەنیا وەکو سوڵتان ناوی مابوو[٥].

ئەوەبوو لە ساڵی (٧٠٨ك/ ١٣٠٨ز) بیبرس جاشنکیر خۆیکردە سوڵتانی میسـرو نازنـاوی (مەلیك ئەلموزەفەر) ی لەخۆی ناو لە هەمان کاتیشدا نامەیـەکی ئاراسـتەی محەمـەدی کـوڕی قلاون کردوو تێدا بڕیاریدا کە لە شاری کەرك بمێنێ وەکو فەرمانڕەوا[٦].

دوای ئەو گۆڕانکاریە نائاساییە ژمارەیەکی زۆر لە ئەمیرەکانی میسر هاتنـە لای سـوڵتان محەمەدی کوڕی قلاون و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ نیشانداو لە هەمان کاتدا ژمارەیـەکی زۆر لە ئەمیرەکانی شامیش بە هەمان شێوە دڵسۆزی و گوێرایەڵیان بـۆ نیشـاندا و پـاش ئـەو

---

١ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٨٩.

٢ ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٢٨٩، احمد غسان سبانو: مملكة حماة الايوبية، ص١٠٦.

٣ کەرەك: قەڵایەکی پتەوی دەوروبەری شام بوو لە لایەنەکانی بەلق لە چیاکاندا لەنێوان ئیلەو دەریـای قـەلزەم (سور) و بەیتولمەقدس لە وڵاتی ئوردن. یاقوت الحموی: المعجم البلدان، ٤/ ٤٥٣.

٤ بیبیرس جاشنکیر: کوڕی عەبدوڵلای مەنصوری یەکێك بوو لە مەمالیکەکانی سوڵتان مەنصور قلاون دواتـر پایەی بەرزبووەوە تاوەکو بووە یەکێك لە ڕاوێژکارو هەڵسوڕێنەری کارەکانی سوڵتان محەمـەدی کـوڕی مەنصـور قلاون و لە ساڵی (٧٠٨ك/ ١٣٠٨ز) دەستی بەسەر دەسەڵاتداگرتوو خۆی کرد بە سـوڵتان و دواتـریش دەسـت بەسەرکرا دوای ئەوەی بۆماوەی یازدە مانگ حوکمی کرد. ابن الخطيب: اعمال الاعلام فيمن بويع قبل الاحتلام من ملوك الاسلام ومايتعلق بذلك من اللكلام، تحقيق: سـيد كسـروي حسـن، (بـيروت:٢٠٠٣)، ١/ ٢٩٥، ابـن دقماق : النفعة المسكية، ص ص ١١٢- ١١٥.

٥ ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٥٩.

٦ مؤلف المجهول: تاريخ الملك الاشرف قايتباى، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، (بيروت: ٢٠٠٣)، ص٦٥.

هەموو پاڵپشتیە سوڵتان ڕووی کردە دیمەشق و لەوێشەوە زۆر لە فەرمانڕەواکانی شام بە خۆیان و سوپاکانیان هاتنە خزمەتی و هەروەها ئەبولفیداش لەو کاتەدا یەکێك لە خزمەتکارەکانی خۆی دایە سوڵتان و ئەویش لەبەرامبەردا بەڵێنی بەخشینی شاری حەمای پێدا هەروەکو ئەندامانی تری بنەماڵەکەی[١].

ئەوەبوو دوای ئەو هەموو پاڵپشتیە لەلایەن سەردارو فەرمانڕەواکانی شام سوڵتان محەمەد بەخۆی و سوپایەکی گەورە ڕووی لە میسر کرد وە کاتێك بیبرس جاشنکیر بەو هەواڵەی زانی دەستی لە کار کێشایەوەو لە دواتردا داوای لێخۆشبوونی لە سوڵتان کرد[٢].

ئەوەبوو لە ساڵی (٧٠٩ك/ ١٣٠٩ز) دووبارە سوڵتان محەمەدی کوڕی قلاون گەڕایەوە دەسەڵات لە میسر[٣]، وە لەو کاتەشدا بارودۆخ لە باربوو بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵاتداریەتی شاری حەما، بەڵام دووبارە ململانێ ئەبولفیدا لەگەڵ بەدرەددین حەسەنی برای لەسەر دەسەڵات بووە کۆسپ لەبەردەمیان نەتوانن دەسەڵاتی ئەو شارە بگێڕنەوە بۆ ژێر ماڵباتی ئەیوبییەکان[٤].

هەر بۆیە لەو ماوەیەدا سوڵتان محەمەد بۆ ڕازیکردنی هەندێك لە خزمەتکارەکانی دووبارە هەندێك گۆڕانکاری کرد، ئەوەبوو لە مانگی ذولحجەی ساڵی ساڵی (٧٠٩ك/ کانونی یەکەمی ١٣٠٩ز) ئەسندمری کردە جێگری خۆی لە شاری حەما[٥]، ئەوەبوو دوای ئەو گۆڕانکاریە ئەبولفیدا بڕیاریدا بچێ لە دیمەشق نیشتەجێ بێت و سوڵتانیش لەگەڵ ئەو بیرۆکەیەدا بوو، بەڵام لە هەمان کاتدا سوور بوو لەسەر بەجێهێنانی ئەو بەڵێنەی بە ئەبولفیدا دابوو[٦]، وە ئەوەی لێرەدا ڕێگا خۆشکەر بوو بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە مردنی حاجی بەهادر بوو کە ئەو کاتە جێگری سوڵتان بوو لە ناوچەکانی کەناری شام، ئەوەبوو سوڵتان بڕیاریدا بە پێدانی ناوچەکانی کەناری شام بە ئەسندمر و شاری حەماش بدات بە ئەبولفیدا، بەڵام لێرەدا ئەسندمر ڕازی نەبوو بەو داواکاریە[٧].

---

١ ابو الفداء : المختصر في اخبارالبشر، ٢/ ٣٩٧- ٣٩٩.

٢ ابو الفداء : المختصر في اخبارالبشر،٢/ ٣٩٩.

٣ الصفدي: نزهة المالك والملوك، ص١٩٥، مؤلف المجهول: تاريخ الملك الاشرف قايتباى، ص٦٦.

٤ ابو الفداء : المختصر٢/ ٤٠٠، احمد غسان سبانو: مملكة حماة الايوبية، ص١٠٩.

٥ ابن الوردي: تاريخ ابن الوردي، ٢/ ٢٥١.

٦ ابو الفداء : المختصر في اخبارالبشر،٢/ ٤٠١.

٧ المصدر نفسه، ٢/ ٤٠٢.

دیارە لەو ماوەیەدا پێشهاتێکی تر هاتە ئارا ئەویش مردنی سەیفەددین فیجق بوو کە ئـەو کات جێگری سوڵتان بوو لە شاری حەلەب و دوای هاتنی ئەو هەواڵە بۆ میسر دووبارە سوڵتان محەمەد بڕیاریدا هەندێك گۆڕانکاری بکات بەشێوەیەك شـاری حەلـەب بـدات بـە ئەسـندمر و هەروەها حەماش بدات بە ئەبولفیدا[1].

ئەوەبوو ئەو جارەیان ئەسندمر ڕازی بوو، چونکە شاری حەلەب خێرو بێری زیـاتر بـوو لـە ناوچەکانی کە کەناری شام وە هەروەها لە (٢٣) ی جەمادی دوای ساڵی (٧١٠ك/ ١٦ کانونی دووەمی ١٣١٠ز) ئەبولفیدا گەڕایەوە شاری حەماو دەسەڵاتداریەتی شارەکەی پێدرا لە شێوەی جێگیری سوڵتان[2].

بەو شێوەیە دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆری ئەبولفیدا دووبارە شاری حـەما گـەڕاەیوە ژێـر ماڵباتی ئەیوبیەکان.

**سێیەم/ چالاکیە ڕامیاری و سەربازیەکانی ئەبولفیدا دوای وەرگرتنی فەرمانڕەوایەتی شاری حەما (٧١٠- ٧٣٢ك/ ١٣١٠- ١٣٣١ز):**

دوای گێڕانەوەی شاری حەما بۆ ژێر فەرمانڕەوایەتی ماڵبـاتی ئەیوبیـەکان، ئەبولفیـدا لـە گروتێنێکی زۆرترەوە بەشداریکردووە لە زۆربەی چالاکیە ڕامیـاری و سـەربازیەکانی نـاوەخۆ و دەرەکیەکان و ڕوبەڕووبوونەوەی ئەو هێزانە ڕوویان لە ناوچەکانی شام دەکرد.

لەو ماوەیەدا بەخۆی و هێزەکانی لە خزمەتی سوڵتانی مەمالیکدابووە بـە جۆرێـك سـاڵی (٧١٠ك/ ١٣١٠ز) بەشداریکردووە لە دەستگیرکردنی ئەسندمری جێگـری سـوڵتان لـە شـاری حەلەب دوای ئەوەی یاخی ببوو لە سوڵتان وە پاش دەستگیرکردنی بە قۆڵبەستراوی ڕەوانەی لای سوڵتان کرا لە شاری کەرك[3].

هەروەها لە ساڵی (٧١٢ك/ ١٣١٢ز) هەواڵی ئەوە هات مەغۆلەکان ڕوویان لە ناوچـەکانی شام کردووە لەبەر ئەوە سوڵتان محەمەد داوای لەسەرجەم جێگرەکانی کرد لەناوچەکانی شام بـۆ

١ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٩/ ٢٣، الحنبلي: شفاء القلوب، ص٤٥٩.

٢ ابو الفداء : المختصر ٤٠٢/٢، المقريزي: السلوك، ٤٥٨/٢.

٣ ابو الفداء : المختصر في اخبارالبشر،٤١٠/٢- ٤١١.

ئەوەی ئامادەباشی بکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان[1]، لێرەدا ئەبولفیدا بەخۆی و هێزەکانی ڕوویان لە شاری حەلەب کردو دواتریش لەگەڵ هێزەکانی تری شام هاتنەوەی شاری حەما[2].

وە لەو کاتەدا مەغۆلەکان گەمارۆی شاری رحبە[3] یان دابوو بە کۆمەڵێك مەنجەنیق و هێزەوە بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ شەڕ بەردەوام بوو، بەلاّم خەڵکی شارەکە سووربوون لەسەر بەرگریکردن و شارەکەیان نەدا بەدەستەوە[4].

دوای ئەوەی برسیەتی و نەخۆشی لەناو هێزەکانی مەغۆل بلاّوبوەوە گەمارۆی سەر شارەکەیان شکاندو بەبێ هیچ دەسکەوتێك گەڕانەوە و زۆربەی چەکەکانی خۆشیان لە مەیدانەکانی شەڕ دا بەجێ هێشت[5].

هەروەها لە ساڵی (٧١٥ك/ ١٣١٥ز) بەشداریکردووە لە فەتح کردنی شاری مەڵەتیە[6]. زیاتر هۆکاری فەتح کردنی ئەو شارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا پەیوەندی هەبووە لەنێوان کرستیانەکانی ئەو شارەو مەغۆلەکان و هەروەها زۆرجار هێرش دەکرایە سەر سوپای موسڵمانەکان ئەوانەی دەردەچوون بۆ شەڕکردنی هەندێك ناوچی نزیکی ئەو شارە[7]، هەر بۆیە سوڵتان محەمەد سوپایەکی گەورەی لە میسرەوە ڕەوانەکرد بۆ فەتح کردنی شارەکەو لێرەدا ئەبولفیدا باس لەوە دەکات ((لەسەرەتادا سوڵتان داوای کرد هێزەکانم ئامادە بکەم و خۆم لە شاری حەمادا بمێنم، بەلاّم بیرم لەوە کردەوە بەرژەوەندی لەوەدایە کە خۆم بەشداربم تێدا...))[8].

---

١ ابن دقماق : النفعة المسكية، ص١٢٢، المقريزي: السلوك، ٢/ ٤٨٢.

٢ ابو الفداء : المختصر ٤١٣/٢.

٣ رحبە، یەکێکە لە شارۆچکەکانی هەرێمی جەزیرەو دەکەوێە کەنارەکانی ڕووباری فورات لە خوارووی ئەرمینیاو بەیەکێك لەناوچە سنوریەکان (الثغور) دادەنرێت، یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٣/ ٣٤.

٤ الذهبي: دول الاسلام، ٢/ ٢٤٦، فايد حماد عاشور: العلاقات السياسية بين المماليك والغول، ص١٨٢.

٥ ابو الفداء : المختصر ٢/ ٤١٣.

٦ مەلەتیە: شارێکی بەناوبانگە دەکەوێە ولاّتی ڕۆم و هاوسنورە لەگەڵ ناوچەکانی شام. ياقوت الحموی: معجم البلدان، ٥/ ١٩٢.

٧ ابو الفداء : المختصر في اخبارالبشر،٢/ ٤١٨.

٨ لەبارەی چۆنیەتی چوونی بۆ شاری مەلەتیە بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ٢/ ٤١٩.

ئەوەی لێرەدا شیاوی باسکردن بێت شارەکە تەسلیم کرا بەبێ شەڕ لەلایەن دەسەڵاتدارانی شارەکە[1] بەڵام ئەوەی لێرەدا بووە جێگای نیگەرانی ئەبولفیدا خۆی باس لەوە دەکات ((شارەکە تووشی تاڵانکردن هات لەلایەن سوپاوە دوای سوپاکە دەرچوو لە ژێر کۆنترۆڵی سەرکردەکانیان و کەوتنە تاڵانکردنی شارەکە بە هەموو شێوەیەك..))[2].

لەلایەکی تر لە ساڵی (٧٢٠ك/ ١٣٢٠ز) لە مێژووەکەی خۆیدا باس لەوە دەکات کە هێزەکانی حەما بەشداریان کردووە لە هێرشکردنە سەر وڵاتی سیس بەڵام وەکو شەڕەکانی تر ئاماژە بەوە ناکات کە خۆی تێدا بەژدار بووە یاخود نا[3].

وە هەروەها لە ساڵی (٧٢٢ك/ ١٣٢٢ز) هێزەکانی حەما بەشداریان لە فەتح کردنی شاری ئەیاس[4] کردووە دوای ئەوەی هێزێکی گەورە لە میسرەوە هات و هێزەکانی شامیش چوونە پاڵی و هێرشیان کردە سەر شاری ئەیاس لەناوچەی ئەرمەنەکان توانیان بەشەڕ دەستی بەسەردا بگرن[5].

لێرەشدا سوپای شاری حەما بەشداریکردووە لەم شەڕەدا بەڵام وەکو شەڕەکانی تر ئەبولفیدا ئاماژە بەوە ناکات کە خۆی تێدا بەژداریکردبێت.

سەرەڕای کردارە سەربازیەکانیش، هەرچەندە لەسەرچاوەکاندا باس لە پەیوەندی نەکراوە بە فەرمانڕەوایەکانی تری شام، بەڵام دەکرێت باس لەوە بکرێت کە پەیوەندیەکی توندو تۆڵی هەبووە لەگەڵ فەرمانڕەوایەکانی تری شام ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە خودی ئەبولفیدا کەسێکی خوڕەوشت بەرزبووەوەو بەشێوەیەك لەلایەن هەموو کەسێکەوە ڕێزی لێگیراوەو تەنانەت لەلای سوڵتانی مەمالیکیش پایەیەکی تایبەتی هەبووە[6].

---

١ ابن دقماق: النفحة المسكية، ص١٢٣.

٢ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٤١٩.

٣ المصدر نفسه، ٢/ ٤٣٤- ٤٣٥.

٤ ئەیاس: یەکێکە لە شارە گەورەکانی وڵاتی ئەرمەن و دەکەوێتە کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست و تێدا بەندەرێکی گەورەی تێدا هەبووە وە هەروەها ناوچەیەکی باش بووە بۆ چالاکی بازرگانی ئاویی و وشکانی، ابو الفداء: تقويم البلدان،ص٢٤٩.

٥ ابو الفداء : المختصر، ٢/ ٤٣٨، المقريزي: السلوك، ٣/ ٥٤.

٦ ارسن موسى و اسماعيل شكر: الملك المؤيد ابو الفداء، ص٣٢.

هەربۆە لەم قۆناغەشدا دەکرێت باس لەوە بکرێت کە بەشداربووە لە زۆربەی چالاکیە سەربازیەکان و هەروەها پەیوەندیەکی توندو تۆڵی هەبووە لەگەڵ جێگرو فەرمانڕەوایەکانی تری هاوشانی لە ناوچەکانی شامدا.

**چوارەم/ پەیوەندی بە سوڵتانی میسر:**

سەبارەت بە پەیوەندی ئەبولفیدا بە سوڵتانەکانی میسر، دەکرێت ئاماژە بەوە بکرێت بەردەوام هەوڵیداوە پەیوەندیەکی توندو تۆڵی لەگەڵیاندا هەبێت و پەیڕەوکردنی ئەو ڕێچکەیەش لە سیاسەتیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەندامانی تری پێش خۆی لە خێزانەکەی کە گرنگ نەبووە بەلایانەوە کێ سوڵتانی میسر بێ بەڵکو بەلایانەوە ئەوە گرنگ بووە چۆن پارێزگاری لە مانەوەی دەسەڵاتی خۆیان دەکەن[١].

لەبەر ڕۆشنایی ئەو سیاسەتە یەکەمین پەیوەندی ڕاستەوخۆی ئەبولفیدا بە سوڵتانەکانی میسر دەگەڕێتەوە بۆساڵی (٧٠٩ك/ ١٣٠٩ز) لەو کاتەی سوڵتان لە شاری کەرەك بوو ئەبولفیدا لەگەڵیا بوو وە زۆر خزمەتیکردو ئەویش لەبەرامبەردا بەڵێنی پێدانی شاری حەمای پێدا وەکو ئەندامانی تری بنەماڵەکەی[٢] هەروەها لە دوای ئەوەی بووە جێگری سوڵتان لە شاری حەما شەش جار سەردانی میسری کردووەو زۆربەی سەردانەکانیشی فەرمی بوون یان لەلایەن سوڵتانەوە بانگهێش کراوە یاخود بۆ مەبەستێکی گرنگ چووە[٣]، دیارە لە زۆربەی سەردانەکانی بۆ میسر چەندین دیاری بە نرخ و گرانبەهای لەگەڵ خۆیا دەبرد بۆ سوڵتانی میسر و ئەویش لەبەرامبەردا زیاتر پایەی بەرزدەکردەوە[٤] بەجۆرێك لە ساڵی (٧١٢ك/ ١٣١٢ز) لەو کاتەی سەردانی میسری کرد سوڵتان پێشوازیەکی گەرمی لێکردوو ڕێزێکی زۆری لێناو لە دوای گەڕانەوەی دەستورێکی پێدا کە تێدا دەسەڵاتی فراوانتر کرا بەشێوەیەك ناوچەکانی دەوروبەری حەماش خرایە ژێر دەسەڵاتیەوە[٥].

---

١ السيد الباز العريني: المماليك، (القاهرة: ١٩٦٧) ص٤٩.

٢ ابو الفداء : المختصر في اخبارالبشر،٢/ ٣٩٨

٣ نقولا زيادة: مذكرات ابي الفداء، بحث منشور في كتاب (المؤرخ الجغرافي ابو الفداء صاحب حماة)، ص١٥٦.

٤ الكتبي: فوات الوفيات والذيل عليها، مج١/ ١٨٤، ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ١/ ٢٦٠.

٥ ابو الفداء: المختصر، ٢/ ٤١٢.

لەلایەکی تر زۆرجار لە کاتی سەردانەکانی بە دەسکەوتی زۆر دەگەڕایەوە شاری حەما، ئەوەتا لە ساڵی (٧١٦ك/ ١٣١٦ز) لەو کاتەی سەردانی میسری کرد شاری مەعرە[١] دەرچوو بوو لەژێر دەسەڵاتیەوە بەڵام لە ئەنجامی ئەو سەردانەدا بەپێی بڕیارێکی سوڵتان دووبارە گێڕدرایەوە ژێرفەرمانڕەوایەتی ئەبولفیداوە[٢].

دیارە ئەوەی زیاتر پەیوەندی ئەبولفیدا بە سوڵتان محەمەدی کوڕی مەنصور قلاون پتەوتر کرد لەو کاتەدا بوو کە لە ساڵی (٧١٩ك/ ١٣١٩ز) لەگەڵیا سەردانی مەککەی پیرۆزیان کرد بە مەبەستی بەجێهێنانی حەجی ماڵی خواو لە کاتی گەڕانەوەیان سوڵتان زۆر سەرسام بوو بە کەسایەتی و خوڕەوشتی ئەبولفیداو ناوناوی (مەلیك ئەلموئەیەد)ی پێداو دەسەڵاتی فراوانتر کرد بە جورێك لە وتاری هەینیدا ناوی بهێنرێت و بەپێش هەموو فەرمانڕەواکانی شامی خست[٣]، هەروەها لەلای سوڵتان محەمەد پایەی زۆر بەرزکردەوە بە جورێك لەو کاتانەی نامەی بۆ دەنووسی و دەیگوت: ((لە براتەوە محەمەدی کوڕی قلاون خوای گەورە لایەنگرانی پایەی بەرزی سوڵتانی پاڵپشتیکراو بەرز ڕابگرێ))[٤].

سەرەڕای بوونی ئەو پەیوەندیە پتەوە لەگەڵ سوڵتاندا، هەوڵیداوە بوونی ئەو جۆرە پەیوەندیە بۆ کوڕەکەشی زامن بکات بە جۆرێك لەو کاتانەی سەردانی میسری کردووە کوڕەکەشی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بە سوڵتانی بناسێنێ و دوارۆژی پەیوەندیەکانی لەگەڵ سوڵتاندا پەرەپێ بدات[٥].

بەو شێوەیە ئەبولفیدای ئەیوبی تادوا ساتەکانی ژیانی هەوڵیداوە پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ سوڵتانەکانی میسردا هەبێ بەتایبەتی سوڵتان محەمەدی کوڕی قلاون، لەبەرئەوە هاوسەردەم بوونەو دڵسۆزو گوێڕایەڵی بووە بۆهەموو بڕیارو داواکاریەك.

---

١ مەعرە: شارێکە دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری حەلەب و حەما لە وڵاتی شامدا. القزويني : اثار البلاد واخبار العباد، (بيروت:د.ت)، ص٢٧٢.

٢ ابو الفداء: المختصر، ٢/ ٤٢٤، ابن دقماق : النفعة المسكية، ص١٢٤.

٣ النويري: مختصر كتاب نهاية الارب في فنون الادب، اختصار وتقديم: مرزوق علي ابراهيم، (القاهرة:٢٠٠٧)، ٣/ ٢٠١، الصفدي: الوافي بالوفيات، ٩/ ١٤٠ابن كثير : البداية والنهاية، ١٤/ ٩٠.

٤ ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٢٩٣/٩ ،وينظر ايضا كتابة:المنهل الصافي، ٢٦٠/١.

٥ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٤٤٥.

# تەوەرەی یەکەم

## کتێبی (تقویم البلدان)

### یەکەم / ناونیشانی کتێبەکە:

هەروەکو ڕوون و ئاشکرایە لە کۆنەوە تاکو ئێستا لە کاتی نووسینی بابەتێك یاخود کتێبێك لە هەر بوارێکەوە بێت بە چەند قۆناغێکدا دەڕوات. سەرەتایی ئەو قۆناغەش دیاریکردنی ناونیشانێکە بۆ کتێبەکەی کە دەبێت وەکو پێویست لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا بگونجێت.

دیارە ئەو ناونیشان و بابەتەی دیاریدەکرێت پێویستە ئامانجداربێت، بە جۆرێك چارەسەری بوارێك یاخود لایەنێك بکات کە سەرچاوەکانی پێش خۆی درکیان پێنەکردووە یاخود نەپڕژاونەتە سەری[1]، واتە مەبەستمان لە ڕێگای ئەو بابەتانەوە بتوانرێت ئەم کەم و کوڕیانەو هەروەها ئەو ناڕوونیانەی کە هەبووە زیاتر کاریان لەسەر بکرێت و زانیاری پێویست لە بارەیانەوە بخرێتەڕوو.

لەبەر ڕۆشنایی ئەمانەدا دەکرێت باس لەوە بکرێت ئەبولفیدای ئەیوبی یەکێکە لەو کەسایەتیانەی لە زۆرێك لە نووسین و کتێبەکانیدا ئاماژە بە چۆنیەتی هەڵبژاردنی ناونیشان بۆ کتێبەکەی دەکات کاتێك باس لەوە دەکات ((دوای ئەوەی گەڕاینەوە بۆ سەر چەندین سەرچاوەو کۆمانکردۆتەوە و کورتمانکردۆتەوە لە کتێبێکدا وەکو ئیبن جەزلە[2] لە کتێبی (تقویم الابدان)[1]

---

١ جودت عزت عطوی: اساليب البحث العلمي مفاهيمة- ادواته — طرقه الاحصائية، (عمان:٢٠٠٠) ص٤٢، طه باقر: طرق البحث العلمي في التاريخ والاثار، (الموصل:د.ت)، ص١٨٠.

٢ ئیبن جەزلە: ئەبو عەبی یەحیا کوڕی عیسا: پزیشکێکی کریستیان بوو لە بەغدا لەسەردەمی خەلیفە ئەلموقتەدی بیئەمریلای عەبباسی (٤٦٧- ٤٨٧ك/ ١٠٧٤- ١٠٩٤ز)، شارەزابووە لە زۆر بواردا بەتایبەتی پزیشکی و (علم الكلام) و لە ساڵی (٤٦٦ك/ ١٠٧٣ز) بووە بە موسڵمان وە لە ساڵی (٤٧٣ك/ ١٠٨٠ز)

ناومان لە کتێبەکەمان نا (تقويم البلدان) ))[2]، ئەوەش لێرەدا ئەوەمان بۆ بەدیاردەخات کەوا ئەبولفیدا چەندە شارەزایی هەبووە لە بواری جوگرافیاو چەندان زانستی تریش بەتایبەتی گەردوونناسی (فەلەکناسی)[3] کاتێك توانی کتێبێك لە بواری جوگرافیا دابنێ و سوود لە ناونیشانی ئیبن جەزلە وەربگرێت کە هەردوولا خشتەیان بەکارهێناوە بۆ خستنەڕووی زانیاریەکان، لێرەدا ئەوەش دەمانباتەوە سەر ئەوەی کە هەردووکیان گەڕاونەتەوە سەریەك سەرچاوەی هاوبەش، ئەوە سەرەڕای ئەوەی ئەبولفیدا خۆی بە ڕوونی ئاماژە بەوە دەکات ئەو ڕێگایەی لە ئیبن جەزلە وەرگرتووە تەنانەت ناونیشانی کتێبەکەش[4].

هەر بۆیە لێرەدا دەکرێت بووترێت ناونیشانی کتێبەکە خۆی داینەناوە بەڵکو بیرۆکەکەی وەرگیراوە لە پزیشکێك و تەنیا بابەتەکەیان جیاوازی هەیە، بەشێوەیەك یەکێکیان دەربارەی بواری پزیشکیەو ئەویتریان بواری جوگرافیا لە خۆ دەگرێت.

بەم شێوەیە دانانی ئەو ناونیشانەش بۆ کتێبەکەی زیرەکانە توانیبوویەتی بۆی دابنێ، لەبەرئەوە وڵاتناسە موسڵمانەکانی پێشووتر چەندین ناوی جیاوازیان بۆ کتێبەکانیان داناوە وەکو (المسالك والمالك) وە (صوره الاقاليم) وە (صوره الارض) و چەندان ناوی تریش[5]، بەڵام ئامانجی ئەبولفیدا لە دانانی ئەو ناونیشانە، زیاتر بۆ هەڵسەنگاندنی وڵاتان و ناوچەکان بووە ئەمە لەلایەك، وە لەلایەکی تر بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی زانستیانەو وردتر زانیاری لە بارەیانەوە بخاتەڕوو.

**دووەم/ هۆکارەکانی نووسینی کتێبەکە:**

---

یاخود هەندێك دەڵێن لە ساڵی (٤٩٣ك/ ١٠٩٩ز) کۆچی دوایی کردووە/ القفطي : اخبار العلماء باخبار الحكماء، تحقيق: عبدالمجيد ديان، (الكويت:٢٠٠١)، ٢/ ٤٩٣ ابن ابي اصيبعه: عيون الانباء في طبقات الاطباء، شرح و تحقيق: نزار رضا، (بيروت:١٩٦٥)، ص٣٤٣.

١ تقويم الابدان: یەکێکە لە بەرهەمە هەرە دیارو بەرچاوەکانی ئیبن جەزلەو تایبەتە بە بواری پزیشکی و لە خستنەڕووی زانیاریەکاندا خشتەی بەکارهێناوە کاتێك دابەشکردووە بۆ دوانزە بەش، کە تێیدا باس لە ناوی نەخۆشیەکەو چۆنیەتی تووسبوون و چارەسەرکردنی کراوە تا دوایی، حاجي خليفة: كشف الظنون، ١/ ٣٨٠، طورطيس عواد: خزائن الكتب القديمة في العراق، (بيروت :١٩٨٦)، ص٣٤٣.

٢ تقويم البلدان: ص ص ٢- ٣.

٣ الكتبي: فوات الوفيات والذيل عليها، مج١/ ١٨٤، العماد الحنبلي : شذرات الذهب، ٦/ ٩٨- ٩٩.

٤ كراتشكوفسكی : تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ٣٩٣.

٥ محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٧.

دیاره هەندێك لە زاناو بیرمەندەکانی پێشوو ئەوانەی بەرهەمی جۆراو جۆریان هەبووە لە زۆر بواردا خۆیان ئاماژە بە هۆکارو پاڵنەرەکانی نووسینەکانیان کردووە، ناوبراویش لەلایەم خۆیەوە بەدەر نەبووە لەو جۆرە کەسانە بەڵکو لە ژمارەیەکی زۆر لە بەرهەمەکانی بە ڕوونی ئاماژە بە هۆکاری نووسینیان دەکات.

ئەوەتا سەبارەت بە هۆکاری نووسینی کتێبی (تقویم البلدان) بەم شێوەیە خۆی باس دەکات و دەڵێت : ((دوای ئەوەی بەدواداچوونم بۆ کتێبەکە دانراوەکان لە بارەی وڵاتان و ناوچەکان لە چیاکان و دەریاکان هیچ کتێبێکم نەدیت مەبەستەکانی من جێ بەجێ بکات))[1]، ئەوەش لێرەدا بەڕوونی شارەزایی ئەبولفیدا نیشاندەدا لە بواری جوگرافیاو ئەو زانستانەی تریش کە پەیوەستن بەم بوارەوە.

١- کتێبە درێژەکانی وڵاتناسان، ئەوانەی زانیاری زۆرباشیان تێدا هەیە لە بارەی وڵاتناسیەوە بەڵام لە هەمان کاتدا ناوی شارو وڵاتەکانیان ڕێکنەخستووەو هەروەها ئاماژە بە درێژی و پانیشیان ناکەن، ئیتر ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئاماژەی پێدەکەن نادیاربێت و سوودێکی تەواوی نەبێت، نموونەی ئەو جۆرە کتێبانەش: (صوره الارض) ی ئیبن حەوقەل (م دوای ٣٧٧ك/ ٩٨٧ز)، (نزهه المشتاق فی اختراق الافاق) ی شەریف ئیدریسی (م٥٦٠ك/ ١١٦٦ز)، (المسالك والمالك) ی ئیبن خرداذبه (م٣٠٠ك/ ١٩١٣ز)[2].

٢- کتێبی (الزیجات)[3] ئەوانەی گرنگیان داوە بە دیاریکردنی درێژی و پانی شارو وڵاتەکان لە ڕێگای زانستی فەلەکناسی، ئەوانەش بەدواداچوونیان بۆ ناوەکانیان و هەروەها تایبەتمەندی شارەکانیان فەرامۆشکردووە یاخود پشتگوێ خستووە، نموونەی ئەو جۆرە کتێبانەش (القانون المسعودی) ی بەیروونیە (م٤٤٠ك/ ١٠٤٨ز)[4].

---

١ تقویم البلدان، ص١.

٢ تقویم البلدان، ص١.

٣ زیج: وەکو زانستێك یەکێکە لە لقەکانی زانستی فەلەکناسی، و بریتییە لە پیشەی ژمێریاری بەسەر یاساکانی ژمارەوە، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی دارە بە هەموو هەسارەیەك لە ڕێگەی جوڵەکانیانەوە، ابن خلدون: تاریخ ابن خلدون، ص٢٥٦، بەڵام کتێبی الزیجان: ئەو جۆرە کتێبانەن گرنگیان داوە بە درێژی و پانی لە ڕێگایانەوە جموجۆلی هەسارەکان بەدیاریدەکرێت و ساڵنامەی تێدا دەردەهێنرێت، واتە خەملاندنی جولەی هەسارەکان ساڵ بە ساڵ، القطي: اخبار العلماء باخبار الحكماء هامش (٤)، ١/ ١٣٠.

٤ تقویم البلدان، ص٢.

٣- ئەو كتێبانەی گرنگیان داوە بە ڕاستكردنەوەو ڕێكخستنی ناوەكـان، بـەڵام لـە هەمانكاتـدا لایەنی درێژەی و پانیان فەرامۆش كردووە، وە ئەگەر زانیاری نەبێت لە بارەی درێژی و پانی هـەر شـارو وڵاتێك ناتوانرێت ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایی، هەروەها باشورو باكوری دیارییبكرێت[1].

هەروەها باس لەوە دەكات ئەو كتێبانـەی لـە بـارەی درێـژەی و پـانی نووسـراون زۆرجـار هەڵەیان كردووە بەشێوەیەك زۆر ناوچە لە هەرێمەكەی خۆی دانەنراوە بەڵكو هەندێك ناوچـەیان لە هەرێمێكەوە خستۆتە هەرێمێكی تر، بەڵام ئێمە چاوپۆشیمان لـەم جـۆرە شـتانە نـەكردووە بەڵكو هەر ناوچەیەك خراوەتە خۆیەوە[2]، نموونەی ئەو جۆرە كتێبانەش (الانساب) ی سـەمعانی (م٥٦٢ك/ ١٢٢٩ز)، (مزیل الارتبـاب عـن مشـتبه الانتسـاب) و (الفیصـل) ی ئەبومەجـد ئیسماعیل كوڕی هیبەتوڵڵای موسڵی (م٦٥٥ك/ ١٢٥٧ز)

دوای ئەوەی سەرنج و تێبینی لە بارەی سەرچاوەكانی پێش خۆی دەخاتەڕوو وەكو كەسێكی لە خۆبووەوە دەڵێت : ((لەو كتێبانەی ئاماژەی پێكرا ئاستەمە پەیبردن بە هەموو وڵاتان یاخود زۆربەیان، لەبەرئەوەی ئەو كارە بە ئارەزووماندا نەبووە بە تەواوی پەیببەبن بە هەموو وڵاتـان، چونكە زۆربەی ئەو كتێبانەی لەو بوارەدا نووسراون كەمێك لە مەبەسـتەكان دەپـێكن))[3]، بـۆ ڕاستی ئەمەش چەند شوێنێك بەنموونە دەهێنێتەوە بەشـێوەیەك كاتێـك بـاس لـە وڵاتـی چـین دەكات لەگەڵ گەورەی و زۆری شارەكانی زانیاری زۆرمان لە بارەیەوە پێنەگەیشتووە مەگەر بە نەوازەو دەگمەن نەبێت، هەروەها وڵاتی هیندیش ئەو هەواڵ و زانیاریانەی لـە بارەیـەوە پێمـان گەیشتوون شلۆق و نادیارن و بەدواداچوونیان بۆ نـەكراوەو چـەندین شـوێنی تـریش هـەن بـەو شێوەیە كە زانیاری كەم لە بارەیانەوە بەدەست گەیشتوون یاخود زۆر بە دەگمەن، دیارە ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە زۆربەی كتێبی وڵاتناسە موسڵمانەكان ئەوانەی لە بارەی ڕێگاو بان و مەملەكەتەكان نووسراون زیـاتر وڵاتـانی ئیسـلامیان پشـكنیەوەو باسـكردووەو لەگـەڵ ئەوەشدا لەت نەكراوە لەگەڵ ئەوانی دواتردا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ((هەروەكو ئەوەی دەگوترێت

١ نفس المصدر والصفحة.

٢ تقویم البلدان، ص ص ٩- ١٠.

٣ المصدر نفسه، ص٢.

مادام گشتی نازانرێت بۆیە هەمووی بە جێ ناهێڵدرێت، لەبەرئەوەی زانیاری دەربارەی هەندێکی باشترە لەوەی هیچ زانیاریمان نەبێت دەربارەی گشتی ))[1] .

هەر بۆیە لێرەدا دەکرێت بە گشتی باس لە چەند خاڵێك بکرێت بوونەتە هۆکار بۆ نووسینی کتێبەکەی ئەوانیش بریتین لە مانەی خوارەوە: یەکەمیان گرنگیدان بە کۆمەڵێك زانست هەر لە سەردەمانێکی زووەوە وایکرد کە شارەزایی زۆربێ لە زۆر بواردا، جوگرافیاش یەکێك بوو لەو بوارانەی شارەزایەکی تەواوی لە بارەیەوە هەبووە، لەبەرئەوەی ئەگەر تەواو شارەزا نەبوایە تێدا نەیدەتوانی دانراوی لە بارەیەوە هەبووە، لەبەرئەوەی ئەگەر تەواو شارەزا نەبوایە تێدا نەیدەتوانی دانراوی لە بارەیەوە هەبێ، دووەمیان ڕەخنەگرتن لە سەرچاوەکانی پێش خۆی بە تایبەتی لەو هەڵەو کەم و کوڕی و ناڕوونیانەی کە لە بەرهەمەکانیان بەدەیدەکرا هانی ئەبولفیدای کە بەرهەمێك بێنێتە کایەوە سەرجەم زانیاریەکان لە خۆبگرێت و کەم و کوڕی و ناوڕونیەکانیشیان چارەسەربکات، سێیەمیان: بەو پێیەی ئەبولفیدا خۆی کەسێکی دەسەڵاتدار بووە وایکردووە لەم ڕێگایەوە بە ئاسانی چاوی بە خەڵکان بکەوێت و هەروەها سەرچاوەی دەگمەنیشی بەدەستبکەوێت، ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە زۆر ناوچە بۆی ڕەخساوە سەردانیان بکات و بیانبینێ، ئەوەشیان دەکرێت بەیەکێك لە هۆکارەکانی تری نووسینی کتێبەکەی دابنرێت.

**سێیەم/ کات و شوێنی نووسینی کتێبەکە:**

کاتێك تەماشای زۆرێك لە سەرچاوەو بەرهەمەکانی پێشوو دەکرێت زۆربەیان لە سەرتایی کتێبەکە یاخود لە کۆتایەکەی ئاماژە بە ساڵی نووسینی کتێبەکەیان دەکەن، بەڵام ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت، ئەبولفیدا لە دەستپێکی کتێبەکەیدا ئاماژە بە هۆکارو پاڵنەرەکانی نووسینی دەکات و کەچی باس لە ساڵی نووسینی ناکات، ئەوە سەرەڕای ئەوەی سەرچاوەکانی ژیاننامەو چینەکانیش ئەوانەی کتێبی (تقويم البلدان) دەگێڕنەوە بۆ خودی ناوبراو نەپڕژاونەتە سەر ئەوەی کەی کتێبەکەی نووسیوەو یاخود لە چ ساڵێکدا دەستی بە نووسینی کردووە.

لەلایەکی تر هەندێك لە ژێدەرەکان باس لەوە دەکەن لە ساڵی (٧١٧ك/ ١٣١٧ز) دەستی بە نووسینی کردووەو لە ساڵی (٧٢١ك/ ١٣٢١ز) ڕەشنووسی کتێبەکەی تەواو کردووە[2]، وە

---

١ نفس المصدر والصفحة.

٢ كراتشكوفسكي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ٣٩١، مصطفى الحاج ابراهيم : الافاق الجغرافية عند ابي الفداء في كتابه تقويم البلدان، بحث منصور في كتاب (المؤرخ الجغرافي ابو الفداء صاحب حماه)، ص١٣٣.

هەندێکی تر باس لەوە ناکەن کەی دەستی بە نووسینی کردووە بەڵکو تەنیا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لەساڵی (٧٢١ك/١٣٢١ز) ڕەشنووسی کتێبەکەی تەواو کردووە[١]، سەرەڕای ئەوەش هەندێك وای بۆ دەچن تاوەکو ساڵی مردنی (٧٣٢ك/ ١٣٣١ز) پێداچوونەوەی بۆ کردووەو زانیاری زیاتری خستۆتەسەر[٢].

لەبەر ڕۆشنایی ئەو بیرو بۆچوونانە دەکرێت باس لەوە بکرێت کەوا لە ساڵی (٧٢١ك/ ١٣٢١ز) ڕەشنووسی کتێبەکەی تەواوکردووەو لە هەمان کاتدا دەکرێت باس لەوەش بکرێت تا دوا ساتەکانی ژیانی بەردەوام کاری لەسەر کردووەو بەردەوام پێداچوونەوەی بۆ کردووەو ئەو زانیاریە نوێیانەی دەستیکەوتووە بۆی زیادکردووە، چونکە تاوەکو ساڵی مردنی ماوەیەکی دوورو درێژەو لە هەمان کاتدا لە دوای ئەو ساڵە سەردانی چەندین ناوچەی کردووەو ئاسۆی بیرکردنەوەی فراوانتر بووەو زانیاری زیاتری دەستکەوتووە، لەبەرئەوە دەکرێت بووترێت تاوەکو ساڵی مردنی کاری تێداکردووە.

هەرچی شوێنی نووسینی کتێبەکەیە، ئەوا دەکرێت باس لەوە بکرێت لە شاری حەما نووسراوە، لەبەرئەوەی پێگەی سەرەکی دەسەڵاتداریەتیەکەی بووەو بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی (٧١٠ك/ ١٣١٠ز) بووە جێگری سوڵتان لەو شارەدا ئەرکی بەڕێوەبردنیشی کەوتە ئەستۆ لەبەر ئەوە لەو ماوەیەدا بەردەوام لە شاری حەما بووەو تەنیا لەو کاتانەدا جێهێشتووە کە بەسەردانی فەرمی چووە بۆ میسر یاخود لەو کاتانەی دەرچووە بە مەبەستی چالاکی سەربازی و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هێزانەی ڕوویان لە ناوچەکە دەکرد، وە جگە لەوەش ئەو شارە لەسەردەمی ئەبولفیدا گەشانەوەیەکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیوو لە هەموو بوارێکەوە بەتایبەتی لە لایەنی زانستی، هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە زاناو بیرمەندەکان ڕوویان تێدەکردو ئەویش لەلایەن خۆیەوە ڕێزی لێدەرتن و لە خۆی نزیك دەکردنەوە[٣].

---

١ محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٨٨، هاملتون گب: دائرة المعارف الاسلامية، مادة (ابو الفداء)،١/ ٥٦٦، محمد كامل عياد:ابو الفداء الملك العلامة، مجلة مجمع اللغة العربية، مج/ ٥٠، (دمشق:١٩٧٥)، ص٥٣.

٢ كراتشكوفسكي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق٣٩٢/١، عبدالرحمن حميدة: اعلام الجغرافيين العرب، ص٥٣٧.

٣ ابن الوردي: تاريخ ابن الوردي، ٢/ ٢٨٨، ابن تغري بردي: المنهل الصافي، ١/ ٢٦١.

هەروەها دەکرێت باس لەوەش بکرێت لەو کاتەی دەسەڵاتدار بووە ڕێگا خۆشکەر بووە بۆ زۆر شت بەتایبەتی دەیتوانی بە ئاسانی چاوی بە بازرگان و گەشتیاران بکەوێت کە لە وڵات و ناوچەکانی تر ڕوویان لە شاری حەما دەکردو ئەوە سەرەڕای ئەوەش لە ڕێگەی ئەوە دەسەڵاتدار بووە چەندین سەرچاوەی دەگمەنیشی دەستکەوتووە کە ئەوانیش لەوە دەچێت دەست هەموو کەسێك و مرۆڤی ئاسایی نەکەوێت[1].

بەو پێیەی شارەزایی هەبووە لە زۆر بواردا توانیوویەتی لە ماوەی دەسەڵاتیدا چەندین جۆر بەرهەمی جۆراو جۆر بەرهەم بهێنێ و کتێبی (تقویم البلدان) یەکێکە لە بەرهەمە دیارو بەرچاوەکانی لە بواری جوگرافیا[2].

بەم شێوەیە لەو کاتەی دەسەڵاتدار بووە لە شاری حەما خەریکی کاری بەڕێوەبردن بووەو بەشداریکردووە لە چالاکیە سەربازیەکانیش و لە هەمان کاتدا لایەنی نووسینی بەرهەمەکانیشی پشتگوێ نەخستووە، هەر بۆیە زۆرجار ماوەی دەسەڵاتی وەکو زۆر لە دەسەڵاتدارانی تر بە مەملەکەتی شمشێرو پێنووس ناوزەند دەکرێت[3]، وە لەم لایەنەشدا لەلایەن ڕووناکبیران ستایشی زۆر کراوە هەروەکو ئەمەی خوراەوە کە بە هۆنراوە باسیان لێوەکردووە: ((یاثانی المالمون بعلمك و عقلك، و ثاني صلاح الدين بعدلك و جهادك))[4].

(ئەی دووەم مەئمون بە زانست و بیرو هۆشت، ئەی دووەم سەلاحەددین بە یەکسانی و کردارە خۆبەخشیەکانت لە پێناوی خودا).

**چوارەم // تەوەرە سەرەکیەکان و چۆنیەتی دابەشکردنی کتێبەکە:**

بەو پێیەی کتێبێك لە هەر بوارێکەوە دەنووسرێت بە گوێرەی بابەتەکەو دوورودرێژی ڕاستەوخۆ دابەش دەکرێت بەسەر چەندین بەش و تەوەرە و بابەتەوە.

سەبارەت بە تەوەرە سەرەکیەکانی کتێبی (تقویم البلدان)، دەکرێت باس لەوە بکرێت هۆکارو پاڵنەرەکان و نووسینی و بەشێك لەسەرچاوەکانی و بیرۆکەی ناونیشانی کتێبەکە دەکات[5].

---

١ علي بن عبدالله الدفاع: رواد علم الجغرافية في الحضارة العربية الاسلامية، ص١٩٩.

٢ الكتبي: فوات الوفيات: مج ١/ ١٨٤، العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ٦/٩٩.

٣ احمد خليل: مشاهير الكرد في التاريخ الاسلامي (الملك المؤرخ ابو الفداء) ص ص ٥-٦.

٤ عبدالرحمن حميدة: ابو الفداء، ص١٥.

٥ تقويم البلدان، ص ص ١-٣.

هەرچی دوو تەوەرە سەرەکیەکەیە لە ڕووی قەبارەو درێژیانەوە یەکسان نین، بەڵکو تەوەرەی یەکەم کورترە لە تەوەرەی دووەم[1]، هەریەکەشیان لەلایەن خۆیەوە چەند بابەتێك لە خۆ دەگرێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

لە تەوەرەی یەکەمدا بە جوگرافیای گشتی دەست پێدەکات بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و بابەتەکانی تەواوکەری یەکترن بەم شێوەیەی خوارەوە :

١- شێوەی گۆی زەوی و ئەو بەشەی کە ئاوەدانە، کاتێك زەوی کراوە بە چوار بەشەوە بەشێکی ئاوەدانەو سێ بەشەکەی تر بە ئاو داپۆشراوە [2].

٢- باس لە حەوت هەرێمەکە کراوەو تایبەتمەندیەکانیان خراوەتە ڕوو وە لە هەمان کاتدا باس لەو یەکانە کراوە کە بۆ مەبەستی ڕووپێوکردنیان بەکارهاتوون بەپشت بەستن بە بیرورِا کۆنەکان و نوێیەکان و بیروڕای خۆی لەم بارەیەوە، کاتێك هەر هەرێمێك درێژی و پانیەکەی چەندەو ڕووبەریان خراوەتەڕوو[3].

٣- باس لە کۆمەڵێك دەریاو دەریاچەو ڕووبار کراوە، بەتایبەتی ئەوانەی دیارو بەرچاو بوونەو زانیاری لە بارەیانەوە خراوەتەڕوو[4].

٤- باس لە کۆمەڵێك چیاکراوە لەسەرتاسەری ئەو ناوچانەی کە ئاوەدان بوونەو زانیاری وەکو پێویست لە بارەیانەوە ئاماژەی پێکراوە [5].

هەرچی تەوەرەی دووەمە بەشە گەورەکەی کتێبەکەیەو کە تێدا باس لە بیست و هەشت هەرێم و وڵات کراوە بەم ڕیزبەندیەی خوارەوە : ((دوورگەی عەرەب، وڵاتی میسر، وڵاتی مەغریب، وڵاتی سودان، دوورگەی ئەندەلوس، جەزائیرو دەریای ناوەڕاست، بەشی باکوری زەوی، شام، هەرێمی جەزیرە، عیراق، خۆزستان، فارس، کرمان، سجستان، سند، هیند، چین

---

١ کراتشکوفسکي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/٢٩٢، محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٨٩.

٢ تقويم البلدان، ص ص ٣- ٦.

٣ تقويم البلدان، ص ص١١- ١٨.

٤ المصدر نفسه، ص ص١٨- ٦٤.

٥ المصدر نفسه، ص ص٦٤- ٧٢.

جەزائیر، ولآتی رۆم، ئەرمینیا و ئاران و ئازربیجان، ولآتی چیا، دیلەم و گەیلان، طبرستان و مازندەران و قومس، خوراسان، زیلستان و غور و طغارستان، خەوارزم، ماوەرا نەهر))[1].

وە هەر یەکێك لەو ولآت و هەرێمانە بەجیا بەپێ ی قەبارەو ڕووبەری ناوچەو ئەو زانیاریانەی لەبەردەستی ئەبولفیدا هەبوون باسیان لێوەکراوە، کاتێك هەر ناوچەو ولآتێك بە جیا لە دوو بەشدا باسکراوە، لەبەشی یەکەمدا بە گشتی باسی لێوەکراوە، وە لە بەشی دووەمدا خشتەی بەکارهاتووەو زۆرترین زانیاری لە بارەی هەر شارێك خراوەتەڕوو.

**پێنجەم/ گرنگی کتێبەکە :**

دیارە هیچێك لەبەرهەمی ولآتناسە موسڵمانەکان ئەوەندە گرنگی پێنەدراوە ئەوەندە گرنگی دراوە بە کتێبی (تقویم البلدان)، بەشێوەیەك ئەبولفیدا لە ڕێگەی ئەو بەرهەمە زانستیانەی توانی خزمەتێکی زۆر بە شارستانیەتی ئیسلام بکات و ناوی لە مێژوودا بە زیندوویی بمێنێتەوە [2].

جێگای ئاماژە پێکردنە گرنگی ئەو کتێبە لەوەدایە بۆ یەکەمین جار سیستەمێکی نوێ لە بواری جوگرافیا هێنرایە کایەوە، ئەویش بەکارهێنانی خشتەبوو لە خستنەڕووی زانیاریەکان، هەرچەندە باس لەوە دەکرێت ئەو بیرۆکەیە خۆی داینەهێناوە بەڵکو لەسەرچاوەکانی پێش خۆی وەریگرتووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستپێشخەری بەکارهێنانی خشتە لە بواری جوگرافیا دەگەڕێتەوە بۆ خودی ئەبولفیدا [3].

هەروەها لەلایەکی تر لەبەر ئەو پایە زانستیەی کتێبەکەی هەیبووە لە نێو سەرچاوەکانی تری بواری جوگرافیا تاڕادەیەکی زۆر شوێنی زۆر لە کتێبەکانی گرتەوەو بووە جێگەو سەرنجی ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپیەکان [4]، ئەوەشیان زیاتر لەبەربوونی ئەو زانیاریە بە نرخانەی کە تێدا ئاماژەی پێکراوە وەکو خڕی (بازنەی ) گۆی زەوی و بەڵگەشی بۆ ڕاستی قسەکانی هێناوەتەوەو باس لەوەش دەکات ڕووبەری ئاوەدان لەسەر گۆی زەوی بەشێکەو سێ بەشەکەی تر بە ئاو

---

١ محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص ص١٩٠- ١٩١.

٢ علي بن عبدالله المدفاع: رواد علم الجغرافية، ص١٨٩.

٣ محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٩٢.

٤ احمد نفيس : جهود المسلمين في الجغرافية، ترجمة : فتحى عثمان، راجعة : علي ادهم، (بيروت:د.ت)، ص٩٣.

داپۆشراوە، هەروەها جیاوازی کات لەسەر گۆی زەوی لەنێوان رۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەبەر خڕی گۆی زەویەوەیە[1].

وە لەبەر گرنگی و پایەی زانستی گرنگی زۆری پێدراوە لەلایەن هاوسەردەمانی ئەبولفیداو ئەوانەی لە دواتردا هاتوون و تەنانەت لەلای ئەوروپییەکانیش ڕەواجێکی زۆری هەبووە گرنگیان پێداوە بە شێوەیەك لە دوای هەردوو کتێبی قورئانی پیرۆزو چیرۆکی (الف لیله ولیله) زۆرترین بایەخی پێدراوەو لە زمانی عەرەبی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی ئەوروپییەکان[2].

ئەوەتا سەربارەت بە هاوسەردەمانی شەمسەددین ئەلزەهەبی (٧٤٨ك/ ١٣٤٧ز) کورتیکردۆتەوەو قسەی خۆشی خستۆتە سەرو هەروەها قەلقەشەندی (م٨٢١ك/ ١٤١٨ز) سوودی زۆری لێوەرگرتووە بەتایبەتی بۆ کتێبی (صبح الاعشی فی صناعه الانشا)[3]، ئەوەشیان بە ڕوونی دیارە کاتێك تەماشای بەشی چوارەمی کتێبی (صبح الاعشی) دەکەین بۆت بەدیاردەکەوێت زانیاریە جوگرافیەکانی لە کتێبی (تقویم البلدان) وەرگرتووەو بەبێ گۆڕانکاری دووبارە داڕشتۆتەوە.

جێگای ئاماژە پێکردنە لای تورکانیش گرنگی زۆری پێدراوە بەتایبەتی محەمەدی کوڕی عەلی سباهی زادە (٩٩٧ك/ ١٥٨٨ز) دووبارە ڕێکی خستووە لە شێوەی ئینسکلوپیدیایەکی زانیاری بە زمانی عەرەبی و زانیاری زیاتری خستۆتە سەرو بڵاویکردۆتەوە لە ژێر ناوی (اوضح المسالك الی معرفه البلدان و الممالك) و هەندێك بەشیشی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی تورکی [4].

هەروەها لەسەدەی حەڤدەهەمی زاینیش گرنگی پێدراوە لەلایەن ئێرانیەکان بەتایبەتی محەمەد صادق ئەصفەهانی پێوە کاریگەر بووە[5].

١ موسی مصطفی الهسنياني: تقييم تقويم البلدان، مجلة الاداب و العلوم- جامعة قاريونس، العدد قاريونس، العدد(١١٩)، (ليبيا:٢٠٠٢)، ص٩، العلامة، ص٥٣.

٢ عبدالرحمن حميدة: ابو الفداء، ص١٩.

٣ فؤاد اقرام البستاني: دائرة المعارف، مج٥/ ٢٩، دائرة المعارف الاسلامية، مادة (ابو الفداء) ١/ ٥٦٦، محمد كامل عياد: ابو الفداء الملك العلامة، ص٥٣.

٤ حاجي خليفة: كشف الظنون، ١/ ٣٨١.

٥كراتشكوفسكي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ٣٩٤.

بەهەمان شێوە لەلای ئەوروپییەکانیش گرنگی زۆری پێدراوەو ستایش کراوە هەروەکو چۆن ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسی رینورد ((Reinoud باس لەوە دەکات ((چاخەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا کتێبێکی وای بەخۆیەوە نەدین بەراورد بکرێن پێدا ))[١].

هەر بۆیە ئەوروپییەکانیش چەندین جار وەریانگێڕاوەتە سەر زمانی خۆیان، ئەوەتا لە ساڵی ١٦٥٠ز (کریفز) لە لەندەم وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی، بە هەمان شێوە لە ساڵی (١٧٦٦) (کوهلر) وەریگێڕاوە لە لەندەن، وە لەلایەکی تر لە ساڵی ١٨٤٠ ز لەلایەن (رینود و دیسلان) بە تەواوی لە پاریس وەرگێڕدراوە، جارێکی تر بە تەنیا (رینود) لە ساڵی (١٨٤٨ز) وەریگێڕاوە بۆ سەر زمانی فەڕەنسی و لە ساڵی (١٨٨٣ز) دووبارە لەلایەن (گویار) لە پاریس وەرگێڕدراوە[٢].

سەرەڕای ئەو هەموو گرنگی پێدانە هەندێك لە ڕۆژهەڵاتناسە ئەروپییەکان دەیانەوێ لە نرخی کتێبەکە کەم بکەنەوە، وەکو ڕۆژهەڵاتناسی هۆڵەندی کرامرز (Kramarz) باس لەوە دەکات ((کتێبێکی لاوازەو گشت زانیاریەکانی دەکات، لە کتێبە کۆنەکان وەرگیراوە))[٣]، ڕاستە ئەبولفیدا ئاماژە بە سەرچاوەکانی زانیاریەکانی دەکات، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە گشت زانیاریەکانی لە سەرچاوەکانی پێش خۆی وەرگرتووە، بەڵکو هوڵیداوە ئەو زانیاریانەی دەستیکەوتوون و ناڕوونی و کەم و کوڕیەکانیشیان چارەسەر بکات.

بەو شێوەیە لەگەڵ ئەوەی کتێبی (تقویم البلدان) پایەکی زانستی گرنگی هەبووەو گرنگی زۆری پێدراوە لەلایەن زۆر لاینەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێبەش نەبووە لە کەم و کورتی هەڵەوە، لێرەدا زۆرجار ئەبولفیدا خۆی پاساو بۆ کەم و کوریەکانی دێنێتەوە کاتێك باس لەوە دەکات ((زۆربەی کتێبەکانی وڵاتناسان دەربارەی ڕێگاکان و مەملەکەتەکان بەدواداچوونیان لە وڵاتی ئیسلامدا کردووە))[٤]. هەروەها زۆر ناوچەی وەکو هیندو چین ناوچەی زۆر گەورەن بەڵام زانیاری زۆر کەم لە بارەیانەوە بە دەست گەیشتوون یاخود بە دەگمەن و لەگەڵ ئەوەشدا بەدواداچوونی بۆ نەکراوە[٥].

---

١ شاكر خصباك: في التراث الجغرافي العربي، ص٢٢٠.

٢ فواد اقام البستاني: دائرة المعارف، مج٥/٢٩، هاملتون گب: دائرة المعارف الاسلامية، مادة (ابو الفداء)، ١/٥٦٦.

٣ كامل عياد: المؤرخ ابو الفداء و نزعته العلمية، بحث منشور في كتاب (المؤرخ الجغرافي ابو الفداء صاحب حماه)، ص٧٧.

٤ تقويم البلدان، ص٢.

٥ نفس المصدر والصفحة.

وه لەلایەکی تر ئەو سەرچاوانەی زانیـاری لێوەرگرتـوون خۆیـان هەڵـەیان کـردووه ئـەویش ڕاستەوخۆ زانیاریەکانی لێوەرگرتوون و بەپێی تواناو زانیاریـەکانی هەنـدێك لـە هەڵەکانیشـی چارەسەر کردووه هەروەکو چۆن باس لـەوه دەکـات ((ئێمـە ئـەو شـتانەمان نووسـیوەتەوه بـە دەستمان گەیشتوون و لەگەڵ ئەوەشدا بە گوێرەی ئەو زانیاریانەی کـە هـەن هەنـدێك جێگـای گومانن، بەڵام ئەگەر زانیاری دەربارەی هەندێك ناوچە بـە مەزەنـدەش بێـت و کـەمیش بێـت باشترە لەوەی هیچ زانیاریمان نەبێت دەربارەی گشتی))[1].

---

١ المصدر نفسه، ص٧٤.

# تەوەرەی دووەم

## سەرچاوەكانی ئەبولفیدا لە نووسینی كتێبی (تقويم البلدان)

لە كاتی نووسینی كتێبیی (تقويم البلدان) پشت بەستراوە بە كۆمەڵێك سەرچاوەی جۆراو جۆر، ئەوانیش زیاتر خۆیان دەبینەوە لەسەرچاوەكانی وڵاتناسانی پێش خۆی و هەروەها ئەو ناوچانەی بۆی ڕەخساوەو سەردانیان بكات لەگەڵ چەند زانیاریەكی سەرزارەكی كە لە گەشتیاران و بازرگانانی وەرگرتووە، هەر بۆیە دیارترین سەرچاوەكانی بە پێی گرنگیان بریتین لە مانەی خوارەوە:

**یەكەم/ سەرچاوەكانی پێش خۆی:**

بەو پێیەی كتێبی (تقويم البلدان) كورتكراوەی كۆمەڵێك لەسەرچاوەكانی پێش خۆیەتی، لەبەرئەوە لە كاتی نووسیندا سوود وەرگیراوە لە ژمارەیەكی زۆر لەو بەرهەمانەی كە پەیوەست بوونە بە بواری جوگرافیاوە، بەتایبەتی ئەوانەی گرنگیان داوە بە جوگرافیای فەلەكناسی، هەروەها ئەوانەی گرنگیان داوە بە تایبەتمەندی وڵاتان و ناوچەكان، كاتێك ئەبولفیدا لە نووسینی كتێبەكەیدا پشتی پێ بەستوون و سوودی زۆری لێوەرگرتوون.

سەبارەت بە جوگرافیای فەلەكناسی سوود وەرگیراوە لە كۆمەڵێك سەرچاوەو ئەوایش بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- بەتلیموس قەلوزی (م دوایی ١٦١ز)

یەكێكە لە زانا یۆنانیە بەناوبانگەكان، شارەزا بووە لە زۆر بواردا وەكو فەلەكناسی و جەبرو ئەندازەو فیزیاو جوگرافیاو مێژوو، وە هەروەها كۆمەڵێك بەرهەمی هەبووە بەناوبانگترینیان كتێبی (المجسطي) یە كە پێكهاتووە لە (١٣) وتار باس لە زانستەكانی شێوەناسی (علم الهيئه)

و ئەستێرەناسی و جوڵەی هەسارەکان دەکات بەتایبەتی ئەوانـەی پەیوەنـدیان بـە گەردوونـەوە هەیە[1] .ئەبولفیدا سوودی زۆری لە نووسینەکانی بەتلیموس وەرگرتووە، بەتایبەتی خۆی ئامـاژە بەیەکێك لە کتێبەکانی دەکات بەناوی (رسم الربع المعمور) لە زمانی یۆنانی وەرگێڕدرایە سـەر زمانی عەرەبی لەسەردەمی خەلیفە مەئمونی عەبباسی (١٩٨- ٢١٨ك/ ٨١٣- ٨٣٣ز)[2] .

٢- ئەلبەیروونی (م٤٤٠ك/ ١٠٤٧ز):

ئەبو رەیحان محەمەدی کوڕی ئەحمەد لە ساڵی (٣٦٢ك/ ٩٧٣ز) لە شاری بەیروون لە وڵاتـی خەوارزم لە دایك بووە، هەر بۆیە بە ئەلبیرونی ناوی دەرکردووە[3] .

لەو کاتەی لە ژیاندا بـووە زۆر بـە ناخۆشـی بردوویەتیـە سـەر، هـەر ئـەوەش وایکـردووە جێگیرنەبێت بەڵکو بـەردەوام لـە ناوچـەیەکەوە بچـێتە ناوچـەیەکی تـر، ئـەوەش وایکـردووە کۆمـەڵێك زمان فێر ببێ وەکو عەرەبی و فارسی و تەنانەت سانسکرتی هینـدیش و شـارەزایی هەبووە لە زۆر بواردا، لەساڵی (٤٤٠ك/ ١٠٤٧ز) لە شاری غەزنە[4] کۆچی دوایی کرد[5] .

بەو پێیەی شارەزا بووە لە زۆر بواردا کۆمەڵێك بەرهەمی جۆراو جۆری هەبووە وەکو کتێبی (الاثار الباقية عن القرون الخالية)، (تاريخ الامـم الشـرقيه)، (تـاريخ الهنـد)، (الاسـتيعاب في صنعة الاسطرلاب)، (اختصار كتاب بطليموس)، (فى احكـام النجـوم)، (تحقيـق ماللهنـد مـن مقوله مقبوله فى العقل او مزدوله)، (القانون المسعودى)[6] .

جێگای ئاماژەپێکردنە کتێبی (القانون المسعودى) بۆ سوڵتان مەسعودی کـوڕی مـەحمودی غەزنەوی (٤٢١- ٤٣٢ك/ ١٠٣٠- ١٠٤٠ز) نووسیووە، لەو کاتەی لە وڵاتی هیند گەرایـەوە لە کۆشکی سولتاندا جێگیر بوو وە لە خزمەتی ئەو دابوو، هەربۆیە نـاوی کتێبەکـەش بـەناوی

---

١ ابن النديم: الفهرست، ص٤٣٠، القفطى : اخبار العلماء باخبار الحكماء، ١/ ١٣١.

٢ تقويم البلدان، ص٧٤.

٣ ابن ابي اصيبعة: عيون الانباء في طبقات الاطباء، ص ٤٥٩، عبدالرحمن حميدة: اعلام الجغرافيين العرب، ص٣٤١.

٤ غەزنە: شارێکی گەورەیەو لە هەمان کاتدا دەڤەرێکی فراوانەو دەکەوێتە لایـەکی وڵاتـی خوراسـان، وە لـە هەمان کاتدا وەکو خاڵێکی سنوری وایە لە نێوان هەردوو وڵاتـی خۆراسـان و هینـد: یـاقوت الحمـوى: معجـم البلدان، ٤/ ٢٠١.

٥ علي بن عبدالله الدفاع: رواد علم الجغرافية، ص١٢٩، عبدالرحمن حميدة: اعلام الجغرافيين العرب، ص٣٤١.

٦ ابن ابي اصيبعة: عيون الابناء، ص٤٥٩، الزركلي : الاعلام، ٥/ ٣١٤.

سولّتانەوەیە و تایبەتە بواری هەسارەو فەلەکناسی[1]، ئەبولفیدا لە چەندین شـوێندا ئامـاژە بـە زانیاریەکانی دەکات و سوودی لێوەرگرتووە.

٢- ئەلفرس[2]:

یەکێکی ترە لەسەرچاوەکانی ئەبولفیدا و خۆی ئامـاژە بـەوە دەکـات کـەوا سـوودی زۆری وەرگرتووە لە کتێبی (الاطوال والعروض) ی ئەلفرس[3]

٤- نوصیرەددین طووسی (م٦٧٢ك/ ١٢٧٤ز)

ئەبو عەبدوڵڵا نوصیرەددین محەمەدی کـوڕی محەمـەد کـوڕی حەسـەن لـە سـاڵی (٥٩٧ك/ ١٢٠١ز) لە شاری طووس[4] لە دایك بووە، کەسێکی زاناو لێهاتوو بووە هەردوو زمانی عەرەبی و فارسی زانیوە و لە زۆر بـواردا کـاریکردووە وەکـو فەلەکناسـی و ئەستێرەناسـی، ماوەیـەك لەلایەم مەغۆلەکان دەست بەسەرکراوە، بەڵام توانیویەتی پایەی خۆی بپارێزی وەکـو زانایـەکی ئەستێرەناس، دواتر لەو هەڵمەتەی لە ساڵی (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز) کردیانـە سـەر بەغـدا لەگـەڵ خۆیانـدا بردیـان و دوای گەڕانـەوەی داوایلێکـرا ڕوانگەیـەك (مرصـد) بـۆ چـاودێریکردنی ئەستێرەکان لە شاری مەراغە[5] دابمەزرێنی و ئەویش لەلایەن خۆیەوە بەو کارە هەڵساو لە ساڵی (٦٧٢ك/ ١٢٧٤ز) لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کرد[6].

دیارە ئەبولفیدا سوودی وەرگرتووە لەبەرهەمانی بەتایبەتی کتێبی (التـذكرة) لـە هەنـدێك شوێندا ئاماژەی پێدەکات و بۆتە یەکێك لەسەرچاوەکانی زانیاری بۆ کتێبەکەی[7].

٥- ئەلخوارزمی (م دوای ٢٣٢ك/ ٨٤٦ز):

---

١ محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٠٥، عبدالرحمن حميدة: اعلام الجغرافيين العرب، ص٣٤١.

٢ لە کتێبی ژینامەو چینەکان هیچ زانیارێکمان لەبارەیەوە دەست نەکەوت لە بارەی ئەوەی کـە کێیـەو لـە چ سەردەمێکدا ژیاوە .

٣ تقويم البلدان، ص٧٤.

٤ طووس: دەکەوێتە هەرێمی خوراسـان و نێـوانی لەگـەڵ نیسـابور دە فەرسـەخە/ ٦٠ کیلۆمـەتر ئـەو شـارە پێکهاتبوو لە دوو شارۆچکە یەکێکیان تەیرانە ئەویتریان نوقان. یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٤/٤٩.

٥ مەراغە: شارێکی گەورەو بەناو بانگە لە وڵاتی ئازربیجانەو دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی ئورمی (ورمێ) بـە دووری (١٥) کیلۆمەتر، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٩، القزوینی : اثار البلاد واخبار العباد، ص٥٦٢.

٦ الكتيبي: فوات الوفيات، مج٣/ ٣٤٦- ٣٤٩، العماد الحنبلي: شذارت الذهب، ٥/ ٣٩٩.

٧ بروانة: تقويم البلدان، ص٣٥.

ئەبو عەبدوڵڵا محەمەد کوڕی موسا، زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نیە لە بارەی ژیانی و ساڵی لەدایك بوونی بەڵکو تەنیا ئاماژە بەوە کراوە کەسێکی شارەزا بووە لە بوارەکانی ئەندازە و ئەستێرەناسی و مێژوو و جوگرافیا، لە دوای ساڵی (٢٣٢ك/ ٨٤٦ز) کۆچی دوایی کردووە[١].

وە لە دوایی خۆیدا چەندین بەرهەمی جێهیشتووە لەوانە: کتێبی (الزیج الاول)، (الزیج الثاني)، (العمل بالاصطرلاب)، (الجبر والمقابله)، (صوره الارض)[٢].

هەندێك ژێدەر بە یەکێك لەسەرچاوەکانی ئەبولفیدای دادەنێن کاتێك باس لەوە دەکەن سوودی لەبەرهەمەکانی وەرگرتووە[٣].

٦- ئیبن سەعیدی مەغریبی (م٦٨٥ك/ ١٢٨٦ز)

ئەبولحەسەن عەلی کوڕی سەعید کوڕی موسا کوڕی محەمەد، لە ساڵی (٦١٠ك/ ١٢١٤ز) لە شاری غەرناطە لە دایك بووەو هەر لەوێ پێگەیشتووە، دواتر سەردانی چەندین ناوچەی کردووە لە جیهانی ئیسلامی و شارەزایی هەبووە لە زۆر بواردا وەکو هونەرو مێژوو و جوگرافیا، هەر بۆیە چەندین بەرهەمی لەو بوارانەدا هەبووە وەکو کتێبی (المشرق فی حلی المشرق)، (النفحه المسکیه فی الرحله المسکیه)، (الجغرافیا) و لە ساڵی (٦٨٥ك/ ١٢٨٦ز) لە شاری دیمەشق کۆچی دوایی کردووە[٤].

کتێبی جوگرافیا یەکێکە لەو سەرچاوانەی سوودی زۆری لێوەرگرتووە بەتایبەتی لە بارەی درێژەی و پانی ناوچەکانی پشتی پێ بەستووەو بەیەکێك لەسەرچاوەکانی خۆی داناوە[٥].

هەروەها سەبارەت بە جوگرافیای وەسفی، ئەوانەی تایبەتمەندی ناوچەکان و وڵاتەکانیان بەدیارخستووە، پشت بەستراوە بە ژمارەیەکی زۆر لەم جۆرە سەرچاوانەش بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئیبن حەوقەلی نەصیبی (م دوایی ٣٧٧ك/ ٩٨٧ز):

---

١ ابن الندیم: الفهرست، ص٤٣٨، عمر فورخ : تاریخ العلوم عند العرب، (بیروت:١٩٧٠)، ص٣٣٣، الزرکلي: الاعلام، ١١٦/٧.

٢ القفطي: اخبار العلماء باخبار الحکماء، ٢/ ٣٩٢.

٣ عبدالرحمن حمید: اعلام الجغرافیین العرب، ص٥٣٨.

٤ الصفدي: الوافي بالوفیات ٣/ ١٠٣- ١٠٤، شاکر خصباك : في التراث الجغرافي العربي، ص١٩٢، الزرکلي: الاعلام، ٥/ ٢٦.

٥ تقویم البلدان، ص٧٤.

ئەبولقاسم محەمەد کوڕی عەلی ناسراو بە ئیبن حەوقەل، هەروەها ناسراوە بە نەصیبی و بەغدادی و موسلیش، سەبارەت بە دایك بوونی زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەردەستماندا نیە، بەڵام خۆی ئاماژە بەوە دەکات لە شاری بەغدا پێگەیشتووەو دواتر سەردانی زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی کردووەو بەکاری بازرگانی و گەڕان و سوڕان خەریك بووە، وە لە دوای ساڵی (٣٧٧ك/ ٩٨٧ز) کۆچی دوایی کردووە[١].

شایەنی باسە کتێبی (صوره الارض) یەکێکە لەو سەرچاوە هەرە دیارانەی پێش خۆی زۆرترین زانیاری لێوەرگرتووە، تەنانەت کەم لە لاپەڕەکانی کتێبەکە دەبینرێت کەوا ئاماژەی بە ناوی نەکردبێ، وە لەلایەکی تریش زۆرجار باسی لە بیروڕای جیاواز دەکات و جەخت لەسەر ڕاکانی ناوبراو دەکاتەوە بە نموونە کاتێك باس لە ڕووباری سەیحون دەکات بیروڕای جیاواز لە بارەیەوە بەدیدەکرێت بەڵام ئەو زانیاریەی ئیبن حەوقەل ئاماژەی پێدەکات وەریگرتووە چونکە خۆی بینیوویەتی [٢].

هەروەها لە بارەی ڕێکخستنی کتێبەکەش سوود وەرگیراوە لەم کتێبە، هەروەکو خۆی باس لەوە دەکات ((نەمان توانی بەو شێوەیە ڕێکی بخەین بە دڵی خۆمان بێت بەڵکو هەمان ڕێچکەی ئیبن حەوقەلمان گرتەبەر لە ڕێکخستنی کتێبەکە کاتێك بە دوورگەی عەرەب دەستمان پێکرد))[٣].

٢- شەریف ئیدرسی (م ٥٦٠ك/ ١١٦٦ز):

ئەبو عەبدوڵلا محەمەد کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئیدریس، لە ساڵی (٤٩٣ك/ ١٠٩٩ز) لە شاری سەبتە لە مەغریب لە دایك بووەو لە شاری قورتبە پێگەیشتووە، دواتر ڕووی لەناوچەکانی جیهانی ئیسلامی و ئەوروپا کردووە[٤].

جێگای ئاماژەپێکردنە ئیدریسی بەیەکەمیم وڵاتناسی موسڵمان دادەنرێت بە شێوەیەکی فراوان باسی وڵاتانی ئەوروپای کردووە، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کاتێك پادشای

---

١ ابن خلكان : وفيات الاعيان، ٢/ ٣٩٨، حاجي خليفة: كشف الظنون، ٦/ ٣٥- ٣٦، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ژیانی بڕوانە: سعد عبود سمان، ابن حوقل دراسة تاريخية في كتابه (صورة الارض) رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الاداب، جامعة البصرة (البصرة :١٩٨٧)، ص ص ٢- ٥.

٢ تقويم البلدان، ص٦١.

٣ تقويم البلدان، ص٧٣.

٤ الصفدي: الوافي بالوفيات، ٧٣/١، احمد نفيس: جهود المسلمين في الجغرافية، ص٨١، الزركلي، الاعلام، ٧/ ٢٤.

نورماندی (روجاری دووەم)[1] کۆمەڵێك زاناو بیرمەندی کۆکردەوەو بانگهێشتی ئەویشی کرد سەردانی سەقلیە بکات و کتێبێکی وڵاتناسی بۆ دابنێ کە تێدا باس لە وڵاتەکەیان و گشت جیهان بکات، ناوبراو بەو کارە هەڵساو کتێبێکی لەو بارەیەوە نووسی بەناوی (نزهه المشتاق فی الاختراق الافاق) ناسراویشە بە کتێبی (روجار)، بەهەمان شێوە کتێبێکی تریشی لە بارەی وڵاتناسی داناوە کە دەکرێت بووترێت کورتکراوەی کتێبی پێشووە بەناوی (روض الانس و نزهة النفس)، لە ساڵی (٥٦٠ك/ ١١٦٦ز) لە شاری سەبتە کۆچی دوایی کرد[2]

ژێدەرەکان باس لەوە دەکەن ئەبولفیدا سوودی زۆری لە بەرهەمەکانی وەرگتووە، بە تایبەتی هەردوو کتێبی (المالك والمسالك) نادیارە، وە کتێبی (روض الانس ونزهه النفس)[3]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی لە کتێبەکەشدا لە چەندین شوێندا ئاماژە بە زانیاری کتێبی (نزهه المشتاق) کردووە.

٣- ئیبن خرداذبە(م٣٠٠ك/ ٩١٣ز):

ئەبو عوبیدڵلا کوڕی عەبدوڵلا کوڕی ئەحمەد ناسراو بە ئیبن خرداذبە[4]، لە نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی کۆچی، نۆیەمی زایینی لە دایك بووە، باوکی کەسێکی دەسەڵاتدار بووە لە هەمان کاتدا خۆش پایەیەکی تایبەتی هەبووە لەلای خەلیفەکانی عەبباسی، لەبەرئەوە کراوە بە (بەرپرسی پۆستەو پەیامبەر) لە هەرێمی چیا، بێگومان ئەو پۆستەیەش گرنگ بووە بە هەموو کەسێکە نەدەدرا، وە لە ساڵی (٣٠٠ك/ ٩١٣ز) کۆچی دوایی کردووە[5].

---

١ روجاری دووەم: یەکێکە لە پادشاکانی نورماندی و دەسەڵاتدای شاری صەقلیە بوو، خۆشەویستی هەبوو بۆ زانست و زانستی فەلسەفە، لە ساڵی (٥٤٨ك/ ١١٥٣ز) بە خنکێنراو ی گیانی لە دەستدا، الصفدي: الوافي بالوفيات، ٤/ ٢٥١.

٢ عبدالرحمن حميده: اعلام الجغرافيين العرب، ص٣٨٩، شاكر خصباك: فی التراپ الجغرافی العربی، ص ص ١٥٣- ١٥٥، وە بۆ زیاتر زانیاری لە بارەیەوە بڕوانە: حكيم احمد خۆشناو: الكورد وبلادهم عند البلدانيين والرحاله المسلمين(٢٣٢- ٦٢٦ك/ ٨٤٦- ١٢٢٩م) (دمشق:٢٠٠٩)ص ص ٨٣- ٨٦.

٣ كراتشكوفسكی: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق٣٩٣/١، عبدالرحمن حميدة: الاعلام الجغرافيين العرب، ص٥٣٨.

٤ ابن النديم: الفهرست، ص٢٣٩، الخطيب البغدادي: تاريخ البغداد او مدينة السلام، (بيروت: د.ت)، ٢/ ٢١٢، ابن خلكان : وفيات الاعيان، ١/ ٤٩٠.

٥ شاكر خصباك: في التراث الجغرافي العربي، ص٢١، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەیەوە بڕوانە: حكيم احمد خۆشناو: الكورد وبلادهم عند البلدانيين والرحالة، ص ص٢٩.

بەو پێیەی شارەزا بووە لە زۆر بواردا کۆمەڵێك بەرهەمی جۆراو جۆری هەبووە وەکو کتێبی (ادب السماع)، (جمهرة انساب الفرس والقوفل)، (الطبيخ) كتاب (اللهو والملاهي)، (الشراب)، (كتاب الانواء)، (الندماء والجلساء)، (المسالك والمالك)[1].

وە ئەوەی لێرەدا دەکرێت ئامـاژەی پـێ بکرێـت تـەنیا کتـێبی (المسـالك والممالـك) مـاوە لـە بەرهەمەکانی کە یەکێکە لە کتێبە هەرە گرنگە کۆنەکان لە بارەی جوگرافیـا[2]، ئەبولفیـدا لەلایـەن خۆیەوە ناویهێناوەو سوودی لێوەرگرتووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێبازیان لەیەکتر جیاوازە.

ئەبوئیسـحاق ئیـبراهیم کـوڕی محەمـەدی فارسـی[3]، لـەبارەی ژیـانی زانیاریـەکی ئـەوتۆ لەبەردەستماندا نیە، بەڵام دەکرێت بووترێت لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی چـوارەمی کۆچـی/ دەیەمی زاینی ژیاوەو زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی گەڕاوەو ئەو شوێنانەی بنیوویـەتی وایکردووە کتێبی (المسالك والممالك) بنووسێت، ئەو کتێبەش تایبەتمەندیەکی جیـاوازی هەیـە لەگەڵ بەرهەمەکانی تر لەو بـوارەدا کـە تێـدا نەخشـەی زۆری تێـدا بـەکارهاتووە بـۆ زیـاتر ڕوونکردنەوە[4]، لەساڵی (٣٤٦ك/ ٩٥٢ز) کۆچی دوایی کردووە[5].

ژێدەرەکان بەیەکێك لەسەرچاوەکانی ئەبولفیدای دادەنێن و تەنانەت باس لـەوە دەکـەن زۆر کاریگەر بووە بە ڕێبازی بەتایبەتی لە دابەشکردنی هەرێمەکان[6].

٥- ئەلموهەلەبی (م٣٨٠ك/ ٩٩٠ز):

حەسەن کوڕی ئەحمەد، خاوەن کتێبی (المسالك والممالك) کاتێك لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی بۆ خەلیفەی فاطمی ئەلعەزیز(٣٦٥- ٣٨٦ك/ ٩٧٥- ٩٩٦ز) نووسی، هەر بۆیە ئەو کتێبە ناسراوە بە (العزيزي)، وە لە ساڵی (٣٨٠ك/ ٩٩٠ز) کۆچی دوایی کردووە[7].

---

١ ابن النديم: الفهرست، ص٢٣٩.

٢ حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام السياسيى والدينى والثقافي والاجتماعي، (القاهرة: ٢٠٠١)، ٢/ ٢٨٧.

٣ حاجى خليفة: كشف الظنون، ٥/ ٩.

٤ علي بن عبدالله الدفاع: رواد علم الجغرافية، ص١٠٣، شاكر خصباك في التراث الجغرافي العربي، ص٣٩.

٥ حاجى خليفة : كشف الظنون، ٥/ ٩.

٦كراتشكوفسكي : تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ٣٩٣، محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٩١.

٧ كراتشكوفسكي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ٢٣٠، صلاح الدين المنجد: قطعة من كتاب مفقود المسالك والممالك للمهليي مجلة معهد المخطوطات العربية، العدد (٤) (دمشق:١٩٥٨)، ص٤٦

له ڕاستیدا ئەو کتێبە بوونی نەماوە، بەڵام یەکێك لە لێکۆڵەرەوان هەڵساوە بە کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانەی کە لە یاقوتی حەمەوی و ئەبولفیدا لەبەرهەمەکانیاندا ئاماژەی پێکراوە لە کتێبێکدا ناوی لێناوە (الكتاب العزيزي)[1].

٦- ئەبو مەجد ئیسماعیل کوڕی هیبەتوڵڵای موصڵی (م٦٥٥ك/ ١٢٥٧ز):

یەکێتی ترە لەسەرچاوەکانی ئەبولفیدا و خۆی ئاماژەی پێکردووە، بەتایبەتی سوودی وەرگرتووە لە هەردوو کتێبی (مزيل الارتباب عن مشتبه الانتساب) و (الفيصل)، لەسەرچاوەکاندا زانیاریەکی ئەوتۆ نادەن بە دەستەوە تەنیا باس لەوە دەکەن کە خەڵکی موصلەو کاری کردووە لە بەغدادو حەلەب و دیمەشق وە دواتر هەر لە شاری حەلەب کۆچی دوایی کردووە[2].

٧-سەمعانی (م٥٦٢ك/ ١١٦٦ز):

ئەبو سەعد عەبدولکەریم کوڕی محەمەد کوڕی مەنصور کوڕی محەمەد تەمیمی مەروزی سەمعانییە، لە ساڵی (٥٠٦ك/ ١١١٢ز) لە شاری مەرو[3] لەدایك بووە[4].

هەر لەسەرەتایی تەمەنی ئامادەبووە لە دانیشتنی زاناکان و فێری قورئانی پیرۆز و زانستەکانی سەردەم بووە، دواتر سەردانی بەشێکی زۆری لە ناوچەکانی جیهان کردووە بە مەبەستی گەڕان بە دوای زانست و زانیاری، وە نزیکەی (٥٣) دانراوی هەبووە لە دیارترینیان (تذيل تاريخ بغداد)، (تاريخ مرو) نزیکەی (٥٣) بەرگە، (الانساب) پێهاتووە لە (٨) بەرگ، وە لە ساڵی (٥٦٢ك/ ١١٦٦ز) لە شاری مەرو کۆچی دوایی کرد[5].

دیارە کتێبی (الانساب) یەکێکە لەو سەرچاوانەی ئەبولفیدا سوودی زۆری لێوەرگرتووە بەتایبەتی لە ڕێکخستنی ناوی شارو وڵاتەکان.

٨- ئیبن ئەلئەثیری جەزری (م٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز):

---

١ المهليي: الكتاب العزيزي(المسالك والممالك)، جمعة وعلق عليه: تيسير خلف، (دمشق:٢٠٠٦) ص ص ١٦- ١٩.

٢ حاجى خليفة: طشف الظنون، ٢/ ٥٤١، الزركلي : الاعلام، ١/ ٣٢٨.

مەرو : لە زمانی عەرەبی بە مانای بەردی سپی دێت، یەکێکە لە شارە بەناوبانگەکانی وڵاتی خوراسان، وە نێوانی لەگەڵ شاری نیسابور(٧٠) فەرسەخ/٤٢٠ کیلۆمەتر، ياقوت الحموی: معجم البلدان، ٥/ ١١٢- ٣.١١٣

٤ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٣/ ٢٠٩، علي بن عبدالله الدفاع: رواد علم الجغرافية، ص١٥٥.

٥ السمعاني: الانساب، وضع حواشيه: محمد عبدالقادر عطا، (بيروت:١٩٩٨)، مج ١/ ٤-٩، العماد الحنبلي : شذرات الذهب ٤/٢٠٥- ٢٠٦.

ئەبو لحەسەن عەلی کوڕی محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی عەبدولکەریمی سەیبانی ناسراو بە ئیبن ئەلئەثیری جەزری، لە ساڵی (٥٥٥ك/ ١١٦٠ز) لە دوورگەی ئیبن عومەر[١] لە دایك بووە لە خێزانێکی ناودارو شکۆمەندو دەوڵەمەند[٢].

دواتر لەگەڵ باوکیا چووەتە شاری موصل و چەند جارێك سەردانی بەغدای کردووە، هەروەها سەردانی ناوچەکانی شام و قودسیشی کردووەو شارەزابووە لە زۆربواردا بەتایبەتی پێشەوا بووە لەبەرکردنی فەرموودەو هەروەها مێژووی کۆندا، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەیە بە ڕەچەڵەکی عەرەب و باودۆخیان، سەرەڕای ئەوانەش زۆر لێهاتووبووە لە بواری مێژوو، هەر بۆیە چەندین دانراوی لەو بوارەدا هەبووە وەکو کتێبی (الکامل فی التاریخ)، (تاریخ الدوله الاتابکیه)، (اسد الغابه فی معرفه الصحابه)،هەروەها کتێبی (اللباب فی تهذیب الانساب) کە کورتکراوەی کتێبی (الانساب) ی سەمعانیە، وە لە ساڵی (٦٣٠ك/ ١٢٣٢ز) لەشاری موصل کۆچی دوایی کردووە[٣].

ئەبولفیدا بەپێی ئاماژەکردنەکانی خۆی لە زۆر شوێندا ئاماژە بە زانیاری دەکات کە لە (اللباب فی تهذیب الانساب) ی وەرگرتووە لە پاڵ سەرچاوەکانی تر بۆکتێبەکەی[٤].

هەرچەندە هەردوو کتێبی (الانساب) و (اللباب) لە بارەی ڕەچەلەکناسی و ڕەسەن ناسین، بەلاّم لەبەرئەوەی گرنگی زۆریان داوە بە ڕێکخستنی ناوی شارەکان ئەبولفیدا سوودی زۆری لێیان وەرگرتووە.

٩- یاقوتی حەمەوی (م٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز) :

ئەبو عەبدوڵلا یاقوت کوڕی عەبدوڵلای حەمەوی ڕۆمی، لە ساڵی (٥٧٥ك/ ١١٧٩ز) لە وڵاتی ڕۆم (ئەنادۆڵی ئێستا) لە دایك بووە، دواتر لە تەمەنی منداڵیدا بەدیل گیراوە لەلایەن یەکێك لە بازرگانە بەغدادیەکان بەناوی (عەسکەر کوڕی ئەبی نەصر ئیبراهیم حەمەوی) کراوە، هەر بۆیە ناوی یاقوت حەمەی دەرکردووە، لە ماوەی ژیانیدا گرنگی بە زۆر بواردەدا و هەر لەبەرئەوەشە کۆمەڵێك دانراوی هەبووە وەکو کتێبی (معجم البلدان)، (معجم الادباء)،

---

١ دوورگەی ئیبن عومەر: شارێکی گەورەیەو لە سێ لاوە بە ئاو دەورە دراوەو دەکەوێتە ڕۆژهەلاّتی رووباری دیجلە لە هەرێمی جەزیرە، المقدسی: احسن التقاسیم فی معرفه الاقالیم، ص١٢٧.

٢ ابن خلکان: وفیات الاعیان، ٣/ ٣٤٨، الصفدي : الوافي بالوفیات، ٧/ ٤٨.

٣ الصفدي: الوافي بالوفیات، ٧/ ٤٨.

٤ بڕوانە: تقویم البلدان، ص ص ٤٨، ٥٩، ٨٠، ٨٣، ١٢٤.

(المشترك وضعا والمفترق صقعا)، (المبدا والمال)، (كتاب الدول)، (اخبار المتنيي)، (المقتضب في النسب)، وه له سالّى (٦٢٦ك/ ١٢٢٩ز) له شارى حەلەب کۆچی دوایی کردووه[١].

وه ئەوەی لێرەدا زیاتر مەبەستمانە هەردوو کتێبەکەیەتی لە بواری جوگرافیا (معجم البلدان) و (المشترك وضعا والمفترق صقعا) کە ئەبولفیدا زۆر بە ڕوونی ئەوەمان بەرچاو دەخات سوودی زۆری وەرگرتووە لە کتێبیی (المشترك وضعا) و بۆتە یەکێك لەسەرچاوەکان بۆ کتێبەکەی.

هەرچی کتێبی (معجم البلدان)ە، هەندێك ژێدەر بەیەکێك لەسەرچاوەکانی ئەبولفیدای دادەنێن[٢]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەسەرەتایی کتێبەکە تاوەکو کۆتایی ئەبولفیدا چەندین جار ئاماژە بە ناوی کتێبی (المشترك وضعا) دەکات زانیاری لێوەرگرتووە کەچی بەهیچ شێوەیەك ناوی (معجم البلدان) ناهێنێ، بۆیە لێرەدا دەکرێت باس لەوە بکرێت ڕەنگە لەبەرئەوە بێت کتێبی (المشترك) دوای ئەوەی پێشووتر نووسراوەو تاڕادەیەکی زۆریش کورتکراوەیەتی و تێدا ناوی شارو وڵاتەکانیش باشتر تێدا ڕێکخراوە ئەمە لەلایەك، وە لەلایەکی تریش دەکرێت بووترێت ڕەنگە هەر نەیبینیبێ ئەگینا لە شوێنێك لە کتێبەکەیدا ئاماژەی پێدەکرد.

هەر سەبارەت بە سەرچاوەکانی پێش خۆی، جۆرێکی تر لەسەرچاوە بەدی دەکرێت، کاتێك ئاماژە بەناوی دەکات و ناو کتێب ناهێنێ، نموونەی لەم جۆرەش لە کتێبەکەیدا لە هەندێك شوێندا بەرچاو دەکەوێت.

ئەوەتا لە باسکردنی دەریای خەزەر (قەزوین) ئاماژە بە بیروڕاکانی دادوەر قوتبەددین[٣] دەکات بەبێ ئەوەی ناوی کتێبەکەی بهێنێ[٤].

---

١ ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٦/ ١٢٧- ١٣٥، نقولا زيادة: الجغرافية والرحلات عند العرب، (بيروت:١٩٨٧) ص ص ٦١- ٦٢، شاكر خصباك : في التراث الجغرافي العربي، ص ص ١٨٥- ١٨٦، وه بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: حكيم احمد خوشناو: الكورد وبلادهم عند البلدانيين والرحالة، ص ص ٨٧- ٩٢.

٢ كراتشكوفسكى: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ٣٩٣.

٣ دادوەر قوتبەددین: ڕەنگە مەبەستی قوتبەددین مەسعود شیرازی بێت (٦٣٤- ٧١٠ك/ ١٢٣٦- ١٣١١ز) کەسێکی شارەزابووە لە بواری جوگرافیاو فەلەکناسی و خاوەنی هەردوو کتێبیی (نهاية الاداك في دراية الافلاك)و (التعفة الشاهية في علم الهيئة) . كراتشكوفسكى: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ١١٥.

٤ تقويم البلدان، ص٣٥.

بەهەمان شێوە کە دێتە سەر باسکردنی ڕووباری نیل لە میسر بیروڕاکانی ئیبن سینا[1] دەهێنێتەوە کاتێك بە چەند تایبەتمەندیەك جیای کردۆتەوە لە ڕووبارەکانی ترو لە پێشەوەی هەمووشیان درێژترین ڕووبارە لەسەر زەوی[2].

هەروەها سەبارەت بە چیای قومەر[3] لە ڕووی ڕێکخستنی ناوەکەیەوە ئاماژەی بەسەرچاوەیەکی دیکە کردووە ئەویش ئیبن مطرف[4] لە پاڵ سەرچاوەکانی تری زانیاری بۆ کتێبەکەی.

لەلایەکی دیکە لە باسکردنی دوورگەی عەرەبدا ئاماژە بە ووتەکانی ئەبوبکر ئەحمەدی کوڕی محەمەد[5] دەکات لە بارەی چۆنیەتی دابەشبوونی دوورگەی عەرەب بەسەر چەند بەشێکەوە[6].

بەهەمان شێوە نموونەی تریش لەو جۆرە سەرچاوانە لە کتێبەکەیدا بەدیدەکرێت هەروەکو چۆن لە باسکردنی شاری سیروان لە هەرێمی چیا بیروڕاکانی ئەحمەد کوڕی ئەبو یەعقوب[7] دەهێنێتەوە کاتێك

---

١ ئیبن سینا: ئەبو عەلی حسین کورشی عەبدوڵڵای کوڕی سینا، یەکێکە لە زاناو پزیشکە هەرە ناودارەکانی سەردەمی خۆی و شارەزایی زۆر بووە لە زۆر بواردا، بەتایبەتی فەلسەفەو ژیربێژی و جەبرو ئەندازەو پزیشکی، لە ساڵی (٤٢٨ك/ ١٠٣٦ز) لە شاری هەمەدان کۆچی دوایی کرد. ابن خلکان . وفیات الاعیان، ١٥٧/٢.

٢ تقویم البلدان، ص ص ٤٤- ٤٥.

٣ چیای قومەر: یەکێکە لەو چیانانەی دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ئەفریقیاو تێدا سەرچاوەی ڕووباری نیلی تێدا هەڵدەقوڵێ و دواتر بە چەند وڵاتێکدا دەڕوات، ابن خلدون: تاریخ ابن خلدون، ص ٣٣.

٤ لەسەرچاوەکانی ژیاننامەو چینەکان هیچ زانیارێکمان دەربارەی ئیبن مگرف دەست نەکەوتووە.

٥ ئەبوبکر ئەحمەد کوڕی محەمەد: کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم هەمەدانی، خاوەنی کتێبی (البلدان) و لە کۆتایەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی / نۆیەمی زاینی کۆچی دوایی کردووە. حاجی خلیفة: کشف الظنون، ٥/ ٥٣- ٥٤، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی بڕوانە: حکیم احمد خۆشناو، الکورد و بلادهم عند البلدانیین و الرحالة، ص ص ٤٨- ٤٩.

٦ تقویم البلدان، ص٧٨

٧ ئەحمەد کوڕی ئەبو یەعقوب: کوڕی ئیسحاق کوڕی جەعفەر ناسراوە بە ئەلیەعقوبی، لە شاری بەغدا لە دایك بووەو هەر لەوێدا پێگەیشتووە، دواتر سەردانی چەندین ناوچەی کردووەو هەردوو کتێبی (المسالك والممالك) (البلدان) لە بواری جوگرافیا، ئەبولفیدا لەلایەن خۆیەوە سوودی وەرگرتووە لە کتێبی (المسالك والممالك) کە ئێستا نادیارە، لە دوای ساڵی (٢٩٢ك/ ٩٠٥ز) کۆچی دوایی کردووە، حاجی خلیفة :کشف الظنون، ٥/ ٤٣، بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ژیانی و کتێبەکانی بڕوانە: حکیم احمد خۆشناو : الکورد وبلادهم عند البلدانیین والرحالة، ص ص ٤٢- ٤٦.

باس لەوە دەکات ((ئەو شارە ماسبذانیشی پێ دەگوترێت و شارێکی کۆنەو دەکەوێتە هەرێمی چیاو زۆر لە شاری مەککە دەچێت کاتێك دەکەوێتە نێو شاخ و دۆڵاییەکان)) [1].

کەواتە کتێبی (تقویم البلدان) کورتکراوەی کۆمەڵێك لەسەرچاوەکانی پێش خۆیەتی و هەر بۆیە لە کاتی نووسیندا پشت بەستراوە بە ژمارەیەکی زۆر بەسەرچاوەی وڵاتناسان و ئەو بەرهەمانەی تریش کە پەیوەستن بە بواری جوگرافیاوە.

**دووەم / بینین و بەشداریکردن:**

هەرچەندە ئەبولفیدای ئەیوبی وڵاتناسێکی گەڕیدەو گەشتیار نەبووە بە ئامانج و پاڵنەری تایبەتی سەردانی وڵاتانی کردبێ [2]، لەهەمان کاتدا وەکو هەندێك لە وڵاتناسانیش نەبووە بۆ ئەوەی بەدواداچوون بۆ هەواڵ و زانیاری بکات [3]، بەڵکو زیاترینی زانیاری بۆ کتێبەکەی سەرچاوەکانی پێش خۆی بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت ئاماژە بەوە بکرێت کتێبەکەی بێبەش نەبووە لەو جۆرە سەرچاوەش کاتێك خۆی ڕاستەوخۆ سەردانی هەندێك ناوچەی کردووە، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی بۆی ڕەخساوە سەردانیان بکات و لە نزیکەوە بیانبینێ.

دیارە بەشداریکردن و بینینی هەندێك ناوچە دەگەڕێتەوە بۆ خودی ئەبولفیدا خۆی کە لە بنەماڵەیەکی ناودار و دەسەڵاتدار بووە، لە هەمان کاتدا بەناوبانگ بوونە بە خۆبەخشینیان لە پێناوی خوداو ڕووبەڕووبوونەوەی خاچ دروشمەکان، لەبەرئەوە لێرەدا دەکرێت بینینی هەندێك ناوچە لەلایەم ناوبراوەوە دابەشبکرێت بۆ دوو شێوە بەم شێوانەی خوارەوە :-

یەکەمیان بەشداریکردنی لەو کردارو چالاکیە سەربازیانەی کە لە ماوەی ژیانیدا ڕوویانداوە وایکردووە ژمارەیەك ناوچە ببینێ، هەروەکو چۆن خۆی باس دەکات هەر لە تەمەنی هەرزەکاریدا بەشداریکردووە لە پاکردنەوەی قەڵای مەرقب لە ساڵی (٦٨٤ك/ ١٢٨٥ز) لە خاچ دروشمەکان و دەڵێت ((ئامادەبوومە لە گەمارۆدانی قەڵای مەرقب، ئەو کاتە تەمەنم دوانزە ساڵ

---

١ تقویم البلدان، ص٤١٥.

٢ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئامانج و پاڵنەرەکانی گەڕیدەو وڵاتناسان بۆ وڵاتان بڕوانە: حکیم احمد خۆشناو: الکورد وبلادهم عند البلدانیین والرحالة، ص ص ٢٦- ٢٧.

٣ بە نموونە ئیبن حەوقەلی نەصیبی (م دوایی ٣٧٧ك/ ٩٨٨ز) تەنیا بەوە نەوەستاوە زانیاری دەربارەی وڵاتان لەسەرچاوەکانی پێش خۆی وەربگرێت، بەڵکو خۆی بەدواداچوونی بۆ ئەم هەواڵ و زانیارانە کردووە بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەو زانیاریانە لەبەر ئەوە خۆی سەردانی زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی کردووە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سعد عبود سمان، ابن حوقل، دراسه تاریخیه فی کتابة (صورة الارض)، ص ص٢١- ٢٢.

بوو...))[1]، هەروەها لە ساڵی (٦٨٨ك/ ١٢٨٩ز) بەشداریکردووە لــە فــەتح کردنــی تــەرابلس هەروەکو خۆی باس دەکات : ((یەکێکی ترە لەو گەمارۆدانانەی خۆم تێدا بەشداربوومە...))[2] .

بەهەمان شێوە بەشــداریکردووە لــەو هەڵمەتانــەی کراوەتــە سەرناوچــەکانی ئاســیای بچــووك[3]، بەتایبەتی لە ساڵی (٦٩١/ ١٢٩١ز) بەشداریکردووە لە فەتح کردنی ڕۆم، کە یەکێکە لە قەڵا قــایم و سەختەکانی ڕۆژئاوای ڕووباری فورات[4]، هەروەها ئەو هەڵمەتە یەك لە دوای یەکانەی کراوەتە سەر ناوچەکانی سیس بەتایبەتی ئەوەی ساڵی (٧٠١ك/ ١٣٠١ز) خۆی تێدا بەشداربووە[5] .

بەم شێوەیە لە ئەنجامی کردارە سەربازیەکانی بەشێکی زۆر لە کەنارەکانی شام و هــەروەها ئاسیای بچووك و هەندێك ناوچەی لە هەرێمی جەزیرە بینیووە.

دووەمیان دوای ئەوەی بووە بە جێگری سوڵتان لە شاری حەما چــەندین جــار ســەردانی میســرو حەجی ماڵی خوای کردووە، ئیتر ئەوەش وایکردووە ناوچەکانی میســرو دوورگــەی عــەرەب ببینــێ، ئەوەتا لە ســاڵی (٧١٢ك/ ١٣١٢ز) ســەردانی میســری کــردووە[6]، هــەروەها لــە ســاڵی (٧١٩ك/ ١٣١٩ز).دوای ئەوەی سەردانی میسری کرد، لەوێشەوە بە یاوەری سوڵتان محەمەی کــوڕی مەنصــور قلاونی مەمالیك سەردانی حەجی ماڵی خوایان کرد لە دوورگەی عەرەب[7] .

هەروەها لە ساڵی (٦٢٨ك/١٣٢٨ز) دوای گەڕانەوەی لە میسر داوای لە ســوڵتان محەمــەد کرد ڕێگای پێدانی سەردانی قودسی پیرۆز بکات. ئەوەبوو لەم گەشتەیەدا ژمارەیــەکی زۆر لــە شارەکانی کەناری شامی بینی و سەردانی بیروت و صەیداو قودسیشی کرد[8] .

---

١ المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٣٥٥.

٢ المصدر نفسه، ٢/ ٣٥٨.

٣ ئاسیای بچووك: ئەو زاراوەیە لەسەدەی پێنجەمی زاینی بەدیارکەوت، بەو ناوچە ڕۆمانیانە دەگوترا لە ئاسیا بۆ جیاکردنەوەی لە هەرێمە ڕۆمانیەکانی تر

W.Miller: Asia minor,Encyclopadia Britanica, (London:1957),2/535.

٤ المختصر في اخبار البشر، ٣٦٢/٢.

٥ المصدر نفسه، ٢/ ٣٨٦.

٦ المصدر نفسه، ٤١٠/٢.

٧ المختصر في اخبار البشر، ٤٣١/٢- ٤٣٢.

٨ المصدر نفسه، ٢/ ٤٤٧.

بەم جۆرە لە ڕێگای کرداره سەربازی و چالاکیە ڕامیاریەکانی بۆی رەخسا کە زۆر ناوچە ببینێ وەکو ناوچەکانی شام و دەوروبەری و دوورگەی عەرەب و میسرو بەشی رۆژهەلاتی ئاسیای بچووك و هەندێك لە هەرێمی جەزیرە، لە ڕاستیدا ئەم ناوچانەی بەشێکی کەم پێك دەهێنن لە پێکهاتەی کتێبەکەی، بەلاّم لەگەلْ ئەوەشدا ئەو ناوچانەی خۆی بینیوویەتی زۆرترین زانیاری لە بارەیانەوه خستۆتەڕوو[1].

## سێیەم/ زانیاری سەر زارەکی:

هەروەکو دیارە کتێبی (تقويم البلدان) بەدەر نەبووە لەو جۆرە سەرچاوەیەش کە زیاتر خۆی دەبینیەوە لەو هەوالْ و گێڕانەوەو زانیاریە سەرزارەکیانەی ئەبولفیدا لە دانیشتووانی ئەو جێگایانەی یاخود لە بازرگان و گەشتیاران و ڕێبواران گوێبیست بووەو وەریگرتووە، بەتایبەتی ئەوانەی خۆیان سەردانی ناوچەکانیان کردووەو بەچاوی خۆیان شوێنەکانیان بینیووە، بێگومان ئەو جۆرە سەرچاوەیەش بۆ زانیاری سوودی زۆری هەبووە، لەبەرئەوەی وردو دەگمەن بوون بە تایبەتی دەربارەی ئەو ناوچانەی لەسەرچاوەکاندا زانیاری لە بارەیانەوە کەمە.

شایەنی باسە سوود وەرگرتنی ناوبراو لەو جۆرە زانیاریانەش بۆ کتێبەکەی دەکرێت باس لەوە بکرێت دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، یەکەمیان ئەو پێگە ڕامیاریەی کە هەیبووە، دوای ئەوەی لە سالّی (٧١٠ك/ ١٣١٠ز) بووە بە جێگری سولْتان لە شاری حەما ڕێگاخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی بتوانێ زانیاری وردو دەگمەن لە بارەی زۆر شوێن کۆبکاتەوە بەتایبەتی لە ڕێگای بازرگان و ڕێبواران و ئەوانەی بەزۆر شوێندا ددەگەڕان و سەردانی حەماشیان دەکرد، ئەویش دەیتوانی بە ئاسانی بیانبینێ و زانیاری سەرزارەکیان لێوەربگرێت دەربارەی ئەو شوێنانەی سەردانیان کردووە[2]، هەلْبەتە ئەو جۆرە زانیاریانەش گرنگ بە بەراورد لەگەلْ ئەو زانیاریانەی لەسەرچاوەکاندا باسیان لێوەکراوە، چونکە زۆر جار هەلْەو کەم و کوڕی و زیادەڕۆیان تیاداکراوە.

دووەم زۆرێك لەسەرچاوەکانی ولاّتناسان گرنگیان داوە بە ولاّتی ئیسلام و کەمتر پرژاونەتە سەر ناوچەکانی تر، بۆ ئەو مەبەستە ئەبولفیدا خۆی ئاماژە بەوە دەکات زۆر ناوچەو شوێن هەن زۆر گەورەن و شاریان زۆرە، بەلاّم زانیاری لە بارەیانەوە زۆر کەم و دەگمەن و ئەگەر هەشبێت بەدواداچوونی بۆ نەکراوە، هەر لەو بارەشەوە چەندین شوێن بە نموونە دەهێنێتەوە وەکو هیندو

---

١ کراتشکوفسکی: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/٣٩٤.

٢ علي بن عبدالله الدفاع: رواد علم الجغرافية، ص١٩٩.

بەدواداچوونی بۆ نەکراوە، هەر لەو بارەشەوە چەندین شوێن بە نموونە دەهێنێتەوە وەکو هیندو چین و بولغارو ڕوس و سوودان[1]، هەر بۆیە لەبارەی ئەو ناوچانە زۆرترین زانیاری لە بازرگان و ڕێبوارو خەڵکی ناوچەکە وەرگیراوە.

لە بارەی زانیاری سەرزارەکیش، نموونەی دیارو بەرچاو لە چەندین شوێن لە کتێبەکەدا بەدیدەکرێت بەم شێوانەی خوارەوە، ئەوەتا لە بارەی وەرگرتنی زانیاری لە گەشتیاران بەم شێوەیە باسی لێوەدەکات ((بۆیان باسکردم لە گەشتیاران لە بارەی گەرووی بابولمەندەب...))[2].

هەروەها لە شوێنێکی تردا باس لەوە دەکات ((هەندێك لە گەشتیارو ڕێبوار دەڵێن دەوی کەنداوی قوستەنتینە لەتەك دەریای ڕۆمەوەیە (ناوەڕاست) وە لە گەرووەکی تێدا دوو وشکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەبینرێت ئەگەر بچێتە ناویەوە کەنداوی قوستەنتینە فراوان دەبێت ))[3].

هەرچی وەرگرتنی زانیاریە لە بازرگانان بەو شێوەیە باسی لێوە دەکات ((هەندێك لە بازرگانان بۆیان باسکردم کە خۆیان بەناو ئەو دەریایەدا تێپەڕیون (مەبەستمان دەریای خەزەرە)، کاتێك تەواوبووین لە باکوری بۆ کۆتاییەکەی ئاوەکە گۆڕانکاری بەسەردا هات لە ئاوێکی خوێیاوی بۆ ئاوێکی ڕەنگ جیاواز ووتیان ئەوە ڕووباری ئیشلە[4] کە تێکەڵ بووە بە دەریا، وە دەڵێن لەو ئاوەمان خواردەوە ئاوێکی خۆشبوو))[5].

هەروەکو باسکرا وڵاتی هیند یەکێکە لەو ناوچانەی زانیاری لەو بارەیەوە لە گەشتیاران و ڕێبواران وەرگیراوە، هەروەك خۆی باس دەکات ((هەندێك لە گەشتیاران باس لەوە دەکەن شاری ناکورە یەکێکە لە شارە هەرە گەورەکانی وڵاتی هیندو چوار ڕۆژ دوورە لە شاری دلهی))[6]، هەروەها باس لەوە دەکات ((هەندێك لە گەشتیاران و ڕێبواران باس لەوە دەکەن وڵاتی هیند

---

١ تقويم البلدان، ص٢.

٢ تقويم البلدان، ص٢٤٠.

٣ المصدر نفسه، ص٣٤.

٤ ئیشل: یەکێکە لە ڕووبارە درێژەکانی جیهان و (ئورال) یشی پێ دەگوترێت، سەرچاوەکەی لە وڵاتی رووس و بلغارەوەیە و دواتر بە چەند ناوچەیەکدا تێپەڕدەبێت وەکو وڵاتی خەزەر دواتر دەرژێتە ناو دەریای خەزەر (قەزوین) . القزويني : عجائب المخلوقات و غرائب الموجودات (مصر:١٩٥٦)، ص١٠٨، ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ص٤٣.

٥ تقويم البلدان، ص٣٦.

٦ تقويم البلدان، ص٣٥٣.

پێك هاتووه له سێ هەرێم، یەکەمیان دەکەوێتە لای ڕۆژئاواو بەستراوەتەوە بە وڵاتی سندو کرمان وه پێ ی دەڵێن (جزرات) دووەمیان مینیبارە، سێیەمیش ڕۆژهەڵاتی مینیبارە))[1].

هەر سەبارەت بە هیند ((هەندێك له گەشتیاران باس لەوە دەکەن دیودوورگەیەکە لەناو دەریاو خەڵکەکەی بەد ڕەفتارو دزن))[2]، بەهەمان شێوه لە چەندین شوێنی تر لە بارەی وڵاتی هیند زانیاری سەرزارەکی لە گەشتیاران و ئەوانەی سەردانیان کردووه وەرگیراوه[3].

هەرچی وڵاتی چینە بەدەر نەبووه لەو جۆرە زانیاریانە بەڵکو لەم بارەیەوە پشت بەستراوە بە زانیاری سەرزارەکی، کاتێك باس لەوە دەکات ((لەهەندێك لەو کەسانەی هاتوونەتە لامان لەو وڵاتە...))[4]، هەروەها لە شوێنێکی تر باس لەوە دەکات ((لەسەر زاری بازرگانە گەشتیارەکان زەیتون[5] (سنجو) یەکێکە لە شارە هەرە بەناوبانگەکانی چین...))[6]، بەهەمان شێوە دەڵێت : ((لەسەر زاری گەشتیاران شاری خەنساو دەلاقەی وڵاتی چینە کە بازرگانانی ئێمە پێدەکەن.. لەو درێژەی قسەکانیدا ئەوانەی کە بینیوویانە دەکەوێە باشوری ڕۆژهەڵاتی شاری زەیتوون و نیو ڕۆژ دوورە لە دەریا...))[7].

لەلایەکی تر زۆر جار وابووە زانیاری لە حاجیان وەرگرتووە لەو کاتەی سەردانی حەجی ماڵی خۆیان کردووە، هەروەکو باس لەوە دەکات ((لە وڵاتی ڕۆم شارێك هەیە بەناوی لارندە نزیکەی لە شاری قونیە[8] بە دووری یەك ڕۆژ، ئەو زانیاریەش بە تەواوی لەلای حاجیان بەدواداچوونم بۆ کرد، کاتێك لە ساڵی (٧٢١ك/١٣٢١ز) هاتبوون بەمەبەستی بەجێهێنانی حەجی ماڵی خوا...))[9].

---

١ نفس المصدر والصفحة .

٢ تقويم البلدان، ص٣٥٤.

٣ المصدر نفسه، ص ٣٥٤، ٣٥٥، ٣٥٩.

٤ المصدر نفسه، ص٣٦٢.

٥ زەیتون: یەکێکە لە شارە گەورەکانی چین، ناوی لەوەوە نەهاتووە کە زەیتونی زۆرە بەڵکو بەناوبانگە بەدروستکردنی جل و بەرگی رەنگاو رەنگ و ئاوریشم، ابن بطوطة : رحلة ابن بطوطة المسماه(تعفه النظار في غرائب الامصار وعجائب الاسفار)، (دمشق : ٢٠٠٦)، ص٤٢٣.

٦ تقويم البلدان، ص٣٦٢.

٧ المصدر نفسه، ص٣٦٥.

٨ قونیە: یەکێکە لە شارە هەرە گەروەکانی ئیسلام لە وڵاتی ڕۆم و گوری زانای گەورە ئەفلاتۆنی لێیە لەو کەنیسەی کە نزیکە لە مزگەوتی شارەکە. یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٤/ ٤١٥.

٩ تقويم البلدان، ص٣٧٨.

هەروەها دەربارەی هەندێك شوێن زانیاری لە خەڵكی ناوچەكە وەرگرتووە، كاتێك باس لەوە دەكات ((هەندێك لە دانیشتوانی ناوچەكە دەڵێن بەرگری (برگوی) یەكێكە لە شارە بچووكەكان لە وڵاتی ئەرمینیاو دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری خەلات لە دووری یەك ڕۆژ...))[1].

هەروەها لە شوێنێكی تردا باس لەوە دەكات پێیان ڕاگەیاندووم ئەوانەی لەو ناوچەیەن شاری گەنجە دوو قۆناعە ڕێ لەبەرزەعە دوورە[2]

جۆرێكی تر لە زانیاری سەر زاركی، زۆر جار لەو كەسانە وەرگیراوە كە متمانەی پێیان هەبووە هەروەكو ئەوەی باس دەكات و دەڵێت: ((پێیان ڕەگەیاندم ئەو كەسانەی بڕوام پێیان هەیە شاری و یبرین شارێكە لە یەمەن و زۆر بەزیانە، وە خەڵكی ئەو شارە وا هەست دەكەن ئەگەر یەكێك خورماكەی بخوات و ئاویشی لێ بخواتەوەو لەوێدا بنووێت بەبێ گومان تووشی تایەكی گەرم دێت))[3].

هەروەها زۆرجار نموونەی وا لە كتێبەكەدا بەدیدەكرێت لە بارەی زانیاری سەر زارەكی لەو كەسانە وەرگیراوە كە خۆیان بینیوویانە، كاتێك باس لەوە دەكات ((ئەو كەسانەی بینیوویانە شاری ئەماسیا یەكێكە لە شارە گەورەكانی وڵاتی ڕۆم و شورەو قەڵایەكی بەهێزی هەیەو هەروەها باغ و بێستان و ئاویشی زۆرە))[4]، بەهەمان شێوە باس لەوە دەكات ((ئەو كەسانەی بینیوویانە دەڵێن تۆفان شارێكە لە وڵاتی ڕۆم و قەڵایەكی جوانی تێدایە و نێوانی لەگەڵ شاری سێواس[5] دوو ڕۆژە ڕێیە))[6].

بەم شێوە ئەوانە چەندین زانیاری سەر زارەكی بوون كە ئەبولفیدا لە پاڵ سەرچاوەكانی تر سوودی زۆری لێوەرگرتوون.

**چوارەم/ سەرچاوە نادیارەكان:**

لەگەڵ ئەوەی ئەبولفیدا زۆر بە ڕوونی لە زۆربەی كتێبەكەیدا ئاماژە بەوە دەكات زانیاری لە چ جۆرە سەرچاوەیەك وەرگرتووەو سوودی لە چیەوە بینیووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێك

---

١ المصدر نفسه، ص٣٨٩.

٢ المصدر نفسه، ص٤٠٥.

٣ المصدر نفسه، ص٨٥.

٤ المصدر نفسه، ص٣٨٣.

٥ سیواس: یەكێكە لە شارە گەورەكانی وڵاتی ڕۆم بەناوبانگە بەپیتی و بەرەكەتی خاكەكەی و بەرهەمەكانی، دانیشتوانی پێكهاتوون لە موسلمان و مەسیحی، القزوینی: اثار البلاد واخبار العباد، ص٢٢١.

٦ تقویم البلدان، ص٣٨٥.

شوێن ئاماژە بە زانیاریەکان دەکات و بەبێ ئەوەی ئاماژە بە سەرچاوەکە بکات، نموونـەی لـەو جۆرەش بە چەند شێوازێك لە کتێبەکەیدا ئاماژەیان پێکراوە وەکو ئـەوەی (هەنـدێك دەڵـێن)، کاتێك باس لەوە دەکات خەڵکی عێراقی دەڵێن سـنوری خۆراسـان لـە شـاری ڕەیـەوە تـاوەکو دەرکەوتنی خۆرە، کەچی ((هەندێك دەڵێن لە چیای حولوانەوە تاوەکو دەرکەوتنی خۆرە))[1].

وە لەلایەکی تر باس لەوە دەکات خۆراسان ناوێکی لێکدراوە پێکهاتووە لە (خر) بە واتـای خۆر دێت و (سان) بە مانـای شـوێن دێـت، دەڵێـت: ((دەگوترێـت بـە مانـای خۆشـگوزەرانی دێت))[2]. بەڵام ناوبراو خۆی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە بیروڕای یەکەم ڕاسترە.

جێگای ئاماژەپێکردنە زۆرجار کە باس لە شتێك دەکات یاخود لە ناوچەیەك دەکات بـاس لە بیروڕای سەرچاوەکان دەکات لە دواتردا دەڵێت: ((دەگوترێت یاخود گوتیان یاخود دەڵێن))[3]، زیاتر لێرەدا دەکرێت بووترێت بۆیە لە دوای سەرچاوەکانەوە هێناویتی بۆ ئەوەی وا نیشان بدات بیروڕای سەرچاوەکان ڕاسترە.

هەروەها لە هەندێك شوێندا ئاماژە بەوە دەکات لەسەرچـاوەکاندا وا دەڵـێن بـەبێ ئـەوەی ناویان بهێنێ. هەروەکو باس لە شاری زمار دەکات((لـە هەنـدێك لەسەرچـاوەکان بـاس لـەوە دەکەن زمار ١٦ فەرسخ/٩٦ کیلۆمەتر دوورە لە شاری صەنعا و لە یەمەن))[4].

بەهەمان شێوە هەندێك جار ئاماژەی بە سەرچاوەی مێژوویی کردووە و ناوی نەهێناوە، بـە نموونەش باس لە شارۆچکەی حوارین دەکات لـە بـەحرین ئامـاژە بـەوە دەکـات ((لەسەرچـاوە مێژووییەکان بینیوومە یەزید لەو شارۆچکەیە بوو کاتێك هەواڵی مردنی معاویە (٤١- ٦٠ك/ ٦٦١- ٦٧٩ز) بڵاوبووەوە))[5].

---

١ تقويم البلدان، ص٤٤١.

٢ نفس المصدر والصفحة.

٣ المصدر نفسه، ص ص ٥، ٦٩،٦٠، ٧١، ٨٤، ٨٧، ٣٧٩.

٤ المصدر نفسه، ص٩١.

٥ تقويم البلدان، ص٨٣.

# تەوەرەی سێیەم

## ڕێبازی پەیڕەو کراو لە نووسینی کتێبی (تقويم البلدان)

### یەکەم / ڕێبازی لە نووسینی کتێبەکە:

کاتێك تەماشای ناوەڕۆکی کتێبەکە دەکرێت بە ڕوونی بۆمان بەدیاردەکەوێت تەواو کتێبێکی جوگرافیەو پێچەوانەی هەندێك لە کتێبەکانی تره لەو بواره کاتێك زانیاری جۆراو جۆر تیایاندا بەدیدەکرێت وەکو زانیاری هونەری و مێژوویی و ئەفسانەیی و هتد.. ئەویشیان لە ڕاستیدا زۆرجار ناگونجێ لەگەڵ خستنەڕووی زانیاری جوگرافی، لەبەرئەوە دەکرێت بوترێت ڕێبازی ناوبراو لە نووسینی کتێبی (تقويم البلدان) خاڵی دەستپێك و وەرچەرخان بوو بۆ دراسەکردن و لێکۆڵینەوەی جوگرافیای تەواو.

سەبارەت بە ڕێبازیشی لە نووسینی کتێبەکەدا دەکرێت باس لەوە بکرێت لەسەر ڕێبازی وڵاتناسانی پێش خۆی نەڕۆیشتووە کاتێك جیهانیان دابەشکردووە بۆ هەرێمی فەلەکی و ئەو بەشەی ئاوەدانە دابەش بکەن بۆ حەوت هەرێمەکە بەڵکو سیستەمێکی نوێی هێنایە کایەوە ئەویش دابەشکردنی جیهان بوو بۆ ناوچەو هەرێمە جوگرافیەکان، وە کتێبەکەشی دابەشکردووە بۆ دوو تەوەرەی قەبارە نایەکسان کاتێك تەوەرەی یەکەم کورترو کەمترە لە تەوەرەی دووەم[1].

ئەوەتا لەتەوەرەی یەکەمدا بە کوزموغرافیا[2]، واتە بە جوگرافیای گشتی دەستی پێدەکات و بەشێوەیەکی ڕێك و پێك و لە دوای یەکتر، کاتێك باس لە ڕووبەری زەوی و بەشەکانی دەکات

---

١ محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٨٩.

٢ کوزموغرافیا (Cosmography) : واتە جوگرافیا گشتی، هەڵدەستی بە دراسەکردن و لێکۆڵینەوەی هەموو لایەنەکانی زەوی، لە ڕووی شێوەو پێگەو جوڵەو دیاردەکانی و هەروەها ئەو دیاردانەی کاریگەریان هەیە بەسەریەوە، محسن عبدالصاحب، المظفر: فلسفة علم المكان (**الجغرافية**)، (عمان:٢٠٠٥)، ص٣٣،

- htt//en .wikpedia.org/wikj/cosmography.

و ئەوەی ئاوەدانە تەنیا بەشێکەو سێ بەشەکەی تر بەئاو داپۆشراوە، هەروەها باس لە هێڵی ئیستوا دەکات و زەوی دەکات بە دووبەشەوە یەکێکیان باکورو ئەویتریشیان باشور، لەلایەکی تر باس لە حەوت هەرێمەکە کراوەو ئەو یەکانی بۆ ڕووپێوکردنیان بەکاردێن وەکو فەرسخ و میل و باڵ و هەنگاو ڕۆژ و لە دواتریشدا باس لە ئاوی سەر زەوی بە هەموو جۆرەکانیەوە کراوە وەکو دەریاو دەریاچەو ڕووبارەکان و چیاکانیش[1].

لەهەمان کاتدا باسی لەو سیستەمە کردووە کە لەسەری ڕۆیشتووە لە ڕێکخستنی کتێبەکەی، کاتێك خشتەیە لە شێوەی هەڵسەنگاندن کە تێدا باس لە هەرێمی ڕاستەقینەو هەرێمی نەریتی (عورفی) ناوچەیەك یاخود مەملەکەتێکە کە چەند شوێن و وڵاتێك لە خۆیگرێت وەکو شام و عێراق هیتر، وە لە وانەیە هەندێك جار هەرێمی نەریتی بەشێك بێت لە هەرێمی ڕاستەقینەو ڕەنگە هەندێك جار بەشێك بێت لە دوو هەرێم وەکو وڵاتی شام دەکەوێتە هەردوو هەرێمی سێیەم و چوارەمەوە[2].

هەرچی تەوەرەی دووەمە زۆرترین و گەورەترین کتێبەکەیە، کاتێك بیست و هەشت هەرێم و وڵات لە خۆدەگرێت[3].

هەروەها دەربارەی دەستپێکردنی ناوچەو هەرێمەکانیش نەهاتووە وەکو هەندێك لە وڵاتناسانی پێش خۆی وەکو ئیبن خردازبە (م٣٠٠ك/٩١٣ز) و یەعقوبی (م٢٩٢ك/٩٠٥ز) مەسعودی (م٣٤٦ك/٩٥٦ز) لە عێراقەوە دەستی پێکردبێ، بەڵکو هەمان ڕێگەی ئیبن حەوقەلی گرتۆتەبەر کاتێك لە دوورگەی عەرەب دەستی پێکردووە، هۆکارەکەشی دیارە زیاتر ئایینیە، چونکە دوورگەی عەرەب ماڵی خواو گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێ) لێیە[4].

جێگای ئاماژەپێکردنە لە بارەی خستنەڕووی زانیاریش دەربارەی هەر بیست و هەشت هەرێم و ناوچەکانیش لەسەر سیستەمێکی یەکگرتوو ڕۆیشتووەو دابەشیکردووە بۆ دوو بەشی سەرەکی، لە بەشی یەکەمدا بە گشتی زانیاری خستۆتەڕوو لە بارەی شوێنگەی جوگرافی و هەرێمەکە و داب و نەریت و خوڕەوشتی دانیتشوان و گرنگترین ڕێگا و بانەکان و دووریان لە

١ تقويم البلدان، ص ص ٣- ٧٢.

٢ تقويم البلدان، ص ص٧٢- ٧٣.

٣ كراتشكوفسكي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/٣٩٢، بۆ زانینی ناوی وڵات و هەرێمەکانیش بڕوانە: ل٦٢.

٤ تقويم البلدان، ص٧٣.

یەکترەوە، وە خستنەڕووی زانیاریش لەم بەشە وەستاوە لەسەر قەبارەی هەرێم و وڵاتەکەو ئەو زانیاریانەی لەبەر دەستی ئەبولفیدا هەبوون[1].

وە لەبەشی دووەم زانیاری بەخشتە خراوەتەڕوو، کاتێك خشتەکە دابەشکراوە بۆ چەند خانەیەك لە دوو لاپەڕە بەم شێوەیەی خوارەوە:

لەلاپەڕەی یەکەمدا چەند خانەیەك لە خۆ دەگرێت و ئەو زانیاریانەی تێدا خراوەتەڕوو، لە خانەی یەکەمدا ژمارە دانراوە بۆ شارەکان، لە خانەی دووەمدا ناوی شارە ناسراوەکان هاتووە، لە خانەیەکی تردا ناوی دانەرو ئەو سەرچاوەی زانیاری لێوەرگیراوە هاتووە، لە خانەیەکی تردا کۆمەڵێك زانیاری لە خۆ دەگرێت وەکو درێژی و پانی شارەکە کە بەپێی پلەو چرکە خەملێنراوە، هەروەها لە خانەیەکی تردا ئاماژە بە هەرێمی ڕاستەقینەی شارە کراوە، وە لە خانەیەکی تردا ئاماژە کراوە بە هەرێمی نەریتی (عورفی) شارەکە، لە کۆتایی ئەو لاپەڕەیە خانەیەکی تایبەت تەرخان کراوە بۆ ڕێکخستنی ناوی شارەکە، هەندێك جار ئاماژەی بەو سەرچاوەیەش کردووە کە زانیاری دەربارەی ڕێکخستنی ناوی شارەکە لێوەرگرتووە و هەندێك جار ناوی ناهێنێ بۆ ئەوەی دووبارە نەبێتەوە[2]، دیارە ڕێکخستنی ناوەکانیش لە لایەن ناوبراو گرنگی زۆری پێدراوە.

وە لە لاپەڕەی بەرامبەریدا لە خشتەکە خانەیەکی گەورە لە خۆ دەگرێت لە ژێر ناونیشانی (وەسفکردن و باسی گشتی) کاتێك لە بارەی شارەکە زۆرترین زانیاری دەخاتەڕوو بەم شێوەیەی خوارەوە، لە ڕووی کۆنی و نوێیی شارەکە و دووری و نزیکی لە شارە بەناوبانگەکان، ئەو ڕووداوە مێژووییانەی بەسەریدا هاتووە، قەڵاو شورەی دیار ئەگەر هەبێ باسی لێوەکراوە، بوونی چیاو ڕووباری بەناوبانگ ئاماژەی پێکراوە، هەروەها دیارترین بەرهەمەکانی و ڕێگا بازرگانیەکانی، تایبەتمەندی دانیشتوانی، دروست کردنی شارەکە و هۆکارەکانی باسیان لێوەکراوە، زانیاری لە بارەی ناوەکەشی و سەرەڕای هەموو ئەوانەش ئاماژە بەو سەرچاوانە کراوە کە زانیاریان لێوەرگیراوە[3].

---

١ كراتشكوفسكي: تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١/ ٣٩٣-٣٩٤، عبدالرحمن حميدة: الاعلام الجغرافيين العرب، ص٥٣٨.

٢ محمد محمود محمدين: التراث الجغرافي الاسلامي، ص١٩١.

٣ نموونەی هەر شارێك وەربگرین لە هەر هەرێم و وڵاتیکدا، کاتێك سەیری خشتەکەی کۆتایی دەکرێت لە خانەی (وەسفکردن و باسی گشتی) ئەو زانیاریانەی تێدا خراوەتەڕوو لە کتێبەکەدا. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە نەخشەی ژمارە (٥) لە لیستی پاشکۆکان.

بەم شێوەیە ڕێبازی ئەبولفیدا لە نووسینی کتێبەکەیدا تاڕادەیەکی زۆر جیاوازی هەبووە لەگەڵ وڵاتناسانی تر بەتایبەتی بەکارهێنانی خشتە لە خستنەڕووی زانیاریەکان چیای کردۆتەوە لە وڵاتناسەکانی پێش خۆی و تەنانەت ئەوانەی دوای خۆشی.

**دووەم/ ڕەخنەگرتن لەسەرچاوەکانی پێش خۆی:**

کاتێك تەماشای ناوەڕۆکی کتێبی (تقویم البلدان) دەکرێت بە ڕوونی بۆمان بەدیاردەکەوێت کە ئەبولفیدا وەکو کەسێکی لە خۆبووەوەو بەبێ ئەوەی لە نرخی سەرچاوەکانی پێش خۆی کەمبکاتەوە ڕەخنەیان لێدەگرێت و کەم و کوڕی ناڕوونیەکانیان بەدیاردەخات، هەروەکو خۆی دەڵێت: ((دوای ئەوەی بەدواداچوونم کرد بۆ کتێبە دانراوەکان لە بارەی وڵاتان و ناوچەکان هیچ کتێبێکم نەدیت مەبەستەکانی من جێ بەجێ بکات))[١]، واتە لێرەدا دەیەوێت ئەوەمان بۆ نیشان بدات ئەو سەرچاوانەی لەو بوارەدا نووسراون شتی باشیان خستۆتەڕوو و زانیاری چاکیشیان تێدایە، بەڵام وەکو یەکێك لە تاریبەتمەندیەکانی ڕێبازی لە نووسینی کتێبەکەدا ڕەخنەیان لێدەگرێت بەتایبەتی لەو لایەنانەی کە لە بەرهەمەکانیاندا پشتگوێیان خستووە، لەلایەکی تر شارەزایی و بەهرەمەندی ئەبولفیدا نیشاندەدات لە بواری جوگرافیا، لەبەرئەوەی ئەگەر تەواو شارەزایی نەبوایە لەم بوارەدا نەیدەتوانی لەسەرچاوەکانی پێش خۆی بگرێت.

بەهەمان شێوە ڕەخنە لەسەرچاوەکانی پێش خۆی دەگرێت، بەتایبەتی ئەوانەی درێژی و پانی وڵات و شارەکانیان خستۆتەڕوو و بەو شێوەیە باسیان لێوە دەکات ((ئەو کتێبانەی دەربارەی درێژی و پانی نووسراون هەندێك جار هەڵەیان کردووە بە شێوەیەك زۆر ناوچەو شار لە هەرێمی خۆی دانەنراوە بەڵکو لە هەرێمێکەوەخستراوەتە هەرێمێکی تر))[٢]، بەڵام ئێمە چاوپۆشیمان لەم لایەنە نەکردووەو بەڵکو هەر ناوچەو شارێك لە هەرێمی خۆی دانراوە.

هەروەها لە بارەی ئەو ناوچانەی کە لەسەرچاوەکاندا زانیاری کەمە یاخود ئەگەر هەشبێ بەدواداچوونی بۆ نەکراوە هەوڵیداوە لە ڕێگای ترەوە زانیاری لە بارەیانەوە کۆبکاتەوە وەکو وەرگرتنی زانیاری لە گەشتیارو ڕێبوارو بازرگانان بەتایبەتی ئەوانەی خۆیان سەردانی ناوچەکانیان کردووە، هەر بۆیە هەوڵیداوە لە بارەی ئەو ناوچانە ئەگەر زانیاری تەواویش نەبێ و کەم و کوڕیشی هەبێ شتێك لە

---

١ تقويم البلدان، ص١.

٢ المصدر نفسه، ص٩- ١٠.

بارەیانەوە بخاتەڕوو بەو شێوەیەی خۆی باس دەکات ((هەرشتێك هــەموو شــتێکی دەربــارەی نــەزانرێت نابێت وازی لێ بهێنرێت، چونکە زانینی بەشێکی باشترە لە نەزانینی گشتی)).

سەرەڕای ئەوەی ڕەخنەیان لێدەگرێت، هەوڵیداوە بەپێی شارەزایی خۆی و ئەو زانیاریانەی کە دەستی کەوتوون هەڵەو کەم کوڕیەکانیشیان چارەسەربکات، ئەوەتا لە زۆر شوێن لە کتێبەکە نموونەی لەو شــێوە بەدیاردەکەوێت هەوڵیداوە هەڵەکان چاکبکاتەوە هــەروەکو ئامــاژە بــەوە دەکــات لــە کتــێبی قــانونی مەسعودی (بەیروونی) هاتووە تەبووك دەکەوێتە وشکایی عەلی و هاوتەریبە لەگەڵ شاری مەدین، بەڵام من دەڵێم : ((تەبووك دەکەوێتە ڕۆژهەلات و مەدین دەکەوێتە رۆژئاوا))[1]، هەروەها لە شــوێنێکی تــردا ئاماژە بەوە دەکات ئیبن حەوقەل دەڵێت شاری حیجەر دەکەوێتە چیاکان و یەك ڕۆژە ڕێ دوورە لــە وادی قورا (وادی القری)[2]، بەڵام لە ڕاستیدا زیاتر لە پێنج ڕۆژ لێوەی دوورە[3].

بەهەمان شێوە باس لەوە دەکات ئیبن ئەلئەثیر لــە کتــێبی (اللبــاب) بــاس لــەوە دەکــات ((ئەرزن شارێکە لە دەڤەری بەکر، ئەوەش وەکو ئەوە وایە هەرگیز ڕووینــەدابێ بــەڵکو ئــەرزن شارێکە دەکەوێتە دەوروبەری وڵاتی ئەرمینیا))، هەروەها لەسەرچاوەکاندا دەگوترێت دەرگــای ئەسکەندەروونە شارێکە لەسەر کەناری دەریای ناوەڕاست و نزیکە لە شاری ئەنتاکیە، بەڵام لــە ڕاستیدا دەربەندێکە بۆ وڵاتی سیس نەوەك شارو گوند[4].

لەلایەکی تر زۆرجار ئەبولفیدا خۆی یەکلاکردۆتەوە بەوەی خۆی داوەتە پاڵ یەکێك لە وڵاتناسان، واتە زیاتر جەختی لەسە ربیروڕاکانی ئەو کردۆتەوە، لە بارەیــەوە نموونــەی ئــەوە دەهێنێتــەوە کــەوا ڕووباری سەیحون بیروڕای جیاواز لەبارەیەوە بەدیدەکرێت بەڵام ئەوەمان وەرگرتووە کــە ئــیبن حەوقــەل

---

١ تقويم البلدان، ص٨٧.

٢ وادی قورا (وادی القری): ئەو چەمە دەکەوێتە نێوان شاری مەدینە و وڵاتی شام وە خۆی لە دەوروبەری شاری مەدینەیە و گوندی زۆرە لە سەردەمی پێغەمبەر (دوری خوای لێبێ) بەشەر فــەتح کــرا لــە ســاڵی حەوتــەمی کۆچی/ ٦٢٨زایینی. ياقوت الحموی: معجم البلدان، ٥/ ٣٤٥.

٣ تقويم البلدان، ص٨٩.

٤ المصدر نفسه، ص٣٩٥.

دەڵێت، چونکە خۆی بینوویەتی[1]، بەهەمان شێوە لە بارەی شاری ئەردەبیل[2] ئامـاژە بـە کۆمـەڵێك سەرچاوە دەکات بەڵام ((ئەوەی ئەلموهەلەبی دەڵێت لە زۆربەیان ڕاسترە))[3]

هەروەها لە بارەی هەندێك ناوچەش، کاتێك بـیروڕای وڵاتناسـانی خسـتۆتەڕوو زانیـاری مێـژووی خۆشی خستۆتەسەر، هەروەکو ئەوەی باس لە شاری صومنان لە هیند دەکات و دەڵێت:

((بەشێکە لەو ناچانەی فەتح کرا وە لەسەر دەستی مەحمود کوڕی سبکتکین[4]))[5].

بەم شێوەیە ڕێبازی ئەبولفیدا لە نووسینی کتێبەکەیدا بەرەخنەگرتن لەسەرچاوەکانی پێش خـۆی دەست پێدەکات، وە هەوڵیداوە کتێبەکەی کورتکراوەی سەرچاوەکانی پـێش خـۆی بـێ لـەو بـوارەو سەرجەم هەڵەو کەم و کوڕیەکانیان چارەسەربکات، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بەتـەواوی نـەیتوانی لـەم هەواڵەیدا سەرکەوتووبێ چونکە لە ڕاستیدا کتێبەکەی ئەویش بەدەر نیە لەکەم و کوڕی.

**سێیەم/ بەراوردکاری و هاوسەنکاری و لەیەکچواندن:**

یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندیەکانی ڕێبازی ئەبولفیدا لە خستنەڕووی زانیاریـەکان و زیـاتر ڕوونکردنەوەیان، ئەوەش لێرەدا ئەوەمان بۆ بەدیار دەخات کەوا چـەندە شـارەزایی هـەبووە لـە بواری جوگرافیا، کاتێك توانیوویەتی دیارە هاوشێوەکان لەیەکار بچووێنی و بەراوردیان بکـات بەتایبەتی ئەوانەی بەیەك هۆکار دروست دەبن و دێنە ئاراو یـاخود ئـەو دیاردانـەی تـەواو لـە یەکتر دەچن، نموونەی لەم جۆرەش لە چەندین شوێن لە کتێبەکەیدا بوونیان هەیە دەکرێـت بـەو شێوەیەی خوارەوە بیانخەینەڕوو.

---

١ المصدر نفسه، ص٢٥٥.

٢ المصدر نفسه، ص٦١.

٣ ئەردەبیل: یەکێکە لە شارە هەرە گەورەکانی ئازربیجـان، شـارێکی قـایم و دەوروەی بەشـورا دەوورەدراوە و ئاوهەوایەکی ساردی هەیە لە زستاندا، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٧- ٢٨٨.

٤ تقویم البلدان، ص٢٩٩.

٥ محمود کوڕی سبکتکین: سوڵتان مەحمودی غەزنەوی لە ساڵی (٣٨٨ك/ ٩٩٨ز) دوای زالبـوونی بەسـەر ئیسـماعیل برای توانی جلەوی دەسەڵات بگرێتە دەست و سنوری دەوڵەتەکـەی بـاوکی فـراوان بکـات بەشـێوەیەك تـوانی دەسـت بەسەر زۆر لە ناوچەکانی ماوراو نەهرو سجستان و وڵاتی غور و خوارزم دابگرێت، ئەوە سەرەڕای ئەوەی چـەند جارێـك هەڵمەتی کردە سەر وڵاتی هیندو توانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەبەشێکی زۆر لـە ناوچـەکانی هینـد بڵاوبکاتـەوە، لـە ساڵی (٤٢١ك/ ١٠٣٠ز) کۆچی دوایی کرد دوای ئەوەی بۆ ماوەی سی و یەك سـاڵ حـوکمی کـرد. حمـدالله المسـتوفی القزوینی: تاریح گزیدە، باهتمام: عبدالحسن نوائی، (تهران: ١٣٦٢هـ.ش) ص ص ٣٩٠- ٣٩٧.

ئەوەتا لە بارەی ڕووباری ئیشبیلە باس لەوە دەکات لە ئەندازەو قەبارەی ڕووباری دیجلەیەو یەکێکە لە ڕووبارە گەورەکانی ئەندەلووس و بەچەندین شوێندا دەڕوات، هەروەها دەڵێت: ((ئەو ڕووبارە لە دەریاوە تووشی هەڵکشان و داکشان دەبێت وەکو ڕووباری دیجلە لەبەسرە))[1].

هەروەها لە بارەی ڕووباری جەیحون ئاماژە بەوە دەکات ((ئەو ڕووبارە لە گەورەیا نزیکە لە ڕووباری فورات))[2]، کاتێك هەردوو ڕووبار بە چەندین ناوچە تێپەڕدەبن.

بەهەمان شێوە لە بارەی ڕووباری مەهران (سند) باس لەوە دەکات ڕووبارێکی گەورەو ئاوی شیرینە لە ڕووباری نیل دەچێ لە میسر کاتێك گیانەوەری تیمساحی تێدایە ئاوەکەی، هەروەها لەو کاتەی بەرزدەبێتەوە کەشتی پێدا گەشت دەکەن و لەو کاتەی دەنیشتێتەوە کشتوکاڵ و کاری ئاودێری پێدەکرێت[3]، لەوەشیان نموونەیەکی بەراوردکاری زیندوو نیشان دەدات لەو کاتەی تووشی لاو و نیشتنەوە دەبێت هەردوو ڕووبار سوودی زۆریان لێوەدەگیرێت لە کاری کەشتیوانی و پڕۆژەو کرداری ئاودێریدا.

هەروەها لە بارەی ڕووباری سەلف[4] باس لەوە دەکات ((ڕووبارێکی گەورەیە کاتێك ڕووبارەکانی تر کەم دەکەن ئەو زیاد دەکات هەروەك ڕووباری نیل لە میسر))[5]، وە لە شوێنێکی تر ئاماژە بەوە دەکات ((شاری صەنعاو یەکێکە لە شارە هەرە گەورەکانی یەمەن و لە دیمەشق دەچێ لە ڕووی زۆری ئاو و دار و درەختەکانی))[6].

هەرچی شاری فاسە[7] بەو شێوەیە باسی لێوە دەکات ((لە نێو چەند شارێکدایە و خۆش و ئاوەدان و بەخێرو بێرە وەکو شاری دیمەشق وایە لە وڵاتی شام))[1].

---

١ تقويم البلدان، ص٣٥٧.

٢ المصدر نفسه، ص ص ٤٦- ٤٧.

٣ تقويم البلدان، ص٥٠.

٤ تقويم البلدان، ص٦٢.

٥ ئەبولفیدا خۆی زانیاریەکی ئەوتۆ لە بارەیەوە نادات بەدەستەوە، بەڵام ئیبن سەعیدی مەغریبی (٦٨٥ك/ ١٢٨٦ز) باس لەوە دەکات ((ئەو ڕووبارە نیلی حەبەشەی پێدەڵێن کە لە ناوچەی کزلەیە لە وڵاتی حەبەشەو وەکو رووباری نیلی میسر وایە لە کاتی کەمبوونەوەی ڕووبار زیاد دەکات)). بسط الارض في الطول والعرض، تحقيق: خوان قرنيط، (تطوان:١٩٥٨)، ص٤٥.

٦ تقويم البلدان، ص٦٦.

٧ المصدر نفسه، ص٩٥.

لەلایەکی تر کاتێك باس لەشاری قابس[2] دەکات دەڵێت: ((وەکو شاری دیمەشق وایە لە شـام لەلای باشوریەوە دوو ڕووبار لەچیاوە بۆی دێت))[3].

بەهەمان شێوە لە نموونەیەکی تری بەراوردکاریدا باس لەوە دەکات ((مەقادیشو شارێکە لە حەبەشەو دەکەوێتە سەر دەریای هیندی و دانیشتوانی موسلمانن، ڕووبارێکی گـەورەی تێدایـە زۆر لە ڕووباری نیل دەچێ لە میسر کاتێك لە هاویندا زیاد دەکات))[4].

هەروەها لە بارەی شاری ئازور لە وڵاتی سند جەخت لەسەر ئەوە دەکات ((ئەو شارە نزیکە لە شاری مولتان[5] لە گەورەیا))[6].

بەو شێوەیە دەکرێت باس لـەوە بکرێـت ئامـانجی ئەبولفیـدا لـەم جـۆرە کـرداری بـەراوردکاری و هاوسەنکاریانە بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر لە زانیاریەکان تێبگاو دیاردە هاوشێوەکانی جیهانیش بناسێ.

**چوارەم / باسنەکردنی دیاردەو شتی ئەفسانەیی:**

یەکێکی ترە لە تایبەتمەندیەکانی ڕێبازی ئەبولفیدا لە نووسینی کتێبی (تقويم البلـدان)، نـەهاتووە باس لـە شـتی ئەفسـانەی و دوور لـە ڕاسـتی بکـات وەکـو هەنـدێك لـە وڵاتناسـانی پـێش خـۆی[7] لەبەرهەمەکانیاندا زۆر بابەتی ئەفسانەیی ودوور لە ڕاستیان تێدا خراوەتـەڕوو، ئـەوەش وایکـردووە لـە

---

١ فاس: یەکێکە لە شارە بەناوبانگە و گەورەکانی وشکایی مەغریب لە وڵاتی بەربەر، وە ئەو شارە بەناوبانگـە بە زۆری رووبارەکانی . ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٢٣٠.

٢ تقويم البلدان، ص ١٢٣.

٣ قابس: شارێکە لە دەوروبەری ئەفریقیاو دەکەوێتە نێوان تەرابلس و سەفاقس، شارێکی بەخێرو بێرەو بەرهەم و دارو ئاویشی زۆرە، ياقوت الحمويي: معجم البلدان، ٤/ ٢٨٩.تقويم البلدان، ص١٤٣.

٤ المصدر نفسه، ص١٦١.

٥ مولتان: شـارێکی گەورەیـەو پایتـەختی وڵاتـی سـندە، هـەروەها شـوێنی نیشـتەجێ بـوونی فـەرمانڕەواو کاربەدەستانی ئەو وڵاتەیە ابن بطوطة: رحلة ابن بطوطة، ص٢٧٢.

٦ تقويم البلدان، ص٣٤٧.

٧ بەنموونە: ئیبن فەقیهی هەمەدانی (م کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەکی زاینی) لـە کتـێبی (البلـدان) زۆر برژاوەتە سەر ئەو جۆرە بابەتانەوە. بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی بڕوانە: حكيم احمد مام بكر: الكـرد وبلادهـم عند البلدانيين والرحالة، ص ص ٣٦- ٣٧.

نرخی زانستی کتێبەکانیان کەمبکاتەوە، وە ئەبولفیداش لەلایەن خۆیەوە زیاتر زانیاریە جوگرافیەکانی خستۆتەڕوو و نەپڕژاوەتە سەر زانیاری هونەری و مێژوویی و جوگرافی و ئەفسانەیی[1].

سەرەڕای ئەوەش لە هەندێك شوێن لە کتێبەکەدا ئاماژە بە هەندێك شتی سەیر کراوە هەروەکو ئەوەی ولاتی فارس کاتێك باس لەوە دەکات ((یەکێك لە شتە سەرسوڕهێنەرەکانی ولاتی فارس قولکەیەك (بیر) ئاوی هەیە لە یەکێك لە کورە[2]کانی کە ناسراوە بە (هندیجان) لە نێوان دوو چیاوە لەم بیرە دووکەڵێك هەڵدەستێ کەس ناتوانێ لێی نزیك بێتەوە، ئەگەر باڵندەیەك یاخود شتێکی لەو جۆرە بەسەریا بڕوات یەکسەر بەردەبێتەوەو دەسوتێ))[3]، بە هەمان شێوە باس لەوە دەکات ((لە ناحیەی (داذین) لە ولاتی فارس ڕووبارێکی ئاو ترسناك و ئازاردەر هەیە ناسراوە بە ڕووباری (ئەخشین) ئەگەر لێی بخۆێتەوە یەکسەر بەردەبێتەوە سەر زەوی، وە ئەگەر جل و بەرگی پێ بشۆیت ڕەنگی سەوز دەبێت))[4].

هەرچەندە لێرەدا باس لەو شتانە دەکات، بەلام لە هەمان کاتدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە لەسەرچاوەکانی وەرگرتووە بەبێ ئەوەی بزانێ ڕاستە یاخود نا[5]، ئەوەش ئەوەمان بۆ بەدیاردەخات خۆشی گومانی لەو جۆرە شتانە هەبووە لەبەرئەوەی بە چاوی خۆی نەبینیووە بۆ ئەوەی ڕاستی و دروستی بەدیاربخات و لە هەمان کاتدا زۆر بە کەمی خراوەتە سەر ئەو جۆرە بابەتانەوە بەڵکو هەر باسیان ناکات.

---

١ محمد کامل عیاد: ابو الفداء الملك العلامة، ص٥٦.

٢ کورە: زاروەیەکی فارسیە، رووبەرێکی لە زەوی پێکهاتبێ لە چەند گوندێك لە دەوری شارێکدا یاقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٣٦- ٣٧.

٣ تقويم البلدان، ص٣٢٣.

٤تقويم البلدان، ص٣٢٣.

٥ نفس المصدر والصفحة.

# بەشی سێیەم

## هەرێمە کوردنشینەکان لە کتێبی (تقویم البدان)

بەچاوخشانێك بەسەرچاوە جۆربەجۆرەکانی مێژوو و جوگرافیا، بۆمان ڕوون دەبێتەوە بە دەگمەن لەسەر ڕووی ئەم زەویە ولاتێك هەبێ چ لە مێژووی کۆندا وەچ لە مێژووی تازەدا بە قەدەر کوردستان سنوری ڕامیاری نادیارو ئالۆزو پڕ لە گێروگرفت و هەمیشە لە گۆڕاندابێت، دیارە ئەوەش زیاتر لەبەرئەوە بووە کورد دەوڵەتێکی یەکگرتووی سەربەخۆی نەبووە بەتایبەتی لە مێژووی ئیسلامی، ئیتر هەر ئەوەش بۆتە هۆکار بۆ ئەوەی نەتوانرێت بە ئاسانی ئەو هەرێمانە دیاریبکرێت کە دەکەونە چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەوەو لە هەمان کاتدا بۆتە هۆکار بۆ ئەوەی لە ماوە دیاریکراوەکاندا لە چوارچێوەی سنوری دابڕبکرێت و لە هەموو لایەکانی خاکی دەستی بەسەردابگرێت[1].

هەروەها مەبەستمان لە کوردستان ولاتی کوردە، هەرچەندە ئاماژەمان پێکرد دەوڵەتێکی سەربەخۆ نەبووە لەڕووی ڕامیاری سنورێکی دیاریکراوی خۆی هەبێ و لەڕووی مرۆڤیش خەڵکانی تر لەگەڵیاندا ژیاون، بەلام زۆرینەی هەرە زۆری ولاتی کورد لە کوردان بوون[2].

جێگای ئاماژەپێکردنە زاراوەی کوردستانمان بۆیە بەکارهێناوە لە جیاتی هەرێمە کوردنشینەکان، لەبەرئەوەی لەسەردەمی ئەبولفیدا (م٧٣٢ك/ ١٣٢١ز) بوونی هەبووەو نامۆ نەبووە، بەڵکو حەمەدوڵلای مستەوفی قەزوینی (م٧٥٠ك/١٣٤٩ز) باس لەوە دەکات لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی کۆچی /دوانزەی زاینی سوڵتان سنجر کوڕی مەلیکشای سەلجوقی (٥١١- ٥٢٢/ ١١١٧- ١١٥٧ز) بەشی ڕۆژئاوای هەرێمی چیای بۆ خۆی دابڕی، واتە ناوچەکانی کرمانشاو دەوروبەری و ناوی نا (کوردستان) کە شانزە شارو شارۆچکەی لە خۆدەگرت، دواتر کوڕە براکەی خۆی سلێمان شا کوڕی محەمەد کوڕی مەلیشکای لەسەردانا و لە دواتریشدا لە شوێنی مامی بووە فەرمانڕەوای بنەماڵەی

---

١ محسن محمد حسن: نناشد صلاح الدين، ص٢٣.

٢ باسيلى نيكيتين: الكرد دراسة سوسيولوجية و تاريخية، تقديم : لويس ماسينون، نقله من الفرنسية و علق عليه: نورى طالبانى، (بيروت:٢٠٠١)، ص٦٩.

سەلجوقییەکان لەنێوان ساڵانی (٥٥٤- ٥٥٦ك/١١٥٩- ١١٦٠ز) حوکمی کردووەو قەڵای بەهاری باکوری ڕۆژئاوای هەمەدانی کرد بە بنکەی دەسەڵاتی خۆی[١].

ئیتر ئەوەش بووە شتێکی باو لە نێوان توێژەران و لێکۆڵەرەوان کە مێژوونووس و وڵاتناسی فارسی مستەوفی قەزوینی لە کتێبی (نزهە القلوب) یەکەمین کەسە زاراوەی کوردستانی بەکارهێناوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو یەکەم کەس نەبووە، بەڵکو لە نووسراوەکانی مێژوونووس و گەڕیدەکان دەیان ساڵ پێش ناوبراو ئەو زاراوەیان بەکارهێناوە، ئەوەتا گەڕیدەی ئیتاڵی مارکو پۆڵۆ (٧٢٣ك/ ١٣٢٣ز) دەستیکردووە بە گەشتێك بۆ هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات لە ساڵی (٦٧٠ك/ ١٢١٧ز) ناوی کوردستانی هێناوە[٢]، هەروەها مێژوونووسی مەغۆلیش ڕەشیدەددین فەزلوڵڵای هەمەدانی (م٧١٨ك/ ١٣١٨ز) لە کتێبەکەی کە تایبەتە بە مێژووی مەغۆلەکان زیاتر لە جارێك ناوی کوردستانی هێناوە[٣]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی کە پێش ئەو مێژوونووس و گەڕیدانەش کەسانی تر هەبوون زاراوەی وایان بەکارهێناوە هەمان واتای کوردستان دەگەیەنێ[٤].

بەم شێوەیە زاراوەی کوردستان بوونی هەبووە لەسەردەمی ئەبولفیدا بەڵام لە کتێبەکەیدا بەهیچ شێوەیەك ناوی نەهێناوەو باسی نەکردووەو بە هەمان ڕێچکەی وڵاتناسی پێشووتر باسی لە هەرێمەکان کردووە، هەر بۆیە لێرەدا وامان بە باشی زانی باس لەو هەرێمانە بکەین کە کورد تێدا ژیاوەو لەلایەن وڵاتناس و سەرچاوەکانی تریش باسیان لێوەکراوە.

لەلایەکی تریش ئەو ناوچە کوردیانە سنورێکی دیاریکراویان نەبووە، بەڵکو دابەش کراوە بەسەرچەند هەرێمێك لە پاڵ کورد نەتەوەکانی تریش ژیاون وەکو فارس و عەرەب و تورك و ئەرمەن و سریان[٥]. لەبەرئەوە دیاریکردنی سنوری کوردستان لە ڕووی نەتەوەیی کارێکی ئاستەمە، بەڵام بەرەچاوکردنی فاکتەری سروشتی و جوگرافی، هەرێمە کوردنشینەکان لە کتێبی (تقویم البلدان) بەم شێوەیەی خوارەوە دەخەینە ڕوو.

---

١ نزهة القلوب، بسعي واهتمام وتصحيح: گای ليسترانج، (تهران:١٣٦٢)، ص١٠٧.

٢ رحلات ماركوبولو: ترجمها الى الانجليزية: وليم مارسدن، ترجمها الى العربية: عبدالعزيز جاويد، (مصر :١٩٩٥)، ١/ ٤٥.

٣ جامع التواريخ، الترجمة العربية، (القاهرة:د.ت)، ١/ ٢٦١- ٢٦٢.

٤ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی هاتنی زارەوەی کوردستان لەسەرچاوەکانی پێشووتر بڕوانە: زرار صديق توفيق: كردستان في القرن الثامن الهجري دراسة في تاريخها السياسي والاقتصادي، (اربيل:٢٠٠١)، ص ص ٣٧- ٣٨، زنار عبدالسلام عبدالحكيم: ابن العبري مصدرا لدراسة تاريخ الكورد، (دهؤك:٢٠٠٧)، ص ص ١٤٣- ١٤٦.

٥ فرست مرعي: الامارات الكردية في العصر العباسي الثاني (٣٥٠- ٥١١هـ/ ٩٦٠- ١١١٧م)، (دهوك:٢٠٠٥)، ص٣٣.

# تەوەرەی یەکەم

## سورشتی جوگرافیایی کوردستان

سەبارەت بە سروشتی جوگرافیای کوردستان تێبینی ئەوە دەکرێت زۆرێك لە ناوچەکانی پێك هاتووە لە زنجیرە چیا بەرزو سەرکەش و بڵندەکان، لە پاڵ ئەو چیایانەش چەندین دەشت و ناوچەی هەلدێرو دۆڵای کە دەورەدراون بە بان و زنجیرە چیا بە چیا بوو نایان هەبووە[1]، لە هەمان کاتدا لەبەربوونی ژمارەیەکی زۆر لە چیا سەرچاوەی ئاویشی تێدا زۆربووە کە زیاتر خۆیان دەبینیەوە لە ڕووبار و دەریاچەکان، هەربۆیە تێبینی ئەوە دەکرێت سروشتی جوگرافیایی ناوچەکانی جۆراو جۆرە، لەبەرئەوە لێرەدا ئاماژە بەدیارترین سیماو ڕواڵەتە سروشتیەکانی کوردستان دەکەین بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەکەم/ چیاکان:**

چیاکان بەشێوەیەکی بەربڵاو بوونیان هەبووە لە کوردستان بەشێوەیەك ئەبولفیدا لە بارەی ڕۆژئاوای هەرێمی چیا کاتێك پشتی بەستووە بەسەرچاوەکانی پێش خۆی ئاماژە بەوە دەکات ((زۆرینەی وڵاتی چیا پێکهاتووە لە چیا بەرزو سەرکەشەکان، تەنیا لە نێوان هەمەدان و بۆ شاری ڕەی و لەوێشەوە بۆ قووم نەبێ کە چیا تێدا کەمە))[2].

---

١ سوادي عبد محمد الرويشدي: الاحوال الاجتماعية والاقتصادية في بلاد الجزيرة الفراتية خلال القرن السادس الهجري / الثاني عشر الميلادي، (بغداد:١٩٨٩)، ص٢١٩.

٢ الاصطخري: المسالك والممالك، تحقيق : محمد جابر عبدالعال، مراجعة: محمد شفيق غربال، (القاهرة:١٩٦١)، ص١١٩، ابن حوقل، صورة الارض، ص٣١٥، تقويم البلدان، ص٤١١.

دیارە لەو هەرێمەدا ژمارەیەکی زۆر لە چیا بوونی هەبووە، بەڵام ئـەوەی تێبینـی دەکرێـت ئەبولفیدا چیاکانی ئەو هەرێمەی بەیەکەوە باسکردووەو تەنیا چیای بێستون نەبێ کە بە تـەنیا باسیکردووە، لە بارەی چیاکانی تریش باس لەوە دەکات کە زنجیرە چیایەك لە باکورەوە دێتە ناو ئەو هەرێمەو دەبێت بە دووبەش، یەکێکیان بەرەو باشور دەڕوات و درێژدەبێتەوە تاوەکو نزیـك حولوان، دواتر لاردەبێتەوە بەرەو ڕۆژهـەڵات بـۆ نێـوان کرمانشـاو دینـەوەر لەوێـدا چـیایەك دەردەچێت لە نێوان حولوان و دینەوەرو دەوری دینەوەری داوە، دواتر هەمان چیا درێژدەبێتـەوە بۆ ڕۆژهەڵات بۆ شاری ساوە، دوای ئەوەی شـاری هەمـەدان دەبـڕین لـەلای بـاکوری دووبـارە چیایەك دەردەچێت لەنێوان هەمەدان و دینەوەرو دەوری هەمەدانی داوە، لەلای هەمەدان بەشی دووەکی ئەو چیایە درێژدەبێتەوە لە چیای حولوانەوە بەرەو باکور تێپەرش دەبێـت و بـەباکوری شارەزوور تاوەکو شاری ئەرزن[١].

هەروەکو باسکرا گشت چیاکانی پێکەوە باسکردووە، بەڵام لەسەرچاوەی دیکە تێبینی ئەوە دەکرێت هەندێك لەو چیایانە ناویان هاتووە بە جۆرێك ئەو چیایەی دەوری هەمەدانی داوە پێـی دەگوترێت چیای (ئاروند)[٢]، ئەو چیایە داروباری زۆر بـووە هـەر بۆیـە بـە ((چـایەکی سـەوزو گەشاوەو جوان)) باسی لێوەکراوە[٣].

هەروەها ئەو چیایەی دەکەوێتە نێوان کرمانشاو دینەوەر لەسەرچاوەکاندا بـە چـیای (سـن سمیرە) ناوی هاتووە[٤].

هەرچی چـیای بێسـتوونە، ئـەوا نـاوبراو بـەو شـێوەیە باسـیکردووە ((یەکێکـە لـە چـیا ناسراوەکانی هەرێمی چیاو بەرزو بڵندەو ئاستەمە بگەیتە لوتکەکەی، لەسەرووی بۆ خوارەوەی

---

١ تقويم البلدان، ص٧٠.

٢ القزويني: عجائب المخلوقات وغرائب الموجودات، ص٩٨.

٣ القزويني: اثار البلاد واخبار العباد، ص٣٤٢.

٤ سهراب: كتاب عجائب الاقاليم السبعة الى نهاية اعتنـى بنسـخة وتصـحيحة: هـانس فـون مـڤزيك (ڤيـنـا:١٩٢٩)، ص١١٤، سەبارەت بە ناویشی یاقوتی حەمەوی باس لەوە دەکات ((لەو کاتەی سوپای موسلمانەکان بـەرەو نەهاوەنـد دەڕۆیشتن بەلای چیایەکی بەرزدا تێپەڕین کە دەیڕوانیە سەر چیاکانی تر، یەکێکیان گووتی دەڵـێ (ددانـەکانی سمـیرە) یە، سمیرە ئافرەتێك بوو لە کۆچکردووەکانی خانەوادەی معاویەی کوڕی سەعلەبە، یەکێك لە ددانەکانی کەڵ بـوو بـوو، هەر بۆیە ناوی ئەو چیایە بەو ناوەوە ناونرا، معجم البلدان، ٣/ ٢٦٩.

چیایەکی لێژەو لووسەو لەسەر پشتی ئەشکەوتێك هەیەو کانی ئاوی تێدایە، وە لە ناو ئەشکەوتەکە وێنەی کیسرا و شیرینی تێدایە))[1].

لەلایەکی دیکە ناوی هەندێك چیای تر لەو هەرێمەدا هاتووەو ناوبراو ئاماژەی پێنەکردووە، وەکو چیای (الخرمدینیە) کە دەکەوێتە لای چەپی ڕێگای نێوان قەسر شیرین و حولوان[2].

هەروەها چیای نەهاوەند یەکێکە لە چیا دیارەکانی ئەو هەرێمە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری نەهاوەند[3]

شایەنی باسە ئەبولفیدا وەکو بەشێك لەو هەرێمەدا باسکردووە، هەربۆیە دوو چیاش دەکەوێتە ئەو ناوچەیەوە، یەکێکیان چیای (شعران)ە، لەبەر زۆری دارەکانی وای پێگوتراوە[4]، ئەویتریان چیای (زلم)ە[5].

لەبارەی هەرێمی جەزیرەش ئەبولفیدا لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بەچەند چیایەك کردووە، بەشێوەیەك یەکێك لە چیا دیارو بەناوبانگەکانی ئەو هەرێمە چیای جودیەو لە بارەیەوە ئاماژە بەوە دەکات ((نزیکە لە جەزیرەی ئیبن عومەر و لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەوەیە لەسەرووی موسڵ))[6].

دیارە هەر کاتێك باس لەو چیایە دەکرێت چیرۆکی پێغەمبەر نوح (خوا لێی رازی بێت) دێتەوە یادمان کاتێك تۆفانە بەناوبانگەکە ڕوویداو کەشتیەکەی لەسەر چیایە گیرساو وەستا،

---

١ تقويم البلدان، ص٧١، سەرچاوەکانی تریش باسیان لێوە کردووەو دەڵێن دەکەوێتە نێوان هەمەدان و حولوان، لە قسەکانی تریشیان هەمان بۆچوونی ناوبراویان هەیە، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣٠٦، المقديسى : احسن التقاسيم، ص٢٩٨، القزوينى: اثار البلاد، ص٣٤٢.

٢ ابن رستة: الاعلاق النفسية، (بيروت:١٩٨٨)، ص١٥٠، بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی بڕوانە: المقدسيى: احسن التقاسيم، ص٢٩٨.

٣ القزوينى: اثار البلاد، ص٣٤٦، وينظر ايضا كتابه، عجائب المخلوقات، ص١٠٧.

٤ ابن الفقية: مختصر كتاب البلدان، (بيروت:١٩٨٨)، ص١٢٥.

٥ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٣٧٥. ئەو چیایە لە کاتی ئێستادا پێی دەگوترێت (کژەی زەڵم) کە تێدا جۆرە دانەویلەیەك هەیە تەنیا لە ناوچەی شارەزوور دەڕوێت. بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی بڕوانە: حسام الدين النقشنبدى: الكرد فى الدينور وشهرزور، ص٦٤.

٦ تقويم البلدان، ص٦٩.

ئەو چیرۆکە لە قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی پێکراوە کاتێك خوای گەورە دەفەرموێت﴿ وقيل يا راض ابلغي ماءكِ ويا سماء اقلعي وغيض الماء وقضي الامر واستوت على الجودى﴾ [1] .

جێگای ئاماژەپێکردنە ئەو چیایە خۆی بەناوبانگ بووە لە هەرێمەکەدا، بەڵام بوونی چیرۆکی کەشتیەکەی پێغەمبەر نوح وایکردووە زیاتر قسەو باسی لەسەربکرێت و لە سەرچاوەکاندا ئاماژەی پێبکرێت[2] .

هەروەها ئاماژەی بە چیای هەکاریش کردووە لەسەرووی موسڵ[3]، دیارە ئەو چیایەش لەلایەن خۆیەوە پڕ بووە لە کوردە هەکاریەکان[4] .

چیای ماردین یەکێکی ترە لە چیاکان لەو هەرێمە بەناوبانگە بووە بە گەوهەری شووشە[5]، باس لەوە دەکرێت ئەم چیایە دەکەوێتە شاری ماردین و بەرزیەکەی نزیکەی دوو فەرسەخە/١٢ کیلۆمەتر و دووپشکی زۆر بووەو جیادەکرێتەوە لە دووپشکەکانی دیکە کە کاریگەرو بکوژن[6] .

هەروەها باس لە چیایەکی تر دەکات کە کەوتۆتە باکوری میافارقینەوە[7]، ڕەنگە مەبەستی چیای (ساتیدما) بێت کە دەکەوێتە نێوان میافارقین و سیعرت[8] .

هەرچی چیای سنجارە (شنگال) وەکو یەکێك لە چیا بە پیت و بەرەکەتان باسی لێوەکردووە[9] .

لەلایەکی تر چەندین چیای دیکە لەو ناوچەیە هەبوونەو ئەبولفیدا ئاماژەی پێنەکردوون، لە دیاترینیان چیای بارما (حەمرین) و دەکەوێتە نزیك شاری موسڵ [1] وتێدا کانی نەوت و قیر هەیە[2] .

---

١ سورة هود، الاية ٤٤.

٢ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٦، المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٢٤، الزمخشري: الجبال والامكنة والمياة تحقيق: ابراهيم السامرائي (بغداد:١٩٦٨)، ص٥٨.

٣ تقويم البلدان، ص٢٧٥.

٤ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٤٨.

٥ تقويم البلدان، ص٢٧٩.

٦ الاصطخري: المسالك والممالك، ص٥٢، الادريسي: نزهة المشتاق في ذكر الامصار والاقطار، (د.م.ت)، ص٢٢٢.

٧ تقويم البلدان، ص٢٧٩.

٨ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ١٦٩.

٩ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

چیای (طور عبدین) یەکێکی ترە لەو چیایانەو دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری داراو نەسیبین[٣]، هەروەها چیای ئامادیش یەکێکی ترەو لەو چیایانەو دەکەوێتە نزیك شاری ئامەد[٤].

لەناوچەکانی دەوروبەری موسڵیش هەندێك چیا تێدا بەدیدەکرێت. وەکو چیای (داسن) کە یەکێکە لە چیا بەرزەکان و دەکەوێتە باشوری شارەکەو لەبەشی رۆژهەڵاتی رووباری دیجلەوەیە، تێدا خەڵکێکی زۆر لە هۆزە کوردیەکانی تێدایەو پێیان دەگوترێت داسنیەکان[٥]، بە هەمان شێوە چیای (جولەمیرك) بەناوی هۆزی جولەمیرگی کراوە، چونکە ئەوان تێدا نیشتەجێبوونە[٦].

بەهەمان شێوە لە هەرێمەکانی ئاران و ئازربیجان و ئەرمینیەش ژمارەیەك چیابوونی هەبووەو لە دیارترینیان چیای (قیتق) ەو مەبەستی بەرزایەکانی قبقە (قەوقاز)، ئەو چیایە درێژ دەبێتەوە لە کەنارەکانی دەریای خەزەر (قەزوین) لە نزیك شاری باب الابواب بۆ لای باشوری، هەروەها ئەو چیایە پێگوتراوە چیای زمانەکان، لەبەرئەوەی ئەو نەتەوانەی تێدابوونە زمانیان جیاوازبووەو باس لەوە دەکرێت خاوەنی سێ سەد زمان بوونە[٧].

دیار ئەو بۆچوونە لای وڵاتناسانی پێش ئەبولفیداش باسکراوەو ئاماژە بەوە دەکەن ((حەفتاو دوو نەتەوەی جیاواز لەم چیایەدا نیشتەجێ بوونە))[٨]، ئیتر بوونی ئەو هەموو نەتەوەیەش لە شوێنێکدا وا دەکات زمانی جیاوازیان هەبێت.

هەروەها زنجیرە چیاکانی حارث و حویرث لە چیا دیاردەکانی ئەو ناوچەیەن، بە گوێرەی وتەکانی ناوبراو دەکەوێتە شاری ئەردەبیل لە ئازربیجان، ئاستەمە کەس بگاتە سەری لەبەربەرزیەکەی و بەردەوام بەفری لەسەرە، هەر لەگەڵ ئەو چیایە یەکێکی دیکەی بچووکترە کە پێدەگوترێت حویرث، لەو شارەدا هیچ چیایەك لە ئەو بەرزتر نیە[٩].

---

١ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ١٦٩.

٢ الاصطخري: المسالك والممالك، ص٥٣.

٣ سهراب: عجائب الاقاليم السبع الى نهاية العمارة، ص١١٦.

٤ ابن الفقية: مختصر كتاب البلدان، ص١٢٥، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠١.

٥ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٤٣٢.

٦ القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/ ٢٧٧، ياسيلى نيكتين: الكرد، ص٧٤.

٧ تقويم البلدان، ص٧١.

٨ القزويني: اثار البلاد، ص٥٨٠، ابن الوردي: خريدة العجائب وفريدة الغرائب(بيروت:د.ت)، ص١٥٦.

٩ تقويم البلدان، ص٧٢.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت ئەبولفیدا کەوتۆتە هەڵەوە کاتێك پێی وایە ئەو چیایە لەلای شاری ئەردبیله لە ئازربیجان، لەبەرئەوەی سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن ئەوەدوو چیایە دەکەونە هەرێمی ئەرمینیاو لە شاری دوینەوەیە کە تێدا گۆڕی پادشاکانی ئەرمەنی تێدایە، هەروەها لەبارەی ناونیشان، ئەوا باس لەوە دەکرێت لە ناوی (حویرث کوڕی عوقبەو حارث کوڕی عەمر) هاتووە، کە هەردووکیان لەگەڵ سەرکردەی موسڵمانان سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی[1] بوون لە کاتی فەتح کردنی ئەو ناوچەیە یەکەمین کەس بوون گەیشتنە ئەو چیایە، هەربۆیە بەناوی ئەوانەوە کراوە[2]، چیای (حارث) ئەراراتەوەو دوا لوتکەی ئەراراتی بچووکیش پێی دەگوترێت (حویرث)[3].

هەرچی چیای سبلان (سولانە) ئەوا دەکەوێتە رۆژهەلاتی ئازربیجان و نزیکە لە شاری ئەردبیل بە دووری دوو فەرسەخ /١٢/ کیلۆمەتر، چیایەکی بەرزو بڵندەو لوتکەکانی بە بەفر داپۆشراوە بە درێژایی ساڵ[4]، تەنانەت ئەبوحامدی ئەندەلوسی لەبەر بەبڵندی ((بە بەرزترین چیای جیهانی لە قەڵەمی دەدات))[5].

هەروەها باس لە چیایەکی تر دەکات لە باکوری خۆرئاوای دەریاچەی ورمێ، بەڵام ناوی نەهێناوە[6]، ڕەنگە مەبەستی چیای سەلماس بێت، چونکە یەکێك لە توێژەران ئاماژە بەوە دەکات تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆماندا پارێزگاری لە ناوەکەی کردووەو هەر بە سەلماس ماوە[1].

---

١ سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی: کوڕی یەزید کوڕی عەمر، ناسراوە بە ئەبوعەبدوڵڵا و عومەر، لە ماوەی ژیانیدا سەرکردەو دادوەر بووە، بەژداریکردووە لە فەتح کردنی عێراق و هەر لەوێدا نیشتەجێ بووەو لەسەردەمی عومەڕی کوڕی خەتاب (١٣- ٢٣ك/ ٦٣٤- ٦٤٣ز) کرا بە دادوەر لە عێراق، دواتر لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفان(٢٣- ٣٥ك/ ٦٤٣- ٦٦١ز) ئەرکی فەتح کردنی ئەرمینیای پێ سپێردراو لە ساڵی (٣٠ك/ ٦٥٦ز) لە شاری بلینجر کۆچی دوایی کرد . ابن سعد: الطبقات الكبرى، تحقيق: احسان عباس، (بيروت:١٩٦٨)، ٦/ ١٣١ ، ابن خياط: تاريخ خليفة بن خياط، راجعة و ضبطة وضع حواشية وفهارسه: مصطفى نجيب فواز و حكمت كشلي فواز، (بيروت:١٩٩٥)، ص٩٤، الزركلي: الاعلام، ٣/ ١١١.

٢ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٢٠٥، القزويني: عجائب المخلوقات، ص٩٩.

٣ لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية، نقله الى العربية: بشير فرنسيس و گورگيس عواد، (بيروت:١٩٨٥)، ص٢١٧.

٤ تقويم البلدان،ص٣٩٧ ، سەرضاوەکانی ثێشووتریش هەمان بۆضوونیان هەیە، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٨، القزويني: عجائب المخلوقات، ص١٠٣.

٥ تحفه الالباب ونخبة الاعجاب، (د.م.ت)، ص٢٣٤.

٦ تقويم البلدان،ص٣٩٧.

لەلایەکی تر لەو هەرێمەدا چیای دیکەش هەبووە، بەڵام ئەبولفیدا ناوی نەهێناوە، وەکو چیای (زنجقان) دەکەوێتە هەرێمی ئازربیجان و نزیکە لە شاری مەراغە، کە تێدا کانیەکی ئاوی هەیە پاك و خاوێن و شیرینە ئاوەکەی[2]، هەروەها چیای سەهەند دەکەوێتە باشووری شاری تەورێزو مەراغە، ئەو چیایە بورکاناویە و دەوڵەمەندە بە سەرچاوەی کانزیای بەنرخ[3].

**دووەم/ ڕووبارو دەریاچەکان:**

هەروەکو لە پێشتردا باسکرا لەو هەرێمانەدا ژمارەیەکی بەرچاو چیای بوونی هەبووە، بێگومان ئەوەش وایکردووە سەرچاوەی ئاوی زۆر بێت لەبەرئەوەی لە وەرزی زستاندا بەفرێکی زۆر بەسەریاندا کەڵەکە دەبێت و لەبەهار و هاویندا دەتوێتەوە و ئاوێکی زۆر پەیدا دەبێت، هەربۆیە لەو هەرێمەدا تێبینی ئەوە دەکرێت ڕووبارو سەرچاوەی ئاوی زۆربووە.

یەکێك لە ڕووبارە گەورەکانی کوردستانیش دیجلەیە، ئەبولفیدا لەلایەن خۆیەوە بەو شێوەیە باسی لێوە دەکات ((سەرەتایی دەرچوونی ئەو ڕووبارە لە باکوری میافاریقینەوەیە (واتە لە نزیك چیاکانی ئاماد لە ئەرمینیا) لە ژێر قەلایەك ناسراوە بە (ذی القرنین) لەوێدا دیجلە لە باکورو ڕۆژئاوای دەروات بۆ لای باشورو ڕۆژهەلات بە ئامەدو حسنکیف و جەزیرەی ئیبن عومەر کە دەورەی داوەو بەرەو تکریت و بەغدا و واست و بەسرە تێپەڕدەبێت تاوەکو دەڕژێتە کەنداوی فارس (کەنداوی عەرەب)[4].

بە گوێرەی وتەکانی ناوبراو لە کاتی ڕۆیشتنی ڕووباری دیجلە بە ڕێڕەوی خۆی چەند ڕووبارێکی دیکە دەڕژێتە ناویەوە. وەکو ڕووباری ئەرزن کە بە وشکانیەکانی ژەنگار تێپەڕدەبێت دەڕژێتە نێو دیجلە لە خوارووی تکریت و هەندێك دەڵێن لە سەرووی بە دوو فەرسەخ/ ١٢ کیلۆمەتر[5].

---

١ حسام الدين النقشبندي: اذربيجان، ص٤١.

٢ القزويني: اثار البلاد، ص٥٦٣.

٣ القزويني: المصدر نفسه، ص١٨٩، حسام الدين النقشبندي: اذربيجان، ص٤١.

٤ تقويم البلدان،ص ص ٥٣- ٥٥ ، سەرضاوەکانی تیَش ئەبولفیداش هەمان بؤضوونیان هەیە دەربارەی ئەو رِووبارەو شويَ،ی هەڵقولآنی و ريَرەوی رؤيشتنی. ابن خرداذبة: المسالك والممالك، تحقيق: محمد مخزوم، (بيروت:١٩٨٨) ص١٤٩، المقدسي: احسن التقاسيم، ص ص ٢٤- ٢٥، القزويني: عجائب المخلوقات، ص١٠٩، الانصاري: نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، (بيروت:١٩٩٨) ص١٢٧.

٥ تقويم البلدان، ص٥٥.

هەروەها ڕووباری (باسانفا) سەرەتاکەی لە زەویەکانی میافارقینەوەیە و دەڕژێتە ناو **دیجلە** لەسەرووی جەزیرەی ئیبن عومەر بە پێنج فەرسەخ / ٣٠ کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی[١]، بەهەمان شێوە زێیی گەورە شوێنی دەرچوونی لە نێوان موسڵ و هەولێرەوەیە و لە سەرەتایی سنوری ئازربیجان دەڕوات تاوەکو دەڕژێتە ناو ڕووباری **دیجلە** لە نزیك شاری (السن)[٢]، وە بەو زێیە گوتراوە زێتی شێت ((لەبەر تیژی بەهێزی ڕۆیشتنی))[٣]، هەرچی زێیی بچووکە ئەوا لە چیاکانی شارەزوور دەردەچێت و بەهەولێر و داقوق دادەڕوات دەڕژێتە ناو **دیجلە**[٤].

جێگای باسە ئەو دوو زێیە ئاویان ئەوەندە زۆرە ئەگەر لێك بدرێن نزیکەی نیوەی ڕووباری **دیجلە** دەبێت[٥].

هەروەها ڕووباری خازریش کە لە نێوان هەولێرو موسڵە[٦] دەڕژێنە ناو **دیجلە**و ئەبولفیدا لەلایەم خۆیەوە باسی لێوە نەکردووە.

هەرچی ڕووباری فوراتە ئەویش بە هەرێمی جەزیرە تێپەڕدەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی شوێنی نیشتەجێبوونی کوردەکان زیاتر هاوتەریب بووە لەگەڵ ڕووباری **دیجلە**، هەربۆیە ئەوەندە ناپڕژێینە سەر ڕووباری فورات، بەڵکو تەنیا ئاماژە بەو ڕووبارانە دەکەین کە دەڕژێنە ناو فورات و سەرچاوەکانیان لە ناوچە کوردیەکانەوەیە ئەبولفیدا باسیکردوون وەکو ڕووباری سیمسات کە بەشاری سیسمات تێپەڕ دەبێت و لەسەرووی شاری مەلەتیە[٧] دەڕژێتە ناو ڕووباری

---

١ المصدر نفسه، ص٥٥.

٢ السن: شارۆچکەیەکە لە کەنارەکانی رووباری دیجلە لە باکوری شاری تکریتەوەیە، مولف مجهول: حدود العالم، ص١١٩، لە ڕاستیدا ئەبولفیدا لێرەدا کەوتۆتە هەڵەوە کاتێك باس لەوە دەکات لە نزیك ئەو شارە زێی گەورە دەرژێتە رووباری دیجلە، بەڵکو لە نزیك ئەو شارۆچکەیە زێی بچووك دەرژێتە رووباری دیجلە، ابن رستە: الاعلاق النفسیە، ص٨٩، یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٢/ ٤٤١.

٣ القزوینی: عجائب المخلوقات، ص١١٠.

٤ تقویم البلدان،ص٥٥.

٥ الاصطخري: المسالك والممالك، ص٥٤.

٦ یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٢/ ٣٣٧.

٧ مەلەتیە: دەربارەی هەڵکەوتەی ئەو شارە بۆچوونی جیاواز هەیە، ئەوەتا باس لەوە دەکرێت کە شارێکی بەناوبانگە لە وڵاتی ڕۆم و هاوتخووبی وڵاتی شامەو لەژێر چنگی موسلمانەکان بووە. الیعقوبی : البلدان، ص٢٠٥، یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٥/ ١٩٢. کەچی یەکێك لە وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زاینی باس لەوە دەکات لە ناوچە سنوریەکانی شامە، بەڵام وەکو شارێکی هەرێمی جەزیرە لە قەڵەم

فورات[1]، بەهەمان شێوە ڕووباری خابوریش سەرچاوەکەی لەسەر کانیە لە کانیەك کە پێدەگوترێت (الزاهریە)، دواتر بە شاری قەرقیسیا دا دەڕوات و دەڕژێتە ناو فوراتەوە[2].

هەرچی هەرێمەکانی ئاران و ئازربیجان و ئەرمینیاشە، ئەوا ژمارەیەك رووبارو سەرچاوەی ئاوی تیایاندا بەدیدەکرێت لە دیارترینیان ڕووباری (الرس) ئاراسە، کە لە چیاکانی قالیقلا هەڵدەقوولێن لە ئەرمینیاو بەناوچە چیایەکاندا دەڕوات و دواتر بەرەو شاری وەرثان دا دەڕوات، لەوێشەوە لە خوارووی شاری موقان لەگەڵ ڕووباری (الکر) تێکەڵی یەکتر دەبن و دەڕژێتە ناو دەریای خەزەر (قەزوین)[3].

هەرچی ڕووباری (الکر)ە، ئەوا سەرچاوەکەی لە زەویەکانی ئەرمینیایە و تەنیا بە هەرێمی ئاران دا دەڕوات، دوای تێکەڵ بوونی بە ڕووباری ئاراس دەڕژێتە دەریای قەزوین[4].

لەلایەکی تر جگە لەو ڕووبارانە چەند ڕووبارێکی دیکە هەبوونە لەو ناوچەداو ناوبراو باسینەکردوون وەکو ڕووباری سەڤیدرود (ئاسبیدود)، کە سەرچاوەکەی لە شاری سیسرەوە هەڵدەقولێت و لە دەرەوەی ئەو هەرێمانەیە، بەڵام بە ئازربیجان تێپەڕ دەبێت دواتر دەچێتە ناو وڵاتی دەیلەم و لەوێش تەسك دەبێتەوەو کەشتی ناتوانێ گەشتی پێدا بکات[5].

هەروەها ڕووباری حەسەن یەکێکی دیکەیە لە ڕووبارەکانی ئەو ناوچەیە و دەکەوێتە شاری بەیلەقان لە هەرێمی ئاران[6]، (نهر الاکراد)، ئەویش لەلایەن خۆیەوە دەکەوێتە نزیك شاری (دوین) و لە کاتی فتوحاتی ئیسلامی بۆ ئەو ناوچەیە ناوی هاتووە[7].

---

دەدات، الاصطخري: المسالك والممالك، ص٥٣، هەرچی پێکهاتەی شارەکەیە ئەوا کوردو تورکمانن و زیاتر زمانی کوردی لە نێویاندا باوە، ئەولیا چەلەبی : کورد لە مێژوویی دراوسێکاندا (سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی) وەرگێرانی : سەعید ناکام، (بەغدا:١٩٧٩) ل ل ١٦- ١٧.

١ تقويم البلدان، ص ص ٥١- ٥٢.

٢ المصدر نفسه، ص٥٢.

٣ تقويم البلدان، ص٦٠، سەرچاوەکانی تریش هەمان بۆچوونیان هەیە، سهراب: عجائب الاقاليم السبعة، ص١٤٩، القزويني عجائب المخلوقات، ص١١٠، ابن الوردي: خريدة العجائب، ص١٣٧.

٤ تقويم البلدان، ص٦٠.

٥ ابن رسته: الاعلاق النفسية، ص٨٨، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٦، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ١٧٢.

٦ ابن الفقية : مختصر كتاب البلدان، ص٢٦٨، القزويني : اثار البلاد، ص٥٢٢.

٧ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ١٤٦.

سەرەڕای بوونی ئەو ڕووبارانە لە ناوچەکەدا سەرچاوەی ئاوی دیکەش بوونی هەبووە، وەکو دەریاچەکان و ئەبولفیدا ئاماژەی پێکردوون، وەکو دەریاچەی ئەرجیش (وان)، ناوبراو ئەرجیشی بۆ بەکارهێناوە، بەڵام زیاتر بە وان ناوی هاتووەو دەکەوێتە هەرێمی ئەرمینیاو لە ڕۆژهەڵاتی شاری خەڵاتە بە دووری یەك ڕۆژ، دەریاچیەکی گەورەو قووڵ و خوێیاویە شارەکانی ئەرجیش و خەڵات و وان دەکەونە چوار دەورویەوە[1].

دەرچایەی تلا (ورمێ)[2] یەکێکی دیکەیە لەسەرچاوە ئاوییەکانی ئەو ناوچەیەو دەکەوێتە هەرێمی ئازربیجان لە نێوان مەراغەو سەلماس و شاری ورمێش نزیکە لێیەوە، درێژی ئەو دەریاچەیە لە ڕۆژئاوای بۆ ڕۆژهەڵاتی سەدوسی میلە / ٢٦٠ کیلۆمەتر و پانیەکەشی نیوەی ئەو ڕێژەیەیە[3].

باس لەوە دەکرێت هیچ جۆرە گیانداریکی تێدا ناژیت لەبەرئەوەی بۆنێکی ناخۆشی هەیە[4]، هەروەها لە بارەی ڕووباریشی لسترنج بۆچوونێکی تری هەیە کاتێك باس لەوە دەکات ((درێژی ئەو دەریاچەیە لە باکوری بۆ باشوری نەوەد میلە/ ١٨٠ کیلۆمەتر و پانیەکەشی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا سی و پێنج میلە /٧٠ کیلۆمەتر ))[5].

**سێیەم / ئاو و هەوا:**

سەبارەت بە ئاوهەوای ناوچەکە بە گشتی دەکرێت باس لەوە بکرێت سروشتی ناوچەکانی ڕاستەوخۆ کاریگەری هەبووە لەسەر ئاوهەوای، بەتایبەتی بوونی چیاو بان و دەشت لە ناوچەکەدا وادەکات ئاوهەوایەکی جۆراو جۆری هەبێ.

ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت ئەبولفیدا نەپرژاوەتە سەرئاهەوای ناوچەکەو بەتایبەتی باسی نەکردووە، بەڵکو دەبێت لەگەڵ باسکردنی شارەکاندا تێبینی ئەوە بکرێت کە ئاوهەوای چۆن بووە، کەچی وڵاتناسانی پێشتر هەندێکیان بە گشتی باسیان لە ئاوهەوای هەرێمی جەزیرە

---

١ تقويم البلدان،ص٤٢، سەرچاوەی تریش جەخت لەسەر قسەکانی دەکەنەوە، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٣٥٠، لسترنج بلدان الخلافة الشرقية، ص٢١٧.

٢

٣ لەسەرچاوەکاندا بە چەند شێوەیەك ناوی هاتووە وەکو (ورمێ- کبوژان- تلا —گلا —الشراه- چیچست) و لە کاتی ئێستادا پێی دەگوترێت دەریاچەی ڕەزایە، بۆ زیاتر زانیاری بروانە: حسام الدين النقشبندي: اژربيجان، ص٤٤.

٤ تقويم البلدان، ص ص ٤٢- ٤٣.

٥ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٣٥٠، القزويني : اثار البلاد، ص٤٩٥.

کردووەو باس لەوە دەکەن ((ئاوهەوایەکی لەبارو خۆشی هەبووە))[1]، هەروەها ئەلمقدسی ئاماژە بەوە دەکات ((ئاوهەواکەی بە گشتی نزیکە لە شام و هاوشێوەی عێراقە))[2].

لەلایەکی تر بارینی بەفرێکی زۆر لەناوچە چیاکانیداو لە هەندێك چیا مانەوەی بۆ هەرچوار وەرزی ساڵ وایکردووە لەو ناوچانەدا پلەی گەرما لە خوارەوە بێت[3]، ئەوە سەرەڕای ئەوە زۆر جار باس لە ئاوهەوای شارەکان کراوە، بە جۆرێك شاری موسڵ ((بە ئاوهەوایەکی خۆش و لەبار)) باسی کراوە[4]، هەرچی قەزوینیە وەسفێك زۆر باشی ئاوهەوای شارەکەی کردووەو لە وەرزەکانی ساڵدا بەو شێوەیە باسی دەکات ((لە بەهاردا ئاوهەوایەکی خۆشی هەیە، بەڵام لە وەرزی هاویندا پلەی گەرمی زۆر بەرزدەبێتەوە و وەکو دۆزەخ وایە، لە زستانیشدا سەرماو سۆڵێکی زوقمی هەیە))[5]، هەروەها لە هەندێك شاردا پلەی گەرمی ئەوەندە بەرزدەبێتەوە دەبێتە هۆی بوونی خورما تێدا وەکو شاری ژەنگار[6]، شاری ئامەدیش لەبەر نزیکی لە چیاوە زۆر ساردە[7].

سەبارەت بە ئاوهەوای هەرێمەکانی ئاران و ئەرمینیە ئازربیجانیش بە گشتی ساردن و بەفروباران بە ڕێژەیەکی زۆر تیایاندا دەبارێت و لەسەر لوتکەی چیاکانیان زۆرجار بەفر بەدرێژایی ساڵ لەسەریاندا دەمێنێ[8]، ئەوەش وایکردووە لە وەرزی زستاندا تووشی شەپۆلێکی توندی سەرماوسۆڵ بین لەبەربارینی بەفرێکی زۆر.

سەبارەت بە ئاوهەوای هەرێمەکانی ئاران و ئەمینیە ئازربیجانیش بە گشتی ساردن و بەفرو باران بە ڕێژەیەکی زۆر تیایاندا دەبارێت و لەسەر لوتکەی چیاکانیان زۆر جار بەفر بە درێژایی

---

١ بلدان الخلافة الشرقية، ص١٩٤.

٢ مولف مجهول: حدود العالم من المشرق الى المغرب، تحقيق : يوسف الهادي، (القاهرة:١٩٩٩)، ص١١٧، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ١٣٤.

٣ احسن التقاسيم، ص١٢٩.

٤ ابن الفقية: مختصر كتاب البلدان، ص١٢٥.

٥ مولف مجهول: حدود العالم، ص١١٧.

٦ اثار البلاد واخبار العباد، ص٢١٦.

٧ ابو الفداء : تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٨ المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٢٩.

سالّ لەسەریاندا دەمێنیٚ[1]، ئەوەش وایکردووە لە وەرزی زستاندا تووشی شەپۆلێکی توندی سەرماو سۆلّ بین لەبەر بارینی بەفرێکی زۆر.

شایەنی باسە ئەبولفیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە زستاندا باران و بەفرێکی زۆر تێیاندا دەبارێت، بە جۆرێك نموونەی چەند شارێکی هێناوەتەوە لەم ڕووەوەو وەکو شاری بەدلیس لەهەرێمی ئەرمینیا، کاتێك بەچیا دەورەدراوە، ئەوەش وایکردووە لە زستاندا ساردبیٚ لەبەر بارینی بەفرێکی زۆر[2] هەروەها لە بارەی شاری خەلاٚتیش هەمان بۆچوون دەخاتەڕوو[3].

هەربۆیە لێرەدا دەکرێت باس لەوە بکرێت ئاوهەوای ئەو هەرێمە بە گشتی ساردو سۆلّە بەتایبەتی لە وەرزی زستاندا، ئەوەش زیاتر لەبەربوونی ژمارەیەك زنجیرە چیایە کە کاریگەری هەبووە لەسەر ئەوەی پلەی گەرمی بەردەوام نزم بێت و ساردو سۆلّ بێت.

---

١ المقدسي: المصدر نفسه، ص٢٨٥، القزويني: اثار البلاد، ص٢١٥.

٢ تقويم البلدان، ص٣٩٥.

٣ نفس المصدر والصفحة.

# تەوەرەی دووەم

## هەرێمی چیاکان

### یەکەم/ بنەچەو ڕیشەی ناوەکە:

هەرێمی چیا یاخود ناوچە چیایەکان بە بەشێك لە وڵاتی کورد گوتراوە چونکە ((زۆرینەی چیا سەرکەش و بەرزو بڵندەکانە))[1].

ئەبولفیدا لەلایەن خۆیەوە وڵاتی چیای بەکارهێناوە، لە هەمان کاتدا ئاماژە بەوە دەکات ((وڵاتێکی ناسراوەو لە لایەن زۆرینەش پێی دەگوترێت عێراقی عەجەمی))[2]، هەڵبەتە ئەو ناوەش لەسەردەمی سەلجوقیەکان هاتەکایەوە بۆ ئەوەی جیابکرێتەوە لە عێراقی عەرەبی[3]، ئەوەش لە کاتێکدایە یاقوتی حەمەوی بە نزیکەی سەدەیەك پێش ئەو ژیاوە باس لەوە دەکات بۆ ئەو ناوە بنچینەیەکی کۆنی نەدۆزیوەتەوەو جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئەو ناوە هەڵەیە بخرێتە سەر هەرێمەکەوە[4].

شایەنی باسە کاتێك سەیری مێژووی کۆن دەکرێت لەسەرچاوەکاندا چەندیی ناو بۆ ئەو هەرێمە بەکارهاتووە، ئەوەتا لای سەرچاوە یۆنانیەکان پێی گوتراوە میدیا (Media) یاخود

١ ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٥.

٢ تقويم البلدان، ص٤٠٨.

٣ كي لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ص٢٢١.

٤ معجم البلدان، ٢/ ٩٩.

میدیا گەورە[١]، لەسەردەمە ئیسلامیەکانیش تێبینی دەکرێت لەلایەن هەندێك لە وڵاتناس ئەو ناوە بەکارهاتووە[٢].

هەروەها لەلای هەندێك لە وڵاتناسانیش بە وڵاتی (پەهلەوی) ناوی هاتووە[٣]، بەڵام ئەو ناوە لە سەردەمانی درەنگ و دواتر نەماوەو بەکاریش نەهاتووە.

لەلایەکی تر هەرێمی چیاکان بە (قهستان) یش ناوی هاتووە[٤]، ئەوەشیان زاراوەیەکی فارسیە ئەگەر لە وشەکە بکۆڵینەوە هەمان واتای وڵاتی چیا دەگەیەنێ.

لەگەڵ ئەوەی زۆر ناو زاراوە بۆ ئەو هەرێمە بەکارهاتووە، بەڵام ئەوەی زیاتر باو بووەو بەکارهاتووە هەر وڵاتی چیایە، ئەوەشیان زیاتر پەیوەندی هەیە بە سروشتی ناوچەکەوە، هەر بۆیە ئەبولفیداش هاوشێوەی وڵاتناسانی پێش خۆی هەمان ناوی بەکارهێناوە[٥].

**دووەم/ دیاریکردنی سنوری جوگرافی:**

سەبارەت بە سنوری جوگرافی هەرێمەکە ناوبراو بەو شێوەیە سنوری دیاریکردووە((ئەو هەرێمە دەورەدراوە لەلای رۆژئاوای بە ئازربیجان، لەلای باشوری شتێك لە وڵاتی عێراق و خۆزستان، لە ڕۆژهەڵاتی بە بیابانەکانی خۆراسان و فارس، لە باکوری وڵاتی دیلەم قەزوین و ڕەی ئەوەی لە چیاوە لێیانەوە دەردەچێت و دەچێتە نێو وڵام دیلەم چونکە چیاکانی هاوسنوری ئەوانەو بەوانەوە دەورەدراوە))[٦].

دیارە ئەو دیاریکردنەش وردو ڕێك و پێك نیە، لەبەرئەوەی لە بەشی رۆژئاوای سنوری دەورەدراوە بەبەشێك لە هەرێمی جەزیرەش، بەڵام ئەبولفیدا باسی نەکردووە[٧].

---

١،لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ص٢٢٠، طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة (بغداد: ١٩٧٤)، ١/ ٣٨٩.

٢ الهمذاني: صفة جزيرة العرب، تحقيق: محمد بن علي الاكواع، (صنعاء:١٩٨٣)، ص٨١، بنيامين التطيلي: رحلة بنيامين التطيلي، ترجمها وعلق حواشيها: عزر حداد(بغداد :١٩٤٥)، ص١٥٨.

٣ ابن الفقية الهمداني: مختصر كتاب البلدان، ص١٩٤، ابن خرداذبة: المسالك والممالك١٩٨٨، ص٥٨، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٩٠.

٤ القزوينی : اثار البلاد واخبار العباد، ص٣٤١.

٥ تقويم البلدان، ص٤٠٨.

٦ نفس المصدر والصفحة.

٧ بۆ زیاتر زانیاری بروانە نەخشەی ژمارە (١) لە لیستی پاشکۆکان.

هەرچی وڵاتناسانی سەدەی چوارەمن/ دەیەمی زایینی زیاتر گرنگیان داوە بە سنوری هەرێمەکە و ئەبولفیداش پشتی بەستووە بە بۆچونەکانی ئەوان لە مەڕ دەستنیشانکردنی سنوری هەرێمەکە کاتێك ئاماژە بەوە دەکەن((ئەو هەرێمە پێك هاتووە لە ماه[1] کوفەو ماه بەسرە، ئەو ناوچانەی بەو دوانەوە پەیوەست و پەیوەندران لەوەی دەچێتە سەریان ژمارەیان پێ زیاد دەکات، ئەوەتا لە بەشی ڕۆژئاوای ئازربیجانە، لەبەشی باکوری سنوری دەیلەم و قەزوین و ڕەییە، لە باشوری عێراق و خوزستانە))[2].

هەروەها هەندێك لە وڵاتناسانی تریش هەمان بۆچوونی ئەبولفیدایان هەیە دەربارەی دیاریکردنی سنوری هەرێمەکە[3].

بە گوێرەی وتەی یەکێك لە ژێدەرەکان وڵاتی چیای کۆن دابەش کراوە بۆ دو بەش، یەکێکیان بەشە بچووکەکەیەتی کە کوردستانە لە ڕۆژئاواو ئەویتریان بەشە گەورەکەیە کە عێراقی عەجەمیە لە ڕۆژهەڵات[4]، بەو پێیە زیاترینی ناوچە کوردنشینەکان دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوا لەو هەرێمەدا، ئەو ناوچەیەش سەربەخۆ نەبووە بەڵکو بەشێك بووە لەو هەرێمەدا، هەر بۆیە لەگەڵ ئەودا باس دەکرێت[5].

دیارە کوردیش هەر لە کۆندا لەو ناوچانەدا ژیاون و ناوچە چیاکانیان بەماڵی خۆیان داناوەو وڵاتناسانیش ئەو وتانە پشت ڕاست دەکەنەوە کاتێك باس لەوە دەکەن ((ناوچە چیاکان

---

١ ماه: وشەیەکی فارسیەو بە مانای مانگ دێت، چەندین شیکردنەوەی تریشی بۆ کراوە و باس لەوە دەکرێت بە مانای پایتەخت دێت، هەندێك دەڵێن لە وشەی (ماد) ەوە هاتووە. یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٥/ ٤٨، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەیەوە بڕوانە: حسام الدین النقشبندي: الكرد في الدینور وشهرزور خلال القرنین الرابع والخامس الهجریین/ العاشر والحادی عشر المیلادیین،رسالة ماجستیر غیر منشورة، مقدمة الی کلیة الاداب — جامعة صلاح الدین، (بغداد:١٩٧٥)، ص ص ١٤- ١٥.

٢ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٥، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣٠٤، مولف مجهول : حدود العالم، ص١٠٦.

٣ القزوینی : اثار البلاد، ص٣٤١، القلقشندي: صبح الاعشی، ٤/ ٣٣٦.

٤ لسترنج: بلدان الخلافة الشرقیة، ص٢٢١.

٥ حکیم احمد مام بکر: الکرد وبلادهم، ص٨٣.

به ماڵی کورده بەجەرگەکان)) دانراوە[1]، ئیبن حەوقەلیش چیاکانی بە ((هەواری زستانەی کوردو هاوینەوارەکانیان داناوە))[2].

بەم شێوەیە دوای دیاریکردنی سنوری هەرێمەکە، دەکرێت باس لەوە بکرێت لە کاتی ئێستادا سنوری بەو شێوەیەی خوارەوەیە، ئەو زەویانە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای ئێران تاوەکو دەریاچەی وەرمێ، لەوێشەوە درێژدەبێتەوە بۆ دەشتەکانی عێراق لە رۆژئاوا و تاوەکو بیابانی ئێرانی گەورە لە رۆژهەلات، هەروەها ناوچە چیاکانی رۆژهەلاتی ئازربیجانیش دەگرێتە خۆ[3].

هەرچی رۆژئاوای هەرێمی چیایە کە دیارترین شارە کوردیەکانی دەگرێتەخۆ سنوری بەو شێوەیە دیاریکراوە کە هەرێمی رۆژئاوای چیا ئەو شارو کورانە دەگرێتە خۆ کە دەکەوێتە رۆژئاوا بە هێڵێکی تراویلکەی کە هەمەدان بە شاری کرج ئەبی دلف دەبەستێتەوە کاتێك دەکەوێتە نێوان هەمەدان و ئەسبەهان[4].

بەهەمان شێوە دەکرێت لە کاتی ئێستادا بە گوێرەی وتەی یەکێك لە توێژەران سنوری بەو شێوەیە دیاری بکەین، بەشی ناوەراست لە کوردستانی رۆژهەلاتی (ئێران) کە پێك هاتووە لە پارێزگای کرمانشا (باختران) و کوردستان (سنندج) و بەشەکانی رۆژئاوا لە پارێزگای هەمەدان، بەشی باشوری لە پارێزگای ئازربیجانی رۆژئاوا، ئەو ناوچەیە خۆی لە خۆیدا سنوری نێو دەوڵەتیە لە نێوان عێراق و ئێران لە رۆژئاوا، وە زەویەکانی پارێزگاکانی ئاراك و زنجان لە رۆژهەلات و هێڵی مياندواب – مهاباد- پیرانشەهر لە باکوری لورستان لە باشور[5].

---

١ اليعقوبي: البلدان، ص٢٠.

٢ صورة الارض، ص٣٠٦.

٣ حسام الدين النقشبندي: الكرد في الدينور وشهرزور، ص٢.

٤ احمد ميرزا ميرزا: غربي اقليم الجبال في صدر الاسلام حتى ١٣٢هـ/٧٤٩م دراسة في التاريخ السياسي، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى كلية الاداب – جامعة صلاح الدين، (اربيل :١٩٩٥)، ص٢٧.

٥ نيشتمان بشير محمد: الاحوال السياسية والاجتماعية والاقتصادية لغربي اقليم الجبال خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين/ العاشر والحادى عشر الميلاديين، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الاداب – جامعة صلاح الدين، (اربيل:١٩٩٤) ص١٨.

**سێیەم / دیارترین شارەکانی:**

لێرەدا زیاتر جەخت لەسەر ئەو شارە کوردیانە دەکرێتەوە کە کەوتوونەتە رۆژئاوای هەرێمی چیاو ئەبولفیدا لە کتێبەکەیدا ئاماژەی پێکردون.

١- اربل (هەولێر)[1]:

ناوبراو لەگەڵ شارەکانی هەرێمی چیا باسیکردووەو کردوویەتی بە بنکە (پایتەختی) دەڤەری شارەزوور، دەکەوێتە نێوان هەردوو زێی و دوو رۆژ[2]ەرێ لە شاری موسڵ دوورە، هەروەها خەڵکی شارەکە باس لەوە دەکەن هەولێر شارێکی گەورەیە بەڵام زۆری تێکچووە[3].

جێگای باسە ئەو شارە لە کاتی فەتح کردنی هەرێمی چیاو جەزیرە ناوی نەهاتووە، ڕەنگە ئەوەش زیاتر لەبەر ئەوەبێت لەو کاتەدا شارێکی نەناسراو بووە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تر [4]، بەڵام لە سەردەمانی دواتردا ناوی هاتووە بەتایبەتی لە کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی / نۆیەمی زایینی ئیبن خرداذبە وەکو طسوجێك[5] لە هەرێمی ڕەشە خاك (السواد) ناوی هێناوەنی [6]، هەرچی وڵاتناسانی سەردەمانی دواترن ئەوا وەکو شارێکی هەرێمی جەزیرە باسیان لێوەکردووە[7]، کەچی لەلای ناوبراو خراوەتە سەر هەرێمی چیاوە، هۆکارەکەشی ڕەنگە زیاتر پەیوەندی هەبێ بە دەڤەری شارەزوورەوە، چونکە دواي فەتح کردنی شارەزوور بە درێژایی سەردەمی ئومەویەکانیش سەر بە موسڵ بووە تاوەکو رۆژگار خەلیفەی عەبباسی هارون ڕەشید (١٧٠- ١٩٣ك/ ٧٨٦- ٨٠٨ز) کاتێك لێی جیاکردەوەو کردی لە دەڤەرێکی سەربەخۆ [8] و دواتریش بوو بە بەشێك لە هەرێمی چیا[1] ئەوە لەلایەك، لەلایەکی

---

١ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ناوی هەولێر لە کۆنەوە تاوەکو ئێستا بڕوانە: اسماعيل شكر رسول: اربيل دراسة تاريخية في دورها الفكري والسياسيى (١٩٣٩- ١٩٥٨)، (السليمانية:٢٠٠٥)، ص ص ١٨- ٢٠.

٢ هەر رۆژە ڕێەك نۆزدە میلە، هەر میلێك دوو کیلۆمەترە . فالتزهنتس: المكاييل والاوزان الاسلاميه، ص٤١٣.

٣ تقويم البلدان، ص٤١٣.

٤ محسن محمد حسين: اربيل في العهد الاتابكي، (بغداد:١٩٨٦) ص ص ٣٣- ٣٤.

٥ طسوج: زاراوەیەکی فارسیەو ریشەکەی لە (تسو) هاتووە، بە پیترو کەمترە لە کورەو پارێزگا، بەڵکو وەکو بەشێك وایە لە کورە ياقوت الحموى: معجم البلدان:١/ ٣٨.

٦ المسالك والممالك، ص١٨.

٧ ياقوت الحموي: المشترك وضعا والمفترق صقعا، (گوتنگن: ١٨٤٦)، ص١٩، القزويني: اثار البلاد، ص٢٩٠.

٨ البلادزي: فتوح البلدان، وضع حواشيه: عبدالقادر محمد علي، (بيروت:٢٠٠٠)، ص٢٠٠، قدامه بن جعفر: الخراج وضاعة الكناية)، شرح وتعليق : محمد حسين الزبيدي: (بغداد:١٩٨١)، ص١٧٥.

تریش ئەبولفیدا زۆرترین زانیاری بۆ کتێبەکەی سەرچاوەکنی پێش خۆی وەرگرتووەو گەڕیدەی مەغریبی ئیبن سەعید (م٦٨٥ك/ ١٢٨٨ز) بە نزیکەی نیو سەدە پێش ئەو ژیاوە، هەولێر ئەژمارکردووە بە بنکەی دەڤەری شارەزوور[٢]، ئەویش ڕاستەخۆ ئەو زانیاریەی لێوەگرتووە، هەر بۆیە وەکو شارێك لە هەرێمی چیا باسی لێوەکردووە.

هەروەها تێبینی ئەوە دەکرێت ئەوانەی لە دوای ئەو هاتوون بەتایبەتی قەلقەشەندی (م٨٢١ك/ ١٤١٨ز) بەهەمان ڕێچکەی ئەو خستویەتیە سەر هەمان هەرێم بە بنکەی شارەزووری داناوە[٣].

٢- شهرزور (شارەزوور)[٤]:

بەپێی وتەکانی ئەبولفیدا شارێکی بچووکەو دەکەوێتە هەرێمی چیاو لە هەمان کاتدا دەکەوێتە نێوان موسڵ و هەمەدان و لەلایەم زۆر کوڕی زوحاك دروست کراوە، هەر بۆیە پێیدەگوترێت شاری زوور، نێوانی لەگەڵ مەراغە شەش قۆناغەو لەگەڵ شاری حولوانیش بیست فەرسەخە/ ١٢٠ کیلۆمەتر[٥].

جێگای باسە شارەزوور دەڤەرێکی فراوانەو دەکەوێتە نێوان هەولێر و هەمەدان لە هەرێمی چیاو سەرجەم دانیشتوانی کوردن[٦]، هەرچی وڵاتناسانی سەدەی چوارەمن، دەیەمی زایینی سەرجەم دەکەن ((شارێکی بچووکەو دانیشتوانی کوردن، هەردەم بە دەست کوردانەوە بووەو هیچ میرو سەردارێکی ناکوردی حوکمی شارەزوور نەکردووە بەڵکو بەدەست خۆیانەوە بووە))[٧].

سەبارەت بە جیاوازی لە بیرو بۆچونەکان دەربارەی بچووکی و گەورەی شارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شارەزوور ناوچەیەکی فراوانەو چەند شارو گوندێك لە خۆدەگرێت وەکو (نیم ئازەرا

---

١ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٣٧٥.

٢ بسط الارض في الطول والعرض، ص٩١.

٣ صبح الاعشى، ٤/ ٣٦٧.

٤ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی بنەچەو ڕیشەی ناوی شارەزوور ماناکانی بڕوانە: فرست مرعي: الامارات الكردية في العصر العباسي الثاني، ص ص ٤٠- ٤١.

٥ تقويم البلدان، ص٤١٣.

٦ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٣٧٥، القزويني: اثار البلاد، ص ص ٣٩٧- ٣٩٨.

٧ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨، ابن حوقل : صورة الارض، ص٣١٤.

(شارەزوور) — بیر — دزان- تیرانشا- دیلمستان)[1]، لێرەدا نـاوبراو وەکـو ناوچـەکە بـەفراوانی باسی لێوەنەکراوە بەڵکو وەکو شارێك لـەو دەڤـەرەدا باسـیکردووە، هەربۆیـە وەکـو شـارێکی بچووك ناوزەنندیکردووەو شارەکانی تریش ئەوەندە ناسراو نـەبووە، ئـیتر لـەو ناوچـەیەدا هـەر ڕووداو ناوهێنانێك هاتبێ هەر بەناوی شارەزوور بووە.

له کاتی ئێسـتادا شـارەزوور بـە دەشـتە فراوانـەکانی کـە دەکەوێتـە ئەوپـەڕی باشـوری ڕۆژهەڵاتی ناوچە چیایەکان لە پارێزگای سلێمانی دەگوترێت[2].

٣- نهاوند (نەهاوەند):

بەیەکێك لە شارە کۆنەکان دادەنرێـت لـە هـەرێمی چـیاو دەکەوێتـە باشـوری هەمـەدان، هەڵکەوتەی ئەو شارە کەوتۆتە سەرچیاو هەر بۆیە ئاوهەوایـەکی گونجـاوی هەیـە، بـاس لـەوە دەکرێت پێغەمبەر نوح (خوا لێی رازی بێت) دروستی کـردووە[3]، هـەروەها شـەڕێکی گـەورە[4] تێیدا ڕوویداوە لەسەردەمی خەلیفـە عومـەڕی کـوڕی خـەتاب (١٣- ٢٣ك/ ٦٣٤- ٦٤٣ز)، نێوانی لەگەڵ هەمەدان چوار فەرسەخە/٨٤ کیلۆمەتر [5].

لە ڕاستیدا دانیشتوانی ئەو شـارە تێکـەڵاو بوونـە لـە کـوردو عـەرەب و فـارس[6]، بـەڵام مستەوفی قەزوینی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە ڕۆژگاری ئەودا، واتە سەدەی هەشتەمی کۆچی/ پانزەی زاینی، زۆرینەی دانیشتوانی پێك هاتبوو لە کوردان[7].

---

١ مسعر بن مهلهل: الرسالة الثانية، نشر: بطرس بولغاركوف وانس خالدون، (موسكو:١٩٦٠)، ص١٨، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٣٧٥.

٢جاسم محمد خلف: محاضرات في جغرافية العراق الطبيعية والاقتصادية والبشرية، (القاهرة:١٩٦١)، ص٨٠.

٣ ئەو بۆچوونە سەرچاوەکانی تریش پشت راستیان کردۆتەوە کاتێك باس لەوە دەکەن شاری نەهاوند پێغەمبـەر نوح (خوا لێی رازی بێت) بنیادی ناوە ناوەکەشی خۆی (نوح- ئاوەند) ە، پیتی (ح) زۆرجار دەگۆریت بۆ (هـ) و کورتیشکراوەتەوە بۆتە (نهاوند)، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٣١٣، القزوینی : اثار البلاد، ص٤١٧.

٤ یەکێك لە شەرە هەرە گەورەکانی تێدا روویدا لە نێوان موسڵمانەکان و فارسەکان لـە سـاڵی (١٩ك/ ٦٤٠ز) کە تێدا موسڵمانەکان توانیان سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنن، لەبەر گرنگی شەڕەکەو سەرکەوتنیان ناوی لێنرا (فتح فتوح) البلاذري: فتوح البلدان، ص١٨٤، اليعقوبی : تاريخ اليعقوبی، (بيروت:١٩٦٠)، ٢/ ١٥٦.

٥ تقويم البلدان، ص٤١٧.

٦ اليعقوبی: البلدان، ص٨٣.

٧ نزهة القلوب، ص٧٤.

٤- الدينور (دینەوەر):

شارێکە دەکەوێتە رۆژئاوای هەمەدان بە چەند میلێك لە باکوریەوە، نێوانی لەگەڵ موسڵ چل فەرسەخە/٢٤٠ کیلۆمەتر، بە هەمان شێوە لەگەڵ مەراغەش چل فەرسەخە/٢٤٠ کیلۆمەتر، شاری دینەوەر وەکو هەمەدانە[١].

لەبەر رۆشنایی وتەکانی ئەبولفیدا، دینەوەر لە زۆر ڕووەوە وەکو هەمەدان وایە، بەلاّم لە ڕووی گەورەی بە پلەی دووەم دێت و قەوارەکەشی سێ لەسەر چواری هەمەدانە[٢].

لەلایەکی تریش دووری و نزیکی لەگەڵ شارە بەناوبانگەکان لەگەڵ هەندێك شار باسیکردووە کە لە ڕاستیدا زۆر لەو شارەوە دوورن، بەلاّم دەکرێت باس لەوە بکرێت دینەوەر دەکەوێتە نزیك شاری قرمیسین (کرمانشا) و نێوانی لەگەڵ شاری هەمەدان بیست فەرسەخە/١٢٠ کیلۆمەتر[٣].

٥- همذان (هەمەدان)[٤]:

ئەو شارە دەکەوێتە ناوەڕاستی هەرێمی چیاوە، بەیەکێك لە شارە هەرە گەورەکانی ئەو هەرێمە دادەنرێت و چوار دەرگای هەبووە، هەروەها گرنگیەکی تایبەتیشی هەبووە لەبەرئەوەی کەوتۆتە سەر رێگای کۆنی کاروانەکان و حەج، نێوانی لەگەڵ حولوان شەست و حەوت فەرسەخە/ ٤٠٢کیلۆمەترو لەگەڵ شاری قوم پێنج قۆناغە[٥].

دیارە هەمەدان یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکان، هەر بۆیە لەلای وڵاتناسان بە ((کۆنترین شار لە هەرێمی چیا)) دانراوە[٦]، بەهەمان شێوە ئەو شارە لە پێشتردا پایتەختی دەوڵەتی میدیەکان بووە بەناوی ((ئەکباتانە) و گرنگیەکی زۆری هەبووە، لەبەرئەوەی ڕێگایەکی سەرەکی بوو کە ئێرانی بە عێراق دەبەستایەوە[٧] و نەك تەنیا ئەو دوو وڵاتە بەڵکو خاڵێکی

---

١ تقويم البلدان، ص٤١٥.

٢ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٧، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣٠٨.

٣ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٥٤٥.

٤ سەبارەت بە ناوەکەی، وڵاتناسان باس لەوە دەکەن هەمەدان کوڕی فلوج کوڕی سام کوڕی نوح بنیادی ناوەو ناوەکە لەوە هاتووە، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٤١٠، القزويني : اثار البلاد، ص٤٨٣.

٥ تقويم البلدان، ص٤١٧.

٦ ابن الفقية: مختصر كتاب البلدان، ص٢٠٣، ياقوت: معجم البلدان، ٥/ ٤١٢.

٧ كارل بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية، ص١٠٣، نیشتمان بشير محمد: الاحوال السياسية والاجتماعية، ص١٩.

سەرەکی بووە لەسەر ڕێگای نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو شارێکی گرنگ بووە لەم ڕووەوە لە کوردستان[1].

لەلایەکی تر لەبەرئەوەی شارێکی گەورەو خۆش و ئاوهەوایەکی لەباری هەبووە، هەربۆیە بۆتە جێگای سەرنجی پادشاکانی فارس لە کۆنداو کۆشك و تەلاری گەورەیان تێدا دروستکردبوو لە وەرزەکانی بەهارو هاویندا سەردانیان دەکرد، لەبەرئەوەی وەکو بەهەشت وابووە[2].

٦- قرمیسین (کرمانشا):

یەکێکە لە شارە گرنگەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاو دەکەوێتە نێوان حولوان و هەمەدان و نزیکە لە شاری دینەوەر بە دووری سێ فەرسەخ/١٨٠ کیلۆمەتر، ئەو شارە پێی گوتراوە کرمانشا[3] و یەکێك بووە لە شارە گەورەو جوانەکان لەو هەرێمەداو ئاوەدان و قەلەبالغ بووە بە خەڵك[4].

سەبارەت بە بۆچوونەکانی ناوبراو دەربارەی ئەو شارە هیچ جیاوازیەك بەدیناکرێت لەگەڵ وڵاتناسانی ترو ئەوانیش جەخت لەسەر قسەکانی ئەو دەکەنەوە[5].

هەروەها لە کاتی ئێستادا شارەکە بەردەوام ئاوەدانە بەناوی باختران (کرمانشا) لە ڕۆژئاوای ئێران و سەرجەم دانیشتوانی کوردن[6].

٧- اسد اباذ (ئەسەد ئاباد)[1]:

---

١ ادریس محمد حسم الدوسکي: همذان من الفتح الاسلامي الى سقوطها بيد المغول، (دهۆك:٢٠٠٦) ص١٦٥.

٢ القزويني: اثار البلاد، ص٤٨٣.

٣ دەربارەی ناوی، ناوبراو هیچ بۆچوونێك نەخستۆتە ڕشوو تەنیا باس لەوە دەکات پێیگوتراوە کرمانشا، بەڵام لەسەر چاوەکاندا بیروڕای جیاواز هەیە لە بارەی ناوی و ئەو کەسەی بنیادی ناوە، ئەوەتا باس لەوە دەکرێت قوباد کوڕی فەیروز سەیری وڵاتەکەی کرد لە نێوان مەدائن (سەلمان پاك) و بلغ هیچ ناوچەیەکی نەدیت ئاوهەواکەی لە قرمیسین باشتر بێت. لەبەرئەوە بڕیاریدا لەوێدا نیشتەجێ بێت و ناوی شارەکە کردە (کردمان شاهان) دواتر کورتکرایەوە بووبە (کرمانشا)، ابن الفقيه: مختصر كتاب البلدان، ص١٩٥، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٣٣٠، القزويني: اثار البلاد، ص٤٣٣، کەچی یەکێك لە وڵاتناسەکان باس لەوە دەکات بەهرام کوڕی شابوری ساسانی بنیادی ناوەو قوباد کوڕی فەیروز دووبارە نۆژەنیکردۆتەوە المستوفيى القزويني : نزهة القلوب، ص١٠٨.

٤ تقويم البلدان، ص٤١٣.

٥ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٣٣٠- ٣٣١، القزويني : اثار البلاد، ص٤٣٣، القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/ ٣٦٩.

٦ نیشتمان بشیر محمد: الاحوال السياسية، ص٢٥، احمد ميرزار ميرزا: غربي اقليم الجبال، ص٤٥.

شارۆچکەیەکە نێوانی لەگەڵ هەمەدان قۆناغێکە بەرەو عێراق، هەروەها لەگەڵ (قصر اللصوص[2]) حەوت فەرسەخ /٤٢ کیلۆمەتر، لەگەڵ هەمەدانیش نۆ فەرسەخ /٥٤ کیلۆمەترو لەگەڵ دینەوەریش حەڤدە فەرسەخ /١٠٢ کیلۆمەتر [3].

دیارە ئەو شارە لە کۆتایەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەمی زاینی وەکو گوندێك وابووە، بەڵام لەسەردەمانی دواتر گەشانەوەیەکی بەرچاوی بە خۆیەوە دیووەو بۆتە شارێکی بچووك و ئاوەدان و دانیشتوانی زۆر بووە[4]، کەچی ئەبولفیدا وەکو شارۆچکەیەك باسیکردووە ئەوەشیان ڕەنگە لەبەرئەوە بێ لەسەردەمی ئەودا بچووك بووەو وەکو شارۆچکەیەك خۆی نیشانداوە.

٨- بروجرد:

یەکێکی ترە لە شارەکانی هەرێمی چیاو هەژدە فەرسەخ/ ١٠٨ کیلۆمەتر لە هەمەدانەوە دوورە[5].

جێگای باسە سەرچاوەکانی تریش هەمان بۆچوونیان هەیەو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە یەکێك بووە لەو شارانەی درێژیەکەی زۆر زیاتر بووە لە پانیەکەی[6].

٩- قصر اللصوص (کینگەوەر):

بەپێی وتەکانی ئەبولفیدا شارێکە نزیکە لە ئەسەد ئابادو دەکەوێتە نێوان هەمەدان و کرمانشا، پێشی گوتراوە کنگور[7]، نێوانی لەگەڵ ئەسەد ئاباد حەوت فەرسەخە /٤٢ کیلۆمەتر[8].

---

١ سەبارەت بەناوی، وڵاتناسان باس لەوە دەکەن ئەسەد کوڕی سەروی حومەیری ئەو شارەی نۆژەنکردۆتەوە دوای ئەوەی بەخۆی و هۆزەکەی لە پێش ئیسلامدا پێیدا تێپەڕبوون، هەروەها جەخت لەسەر ئەوەش دەکەنەوە کە کوردو فارسی تێدا بووە مسعر بن مهلهل: الرسالة الثانية، ص٧٠، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ١٧٦.

٢ دەربارەی ئەو شارە بڕوانە: ل١٠٨.

٣ تقويم البلدان، ص٤١٧.

٤ ابن حوقل: صورة الارض، ص٣٠٦، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٩٥، الادريسي: نزهة المشتاق، ص٢٣٧.

٥ تقويم البلدان، ص٤١٩.

٦ ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٣، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٤٠٤، القزويني : اثار البلاد، ص٣٠٧.

٧ کنگور: شارێکی کۆنەو دەکەوێتە نێوان هەمەدان و کرمانشا، لەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامی ناوی شارەکە گۆڕاو پێیگوترا (قصر اللصوص)، چونکە لەو کاتەی موسڵمانەکانی گەیشتنە ئەو شارە هەندێك لە خەڵکی شارەکە وڵاغی موسڵمانەکانیان ڕفاند. هەربۆیە ئەو ناوەی لێنرا، ياقوت الحموي: المشترك وضعا، ص٣٥١، القزويني : اثار البلاد، ص٤٤٨.

٨ تقويم البلدان، ص٤١٥.

١٠- سیروان (ماسبذان):

یەکێکی ترە لە شارەکانی رۆژئاوای چیاو دەکەوێتە کورەی ماسبذان، لێرەدا ئەبولفیدا دەیەوێت وانیشان بدات سیروان ماسبذانیشی پێدەگوترێت،شارێکی کۆنەو دەکەوێتە نێو چیاو دۆڵایەکان، لەوەشیاندا وەکو شاری مەککە وایە لە دوورگەی عەرەب، نێوانی لەگەڵ شاری سەیمەرە[1] دوو قۆناغە، لە شاری ماسبذان خەلیفەی عەبباسی مەهدی (١٥٨- ١٦٩ك/ ٧٧٥-٧٨٠ز)ژیاوەو هەر لەوێدا مردووەو نێژراوە، هەر بۆیە بۆچوونێکی وا لە ئارادایە کە پیرۆزترین گۆڕ لەدوای گۆڕی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت)، گۆڕی شاری ماسبذانە[2].

لە ڕاستیدا سیروان شارێك بووە لە کورەی ماسبذان لە هەرێمی چیا، کەچی ناوبراو وای نیشانداوە هەردووکیان یەکن و لەو بۆچوونەش ولاتناسی تریش هەیە بەو شێوەیە باسیکردوون[3].

هەروەها باس لەوە دەکرێت لە سەرەتادا شاری سیروان وەکو گوندێك وابووە[4]، دواتر گەشەی کردووەو بووە بە شارێکی بچووك و گەشاوەو خانوو دامەزراوەکانی وەکو شاری موسڵ و تکریتە کاتێك لەبەردو گەچ دروستکراون[5].

١١- سهرورد (سوهرەوەرد):

ناوبراو لە بارەی ئەو شارە تەنیا باس لەوە دەکات ((شارێکی بچووکەو زۆرینەی دانیشتوانی کوردەو دەکەوێتە نزیك شاری زنجان))[6].

شایەنی باسە دەکرێت باس لەوە بکرێت لەگەڵ ئەوەی ئەبولفیدا خۆی کورد بووە بەڵام زۆر نەپرژاوتە سەر دانیشتوانی شارەکان و ناوی کوردی کەم هێناوە و تەنانەت لەسەرتاپای کتێبەکەی چەند جارێك ناوی کوردی هێناوەو شاری سوهرەوەرد یەکێکە لەو شارانەی کە ناویانی تێدا هێناوە.

لەلایەکی تریش سەرچاوەکانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە و باس لەوە دەکەن ((وەکو شارەزوور وایەو شارێکی بچووکەو زۆرینەی دانیشتوانی کوردن، هیچ کەسێك لەسەردار میری خەلیفەکانی حوکمیان نەکردووە، بەڵکو کوردان خۆیان دەسەڵاتی خۆیان تێدا بەڕێوەبردووە))[1].

---

١ دەربارەی شاری سەیمەرە بڕوانە: ل١١٨.

٢ تقويم البلدان، ص٤١٥.

٣ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٢٩٦.

٤ ابن الفقية: مختصر كتاب البلدان، ص١٩٤.

٥ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٤.

٦ تقويم البلدان، ص٤١٥.

١٢- قصر شيرين:

یەکێکە لە شارە کۆنەکانی رۆژئاوای هەرێمی چیاو دەکەوێتە نزیك کرمانشا، لە ڕاستیدا ئەو شارە کیسرا ئەپەرویز بۆ شیرینی خێزانی دروستکردو هەر بەناوی ئەوەوە ناونرا[٢]، نێوانی لەگەڵ هەمەدان و حولوان پەنجا فەرسەخە/٣٠٠ کیلۆمەتر، لەگەڵ خانەقین حەوت فەرسەخە/٤٢ کیلۆمەتر و لەگەڵ شارەزوور بیست فەرەسەخە/٦٠ کیلۆمەتر [٣].

جێگای ئاماژە پێکردنە تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆشمان ژیان تێدا بەردەوامە دەکەوێتە بەشی زەهاوی سەر بە شاری کرمانشا[٤].

١٢- الصميرە (سەیمەرە):

ئەو شارە لە دەوروبەری هەرێمی چیایەو لەوپەڕی باشوریەتی و نزیکە لە وڵاتی خوزستان، شارێکی بچووکەو ئاوهەوایەکی خۆش و گونجاو و لەباری هەیەو تەنانەت بە ناوبانگیشە بە زۆری کانیاو و ڕووبارەکانی، نێوانیشی لەگەڵ شاری سیروان دوو قۆناغە ڕێیە[٥].

دیارە ئەو شارە خۆی دەکەوێتە کورە (مهرجان قذف) و لەلایەن خۆیەوە کورەیەکی فراوانەو چەند شارو گوندێك لە خۆدەگرێت، [٦] دیارترینیان هەرسێ شاری سەیمەرەو شاپور خواست و ئەلشیتەرە، شاری سەیمەرە وەکو پایتەختی وایە[٧].

هەروەها وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچیش/ دەیەمی زاینی وەکو شارێکی بچووك و ئاوەدان و گەشاوە باسیان لێوەکردووە[١].

---

١ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٤، مولف مجهول حدود العالم، ص١٠٨، القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/٣٦٩.

٢ بنیادنانی ئەو شارە لەلایەن کیسرا ئەپرویز یەکێك بوو لە دیاردە سەرسورهێنەرەکانی جیهان، کاتێك خۆی لە شاری کرمانشا بوو شیرینی دەستگیرانی داوای لێکرد کۆشکێکی بۆ دروست بکات لە وڵاتدا وێنەی نەبێ، ئەویش بۆی دروستکردو هەر بەناوی ئەویەوەنا، یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٤/ ٣٥٨، القزوینی : اثار البلاد، ص٢٤١.

٣ تقويم البلدان، ص٤١٥.

٤ محەمەد مەردۆخی: مێژووی کوردو کوردستان، ل٢٦.

٥ تقويم البلدان، ص٤١٣.

٦ اليعقوبی: البلدان، ص٧٢، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٤٣٩.

٧ حسام الدين النقشبندي: الكرد في الدينور وشهرزور، ص٢٨.

هەرچی دانیشتوانی شارەکەیە لە سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەمی زاینی پێك هاتبوو لە کوردو فارس و عەرەب[2].

لەلایەکی تر یەکێك لە شارە دیارەکانی ئەو هەرێمە شاری (حولوان)ە کە کوردی تێدا ژیاوە و ئەبولفیدا باسینەکردووە لەگەڵ هەرێمی چیاکان و بەڵکو لەگەڵ وڵاتی عێراق ئاماژەی پێکردووەو باس لەوە دەکات هەندێك دەڵێن لە وڵاتی عێراقەو هەندێکی دیکە باس لەوە دەکەن سەر بە هەرێمی چیاکانە، لە هەمان کاتدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە لە عێراقدا هیچ شارێك بە قەد حولوان نزیك نیە لە چیاکان[3].

جێگای ئاماژە پێکردنە ئەو شارە لەبەرچەند فاکتەرێك خرایە سەر هەرێمی چیاکان، وەکو نزیکی لە چیاکان و هەمان ئاوهەوای ئەوی هەیە لەبەرئەوە لە عێراق جیاکرایەوەو خرایە سەر ئەو هەرێمەوە[4].

هەرچی بوونی کوردە لەو شارەدا یەکێك لە توێژەران باس لەوە دەکات لە سەدەی یەکەمی کۆچی/ حەوتەمی زاینی بوونی هەبووە لەو شارەدا، ئەوەش بۆمان دەسەلمێنێ کە پێش هاتنی ئیسلامیش بوونیان هەبووە لەو شارەدا[5] و ولاتنناس یەعقوبیش ئاماژە بەوە دەکات دانیشتوانەکەی تیکەڵاون لە عەرەب و عەجەم، مەبەستیش لە عەجەم کوردو فارسە[6].

بەو شێوەیە هەرچەندە ئەو شارە خراوەتە سەر هەرێمی چیاکان، بەڵام ئەبولفیدا وەکو شارێکی وڵاتی عێراق باسیکردووە[7].

---

١ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٤.

٢ اليعقوبى : البلدان، ص٧٢.

٣ تقويم البلدان، ص ص ٣٠٦- ٣٠٧.

٤ قدامة بن جعفر: الخراج وصناعة الكتابة، ص١٧٣، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٤، محمد خليل: تاريخ الكرد في الحضارة الاسلامية، (السليمانية:٢٠٠٧)، ص١٣٨.

٥ زرار صديق توفيق: الكورد في العصر العباسي حتى مجئ البويهيين (١٣٢- ٣٣٤هـ/ ٧٤٩- ٩٤٦م) دراسة في تاريخهم السياسي، رسالة ماجستير غير منشورة، مقدمة الى كلية الاداب- جامعة صلاح الدين، (اربيل :١٩٩٤)، ص٢٠.

٦ البلدان، ص٧٥.

٧ تقويم البلدان، ص٣٠٧.

# تەوەرەی سێیەم

## هەرێمی جەزیرە

یەکێکی ترە لەو هەرێمانەی کورد هەر لە کۆنەوە تێدا نیشتەجێ بووە، ئەو هەرێمە لەلایەن جوگرافیناس و مێژوونووسان بەو ناوچەی دەکەوێتە نێوان هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات بەتایبەتی بەشی باکوری هەرێمی جەزیرەی پێگوتراوە [1]، لەو ڕووەشەوە ئەبولفیدا هەمان بیرو بۆچوونی هەیە سەبارەت بە هەرێمەکەو باس لەوە دەکات ((هەرێمی جەزیرە، ئەو وڵاتەیە دەکەوێتە نێوان هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات، سەرەڕای ئەوەش زۆر ناوچەی تریش کە لێیەوە نزیك بووە خراوەتە سەری وەکو شاری روحبەو چەند شارێکی دیکە))[2].

جێگای ئاماژە پێکردنە ئەو هەرێمە لەلایەن وڵاتناسان ناوی دیکەشی بۆ بەکارهێنراوە، وەکو ئەلمقدسی و یاقوتی حەمەی زاراوەی (اقور) یان بەکارهێناوە[3]،تەنانەت یاقوت لای خۆی (ابور)یشی بەکارهێناوە[4] بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەی زیاتر هەرێمەکەی پێناسراوە هەر جەزیرەیە، ئەوەش زیاتر پەیوەندی هەیە بە سروشتی ناوچەکەوەو ئەو ناوە زیاتر بەکارهاتووە، هەربۆیە خۆی ئەبولفیداش ئەو ناوەی لاپەسند بووەو بەکاریهێناوە.

---

١ ابن الفقية: مختصر كتاب البلدان، ص١٢٣، ابن حوقل: صورة الارض، ص١٨٩، القزويني : اثار البلاد، ص٣٥١، القرماني: اخبار الدول واثار الاول، ص٤٤٤.

٢ تقويم البلدان، ص٢٧٣.

٣ احسن التقاسيم، ص١٢٤، معجم البلدان، ٢/ ١٣٤.

٤المشترك وضعا والفترق صقعا، ص١٠٣.

یەکەم/ دیاریکردنی سنوری جوگرافی :

ناوبراو یەکێکە لەو جوگرافیناسانەی زۆر بە تێرو تەسەلی باسی سنوری هەرێمەکەی کردووەو بەو شێوەیە باسی لێوەدەکات، هەرێمی جەزیرە دەورودراوە بەبەشێك لە ئەرمنیاو بەشێك لە ولاتی ڕۆم ڕۆژئاوای جەزیرەیە، بەشێك لە ولاتی شام و بیابانەکانی باشوریەتی، عێراق ڕۆژهەلاتیەتی، بەشێك لە ئەرمینیا باکوریەتی[1].

هەروەها کاتێك باس لەوە دەکات ئەو هەرێمە دەکەوێتە نێوان هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات، ئەوا دەکرێت لەبەر ڕۆشنایی قسەکانی سنوری هەرێمەکە دیاری بکەین، بەشێوەیەك ڕێڕەوی ڕۆیشتنی ڕووباری فورات بۆتە سنورو خالّی لێك جیاکەرەوەی نێوان هەرێمی جەزیرەو ولاتی شام لە ڕۆژئاوا، هەروەها ڕووباری دیجلە بە پێی ڕێڕەوی ڕۆیشتنی سروشتی خۆی بۆتە سنورو خالّی لێك جیاکەرەوەی هەرێمی جەزیرە لە ئازربیجان و هەرێمی چیا لە بەشی ڕۆژهەلاتی، هەربۆیە لە لای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای سنورێکی دیاریکراوی هەیەو هیچ جۆرە ناکۆکیەکیش لەسەری نیە. چونکە هەردوو ڕووبارەکە سنوری سروشتی دیاری دەکەن[2].

هەرچی سنوری باشوریەتی، بە گوێرەی قسەکانی ئەبولفیدا دەکرێت باس لەوە بکرێت شاری تکریت لەسەر ڕووباری دیجلە دواین شارە سەر بە هەرێمی جەزیرەیە و بە هەمان شێوە شاری هیت لەسەر ڕووباری فورات دواین سنوری ئەو هەرێمە لە باشور[3]، لەبەرئەوە دەکرێت بلّێین ئەو هێلّە تراویلکەیەی کە درێژدەبێتەوە لە هیت لەسەر ڕووباری فورات لە ڕۆژئاوا بۆ تکریت لەسەر ڕووباری دیجلە لە ڕۆژهەلات بۆتە سنوری دیاریکراو لە نێوان جەزیرە لە باکورو عێراق لە باشور، ئەوەش وای نیشاندەدا کە بۆتە سنوری باشور بۆ هەرێمی جەزیرە[4].

لەلایەکی دیکەش دیاریکردنی سنوری باکوری هەرێمەکە تاڕادەیەك ئاستەم بووە، هەرچەندە ئەبولفیدا بەشێك لە ئەرمینیای بە سنوری باکوری داناوە[5]، بەلام لەگەلّ ئەوەشدا زۆر دیاریکراو نەبووە، لەبەرئەوەی ئەو ناوچەیە هاوسنور بووە لەگەلّ ڕۆمەکان و بەردەوام شەڕوشۆڕ

---

١ تقويم البلدان، ص٢٧٣، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە نەخشەی ژمارە (٣)، لە لیستی پاشکۆکان.

٢ تقويم البلدان، ص٢٧٣، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محمد جاسم حمادي: الجزيرة الفراتية والموصل دراسة في التاريخ السياسي والاداري (١٢٧- ٣١٨هـ/ ٧٤٤- ٨٣٣م)، (بغداد: ١٩٧٧)، ص٣٩.

٣ تقويم البلدان، ص٢٨٩

٤. محمد جاسم حمادي: الجزيرة الفراتية والموصل، ص٤١.

٥ تقويم البلدان، ص٢٧٣.

له ئارادابووه، ئیتر ئەوەش کاریگەری هەبووە لەسەر ئەوەی لە بەشی باکوری هەندێك جار ئەو سنورە فراوان بێت و هەندێك جار بەرتەسکتر بێتەوەو بە ئاسانی دیاری نەکرێت[1].

دیارە لە دیاریکردنی سنوری هەرێمەکەش ولاتناسانی تر هەمان بیرو بۆچوونی ئەبولفیدا لەلایانەوە بەرجەستە دەکرێت[2].

ئەو هەرێمە لە دابەش کراوە بۆ سێ بەس کە ناوی هۆزەکانی عەرەب کراوە ئەوانیش بریتین لە دەڤەری بەکرو رەبیعەو موزەر[3]، هەرچی زۆرینەی دانیشتوانی هەرێمەکەیە بە تایبەتی بەشی سەروو لە هەرێمەکە لە باکوری رۆژهەلاتی پێك هاتبوون لە کوردان[4] و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر کۆن و ئەو ناوچەی کە کوردی تێدا ژیاوە ناسراوە بە (کادۆخیا) یاخود ولاتی کاردۆخیەکان[5]، ئەوەشیان گەواهی ئەوە دەدات کە کورد زۆر لە کۆنەوە لەو ناوچەدا بوونیان هەبووەو دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکە بوونە.

دووەم/ دیارترین شارەکانی:

١- روها (ئۆرفە):

شارێکی گەورەیە لە هەرێمی جەزیرەو کلێسایەکی گەورە[6] ی تێدا هەبووەو لە هەمان کاتدا زیاتر لە سێ سەد دێری کرستیانەکانی لێبووە[7]، ئەو شارە لەبەرئەوەی شارێکی کۆنە زۆرێك لە

---

١ زرار صديق توفيق: الكورد في العصر العباسي، ص٢٥.

٢ المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص ١٠٢، القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/ ٣١٨

٣تقويم البلدان، ص٢٧٣، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ئەو دەڤەرانەو شارەکانیان بڕوانە: المقدسی : احسن التقاسيم، ص ص ١٢٤- ١٢٥.

٤ حكيم احمد خؤشناو: الكرد وبلادهم، ص٨٩.

٥ زينفون: گەشتەکەی زینفۆن، وەرگێرانی بۆ ئینگلیزی: ریکس وارنەر، وەرگێڕانی بۆ کوردی : محەمەد مەسعود محەمەد، (هەولێر: ٢٠٠٦) ل ل ١٢٥- ١٣٤.

٦ کلێسای شاری روها (ئورفە) ستایش زۆر کراوە لەلایەن ولاتناسان بە جۆرێك بە یەکێك لە دیاردە سەرسوڕهێنەرەکانی جیهانی ناوزەند دەکەن و باس لەوە دەکەن ئەو ساختمانە و دامەزراوانەی لەبەرد دروستکراون هیچیان لە کلێسای ناوبراو جوانتر نین. ابن الفقية : مختصر كتاب البلدان، ص١٢٧، مولف مجهول : حدود العالم، ص١١٩.

٧ هەرچەندە ئەو ژمارەیە زێدەرۆیی تێدایە، بەلام سەرچاوەی تریش ئاماژەیان پێکردووە، ابن الفقية : مختصر كتاب البلدان، ص٢٧٧.

پاشماوەی شوێنەواری سەرسوڕهێنەری تێدایە، چونکە یەکێك بووە لە شارەکانی ڕۆم و نزیکە لە قەڵای ڕۆم لەبەشی باکوری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات[1].

٢- ماردین:

شارێکی سەخت و قایمە لەسەر چیایەکی بەرز بنیادنراوە کە بەرزیەکەی دوو فەرسەخ /١٢ کیلۆمەتر[2] ە، لەبەرسەختی و قایمی ناتوانرێت بەهێز بەسەریدا زاڵ بێت، ئەو شارە لەلایەن خۆیەوە دەکەوێتە نزیك شاری نەسیبین، تێدا جۆرە ماریك هەیە لە جۆرەکانی تری مار بەوە جیادەکرێتەوە کە بکوژ و کاریگەرن[3].

جێگای ئاماژەپێکردنە ئەبولفیدا شوێنگەی جوگرافی شارەکەی بە ڕوونی نەخستۆتەڕوو لەگەڵ ئەوەی کتێبەکەی تەواو جوگرافیە، هەربۆیە لێرەدا دەکرێت ئاماژە بەوە بکرێت ئەو شارە دەکەوێتە دەڤەری بەکرو دەروانێتە سەر شارەکانی دونیسرو داراو نەسیبین[4]، هەروەها زۆربەی دانیشتوانی شارەکە و دەوروبەری پێك هاتبوو لە کوردان و شارێکی ئاوەدان بووە[5].

٣- شمشاط (شیمشات):

بە گوێرەی وتەکانی ئەبولفیدا ئەو شارە لە سەنگەرەکانی پێشەوەی (ثغور) ی جەزیرەیەو دەکەوێتە نێوان شاری ئامەدو خرتبرت[6].

دیارە سەرچاوەکانی پێش ئەبولفیداش دەربارەی ئەو شارە باس لەوە دەکەن ((ئەو شارە سەنگەری پێشەوەی جەزیرەیەو دەکەوێتە کەنارەکانی ڕووباری فورات لە بەشی ڕۆژئاوای هەرێمەکەدا))[7].

---

١تقويم البلدان، ص٢٧٦.

٢ لە ڕاستیدا ئەو ژمارەیە زێدەڕۆیی تێدایە، چونکە (١٢) کیلۆمەتر دەکاتە (١٢) هەزار مەترو چیا لە جیهان لەشەش هەزار مەتر تێپەڕ ناکات.

٣ تقويم البلدان، ص٢٧٩.

٤ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٣٩، سەبارەت بەو شارانە لە لاپەڕەکانی دواتردا باسیان لێوەدەکەین.

٥ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، تحقيق: يحيى عبادة، (دمشق: ١٩٧٨)، ج٣، ق١/ ١٤٧.

٦ تقويم البلدان، ص٢٧٧.

٧ الاصطخري: المسالك والممالك، ص٥٣، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٣، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٣٦٢.

٤- راس العين (سەراكانی)[١]:

ئەو شارە لە ئاستی ڕووی زەوی نزمترەو تێدا سەرچاوەی زیاتر لە سێ سەد كـانی لێیـە[٢] و ئاوی ئەم كانیاوانەش سازگارن و بە هەر هەموویان ڕووباری خـابور دروسـت دەكـەن، هەرچـی هەڵكەوتەی شارەكەیە ئەوا لە ناوچە بەرایەكانی دەڤەری رەبیعەیە لە نزیك دەڤەری موزەر، لـە سەرچاوەكاندا باس لەوە دەكرێت ئەو شارە كەوتۆتە دەڤەری بەكر و كانیەكانی بۆتـە سەرچـاوە بۆ ڕووباری دیجلە، بەڵام لە راستیدا كەوتوونەتە هەڵەوە، دوو رۆژە ڕێ لە شاری حران دوورە[٣].

لێرەدا ناوبراو شوێنگەی جوگرافی بە گوێرەی دەڤـەرەكان دیـاریكردووەو نەپڕژاوەتـە سـەر ئەوەی كە دەكەوێتە نێوان شارەكانی حران و نەسیبین و دونیسر، نێوانی لەگـەڵ نەسـیبین پـانزە فەرسەخە/٩٠ كیلۆمەتر[٤].

هەروەها لە بارەی دانیشتوانی ((كورد زۆرینەی دانیشتوانی شارەكە پێك دەهێنن))[٥].

٥- میافارقین (فارقین)[٦]:

بنكەی دەڤەری بەكرەو دەكەوێتە نێوان هەرێمی جەزیرەو ئەرمینیا بەڵام وەكو شارێك وایـە لە هەرێمی جەزیرە، ڕێگای نێوان موسڵ و میافارقین بە حسنكێف (حصن كیفـا) شـەش رۆژە ڕێیەو هەمان ڕێگا بە مـاردین هەشـت رۆژە ڕێیـە، دەربـارەی نـاوی [٧]لەبـەر زۆری پیتـەكانی هەندێكی كەمكراوەتەوە بۆتە فارقین[١].

---

١ لە كاتی ئێستادا دەكەوێتە خاكی سوریا و پێشی دەگوترێت (عین الوردە)

٢ دەربارەی كانیاوەكانی ئیبن جوبەیر(م٦١٤ك/ ١٢١٧ز) گەریدە خۆی سەردانی ئەو شـارەی كـردووە و ئامـاژە بـەوە دەكات ناوی شارەكە پڕ بە پێستیەتی ناوچەكەیەو جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە كانیاوی زۆر بووەو لە دیارترین ئـەو كانیانەش (الصرار والزاهریة) یە. رحلة ابن جبیر المعروف تحت اسم (اعتبار الناسك في الاثار الكريمة والمناسك)، قدم لـه ووضع حواشية وعلق عليه: ابراهيم شمس الدين، (بيروت: ٢٠٠٣)، ص ص ١٨٩- ١٩٠.

٣ تقويم البلدان، ص٢٧٩

٤ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ١٤.

٥ ابن قطوبغا: تاج التراجم، حققه وقدم لە: محمد خير رمضان يوسف(دمشق:١٩٩٢)، ص٨٨.

٦ لە كاتی ئێستادا دەكەوێتە خاكی توركیاو هەمان ناوی هەیە.

٧ دەربارەی ناوی باس لەوە دەكرێت (میا) ناوی بنیادنەری شارەكەیەو (فـارقین) نـاوی شـارەكەیە، الانصـاري: نخبه الدهر في عجائب البر والبحر، ص٢٥٧، بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ناوی بڕوانە: فائزة محمد عزت: الكرد في

سەرچاوەی تریش لە بارەیەوە هەمان بۆچوون دەخەنەڕوو تەنانەت ئاماژە بەوە دەکەن ((کورد هەر لە سەردەمانی کۆنەوە لەو شارەدا نیشتەجێ بوونە))[2]، یاقووتی حەمەویش باس لەوە دەکات ((لە رۆژگاری ئێمەدا کوردە شامیەکان تێدا نیشتەجێ بوونە))[3].

٦- دارا:

دەربارەی ئەو شارە ناوبراو تەنیا باس لەوە دەکات یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی جەزیرەو دەکەوێتە بناری چیای ماردین[4]، کەچی لە سەرچاوەکانی تر زیاتر تیشکیان خستۆتە سەرو باس لەوە دەکەن ((دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری نەسیبین و ماردین))[5].

هەروەها لەبارەی ناوی شارەکەش باس لەوە دەکرێت پادشای ئەخمینی دارای سێیەم(٣٣٥-٣٣٠پ.ز)) بنیادی ناوە[6]، لەلایەکی تر باس لەوە دەکرێت سەربازگەی دارا لەو ناوچەیە بووە، دوای ئەوەی ئەسکەندەری مەقدونی(٣٣٦- ٣٢٣پ.ز) ڕووبەڕووی دارا بووەو کوشتی و لە شوێنی سەربازگەکە شارەکەی بنیادناو ناوی لێنا (دارا)[7].

هەرچی بوونی کوردە لەو شارەدا، ئاوا جەخت لەسەر ئەوە دەکرێت کە پێش هاتنی ئیسلامیش بوونیان هەبووە لەو شارەدا[8].

٧- نصيبين (نەسیبین):

بە بنکەی دەڤەری رەبیعە دادەنرێت و چیای جودی[9] دەکەوێتە بەشی باکوری و هەروەها خۆشی دەکەوێتە باکوری شاری سنجار (شنگال)[1]، ڕووباری هەرماس بە تەنیشت شارەکەدا تێپەڕ دەبێت،

---

اقليم الجزيرة وشهرزورفي صدر الاسلام من (١١٦الى ١٣٢هـ/٦٣٧- ٧٤٩م) دراسة في التاريخ السياسى، رسالة ماجستير غير منشورة مقدم الى كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل:١٩٩١)، ص٤٠.

١ تقويم البلدان، ص٢٧٩.

٢ ئەولیا چەلەبی : کورد لە مێژووی دراوسێکاندا ١٩٧٩، ل٩٠.

٣ معجم البلدان، ٥/ ٢٣٦.

٤ تقويم البلدان، ص٢٨١.

٥ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٤١٨، ابن سعيد المغربي: بسط الارض في الطول والعرض، ص٩٠.

٦ ياقوت الحموي: المشترك وضعا، ص١١٦.

٧ الانصاري: نخبة الدهر في عجائب البرو البحر، ص٢٥٦.

٨ ابن جبير: رحلة ابن جبير، ص١٨٨.

٩ سەبارەت بە چیای جودی لەگەڵ سروشتی جوگرافی کوردستان لەگەڵ چیاکان باسی لێوە کراوە .

شتێکی سەرسوڕهێنەری ئەو شارە خوای گەورە وایکردووە تەنیا گوڵی سپی تێدایەو هیچ جۆرە گوڵێکی سوری تێدا نیە، ماوەتەوە بڵێین ئەو شارە بەناوبانگە بە دووپشکە کاریگەرو بکوژەکانی[٢].

دیارە ئەو شارە لە هەرێمی جەزیرەدا شارێکی گرنگ بووە، چونکە لەسەر ڕێگای بازرگانی نێوان شام و موسڵ بووە[٣]، هەروەها نزیك بووە لە شاری ژەنگار بە دووری نۆ فەرسەخ/٥٤ کیلۆمەتر[٤].

٨- حصن کیفا (حسنکێف)[٥]:

ناوبراو دەربارەی ئەو شارە تەنیا باس لەوە دەکات، ئەو شارە دەکەوێتە دەڤەری بەکرو لەسەر ڕووباری دیجلەیە لە نێوان جەزیرەی ئیبن عومەر و میافارقینەوەیە[٦].

یەکێك لە شارناسەکان لە بارەیەوە ئاماژە بەوە دەکات ((لە ڕابردوودا شارێکی گەورە بووە بەڵام لە کاتی ئێستادا وێرانی بە چەند لایەکیەوە دیارە))[٧]، هەروەها لە بارەی بوونی کوردیش تێدا ئەوا ڕۆژهەڵاتناس میجرسون دەڵێت: ((دانیشتوانی بە درێژایی مێژوو هەر کورد بوونە))[٨].

٩- جەزیرەی ئیبن عومەر[٩] (جەزیرەی بۆتان):

---

١ لەلاپەڕەکانی دواتر قسەی لەسەر دەکرێت.

٢ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٣ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٢٨٨، ابن سعيد المغربي: بسط الارض في الطول والعرض، ص٨٩.

٤ القزويني: اثار البلاد واخبار العباد، ص٤٦٧.

٥ دەربارەی ناوی لە یەکێك لەسەرچاوەکاندا بە (حصن کیبا) ناوی هاتووە. ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٢٦٥، وە لەلای ڕۆمانەکانیش بە (کیفس یاخود کیف) ناوی هاتووە و ناسراوە، لسترنج: بلدان الخلافه الشرقيه، ص١٤٥، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: سيپان حسن علي بنگلي: حصن كيفا (٦٠٠- ٧٠٠ هـ/ ١٢٠٠- ١٣٠٠م) دراسة في تاريخها السياسيي والحضاري، (دهۆك :٢٠٠٥) ص ص ٢٥- ٢٧.

٦ تقويم البلدان، ص٢٨١.

٧ المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص١٠٤.

٨ رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان، نقله الى العربية وحققه وقدم له: فؤاد جميل، (بغداد:١٩٧٠)، ١/ ١٠٦.

٩ دەربارەی ناوی و لەلایەن کێیەوە بنیادنراوە بیرو بۆچوون زۆرە، بەڵام ناوی ئیبن عومەر دەگەڕێتەوە بۆ (حەسەن کوڕی عومەری کوڕی خەتابی تەغلوبی) کە دووبارە شارەکەی نۆژەنکردەوەو پێشتر شارەکە بوونی هەبووە، لەبەرئەوە یەکێك لە مێژوونووسان باس لەوە دەکات پێش ئەوەی ناو بێتە ئیبن عومەر ناوی ((جەزیرەی کوردان)) بووە. بان شداد: الاعلاق الخطيرة، ج٢/ ٢١٣، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی ناوی و مێژووی

شارێکی بچووکە لە هەرێمی جەزیرەو دەکەوێتە خۆرهەڵاتی ڕووباری دیجلەو لە هەمان کاتدا ڕووباری دیجلە بە دەوریا دەسوڕێتەوە وەکو دەمە داسێك، ئەو شارە لەلایەن خۆیەوە دەکەوێتە باکوری شاری موسڵ[1].

شایەنی باسە ئەو شارە لەلایەن ئەبولفیدا وەکو شارێکی بچووك ناوی هاتووە، کەچی لەلای هەندێك لە وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زاینی وەکو شارێکی گەورەو گەشاوە باسیان لێوەکردووە[2]، بەهەمان شێوە ئیبن بە توتەی گەڕیدەش (م٧٧٩ك/ ١٣٧٧م) لەدوای ناوبراو هاتووە وەکو شارێکی گەورەو گەشاوە باسیکردووە[3].

دیارە جیاوازی لە بیروڕاکانیش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ڕەنگە لەسەرەتادا شارێکی گەورەبووە، بەڵام لە نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی/ سێزدەهەمی زاینی وەکو زۆرێك لە شارەکانی تری هەرێمی جەزیرە تووشی هێرش و کاولکاریەکانی مەغۆل بووە، ئەوەش وایکردووە شارەکە بەرەو دواوە بێت و تووشی بچووك بوونەوە بێت، بۆیە ئەبولفیدا وەکو شارێکی بچووك ناوی هێناوە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت هێرشی مەغۆلەکان زۆری نەخایاندو دووبارە ئارامی و ئاسایش باڵی کێشا بەسەر ناوچەکەو دووبارە شارەکانی نەش و نمایان کردو گەشانەوەو گەورەبوون، هەر بۆیە لەسەردەمانی دواتردا وەکو شارێکی گەورە باسی لێوەکراوە[4].

١٠- سنجار (شنگال):

شارێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی وشکانی دەڤەری ڕەبیعەو نزیکە لە چیای سنجار، لەبەرئەوە ناوی شارەکە هەر بەناوی چیاکەوە کراوە، یەکێکە لە شارە خۆشەکان و دەکەوێتە باشوری نەسیبین لە هەرێمی جەزیرەو سێ قۆناغ لە موسڵەوە دوورە[5].

---

بنیادنانی شارەکە بڕوانە: سلام حسن طه: جزيرة ابن عمر في القرنين السادس والسابع الهجري/ الثاني عشر والثالث عشر الميلاديين دراسة سياسية حضارية، (اربيل :٢٠٠٦) ص ص ٢٥- ٣١.

١ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٢ المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٢٧، مولف مجهول: حدود العالم، ص١١٩.

٣ رحلة ابن بطوطة، ص١٥٢.

٤ سلام حسن طه: جزيرة ابن عمر، ص٢٤.

٥ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

سەرچاوەکانی تریش هەمان بۆچوونیان هەیە لە بارەی شارەکەو تەنانەت جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە ((دیمەشقێکی بچووکراوەیە))[1]، هەروەها لە بارەی دانیشتوانی باس لەوە دەکرێت زۆرینەی کورد بووە[2].

١١- داقوقا (داقوق):

بە گوێرەی وتەکانی ئەبولفیدا یەکێکی ترە لە شارەکانی ئەو هەرێمەو پێنج رۆژە رێ لە هەولێرەوە دوورە، سەرچاوەی ئاویشی لە چیای حەمرینەوەیە[3]و لە هەمان کاتدا خاکەکەشی بە پیتە[4].

لێرەدا ناوبراو کەوتۆتە هەڵەوە کاتێك باس لەوە دەکات سەرچاوە ئاوییەکانی لەچیای حەمرینەوەیە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ڕێزە چیایە چیای دولان (ناساز)ە، نەوەك چیای حەمرین[5].

١٢- حیزان (هیزان):

یەکێکە لەو شارانەی دەکەوێتە دەڤەری بەکرو تێدا داروباری زۆرە بەتایبەتی شابەروو، چونکە دەکەوێتە ناوچە چیایەکان و ئاویشی زۆرە[6].

سەبارەت بەو شارە سەرچاوەکانی دیکەش جەخت لەسەر قسەکانی ئەبولفیدا دەکەنەوەو زانیاریەکی زیاتر ناخەنە ڕوو تەنیا لە بارەی شوێنی جوگرافی باس لەوە دەکەن ((شارێکە لە دەڤەری بەکرو دەکەوێتە نزیك شاری سعرت[7].

لەلایەکی تر یەکێك لە توێژەران ئاماژە بەوە دەکات کورد لەسەردەمانێکی کۆندا بوونیان هەبووە لەو شارەدا[8].

١٣- موسڵ[1]

---

١ ابن حوقل: صورة الارض، ص١٩٩، المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٢٧، القزويني : اثار البلاد، ص٣٩٣.

٢ ابن بطوطة: رحلة ابن بطوطة، ص١٥٢، ابن قطوبغا: تاج التراجم، ص٣٠٤.

٣ لەگەڵ سروشتی جوگرافی کوردستان لەگەڵ چیاکان باسی لێوەکراوە.

٤ تقويم البلدان، ص٢٨٧.

٥ محمد جميل بندي رۆژبەیانی: مدن كردية قديمة: تاريخها و جغرافيتها وعلماؤها وادباءها، (السلمانية:١٩٩٩)، ص٥٠.

٦ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٧ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٣٣١، القزويني : اثار البلاد، ص٣٦٠.

٨ فائزة محمد عزت: الكرد في اقليم الجزيرة وشهرزور، ص٤٤

به بنکەو پایتەختی هەرێمی جەزیرە دادەنرێت و دەکەوێتە کەناری خورئاوای رووباری دیجلەو لەبەرامبەریدا لە کەناری خۆرهەلاتی شاری نەینەوایە[2] . ئەو شارە دوو شورەی هەبووە، بەلام هەندێکی تێکچووەو لە شورەی شاری دیمەشق گەورەتربووە، بەلام ئەبولفیدا ئاماژە بەوە دەکات لە رۆژگاری ئێمەدا سێ لە سەر چوای ماوە، لە موسڵەوە تا میافارقین شەش رۆژە ڕێیە ئەگەر بە حسنکیف دابڕۆیت وە ئەگەر بە ماردین دا بڕۆین هەشت رۆژە رێیە[3] .

لەلایەکی تریش دەربارەی بوونی کورد لەو شارەدا باس لەوە دەکرێت ((کوردەکان لە دەرەوەی شاردا لەوەڕگایان هەبووە بەتایبەتی هۆزەکانی حەمیدی و لاری هەزبانی))[4] .

١٤- سعرت (سیعرت)[5]:

ئەو شارە دەکەوێتە نزیك رووباری دیجلە بەلای باکوری خۆرهەلاتیە، ماوەی رۆژو نیویێك لە میافارقینەوە دوورە، هەروەها چوار رۆژ بە ئامەدو پێنج رۆژیش لە موسڵیشەوە دوورە[6] .

١٥- ئامێد (دیاربکر):

یەکێکە لە شارە قایم و دژوارەکانی هەرێمی جەزیرەو شارێکی کۆنە دەکەوێە بەشی خۆرئاوای رووباری دیجلە، هەروەها قەلاو شورەیەکی قایم و سەختی هەبووە، کاتێك شورەکەی لەبەردی رەش دروستکراوەو لەوپەڕی بەهێزی دایەو نە ئاسن و نەئاگر کاری تێناکات[1] .

---

١ دەربارەی ناوی بۆچوون لە ئارادایە. ئەوەتا باس لەوە دەکرێت لەبەرئەوەیە پێی دەگوترێت موسڵ، چونکە دیجلەو فورات بەیەکەوە دەبەستێ، یاخود جەزیرەو عێراق بەیەکەوە دەبەستێ، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٢٢٣، الانصاري: نخبة الدهر، ص٢٥٥.

٢پێش فەتح کردنی ئەو شارە لەلایەن موسلمانەکان پێك هاتبوو لە دوو قەلا لەسەر کەنداوی دیجلە یەکێکیان لە رۆژهەلات پێیدەگوترا نەینەوا لەژێر دەستی فارسەکان بوو ئەویتریان لە رۆژئاوا پێی دەگوترا موسڵ لە ژێر دەستی ڕۆمەکان بوو. الانصاري: نخبة الدهر، ص٢٥٥.

٣ تقويم البلدان، ص٢٨٥.

٤ ابن حوقل: صورة الارض، ص١٩٥.

٥ بەزۆر شێوە ناوی هاتووە وەکو (اسعرد- سعرت — ساعرد- سعرد)و هەروەها باس لەوە دەکرێت ئەو ناوە وشەیەکی کوردی لێکدراوە پێك هاتووە لە (سی ) بە وتای سێ دێت وە (عرد) بە واتای زەوی دێت واتە (سێ زەوی)، بۆچونێکی تر باس لەوە دەکات ئەو شارە دووجار تێکدراوە بۆ جاری سێیەم بنیادنراوەتەوە . لەبەرئەوە ناوی لێنراوە (سیعرت) فائزة محمد عزت: الكرد في اقليم الجزيرة، ص٤٢.

٦ تقويم البلدان، ص٢٨٩.

جێگای باسە سەرچاوەکانی دیکەش جەخت لەسەر قایمی و بەهێزی شارەکە دەکەنەوە لەبەربوونی قەڵاو شورە مێژوویەکەی[2]، هەروەها تێدا چەند هۆزێکی کورەی تێدا نیشتەجێبوونە وەکو هۆزی حەمیدی و لاری هەزبانی[3].

١٦- ثمانين (هەشتیان)[4]:

ئەبولفیدا لەلایەن خۆیەوە وەکو گوندێك باسی لێوە کردووە ئاماژە بەوە دەکات کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە بە کەمتر لەڕۆژێك[5]، کەچی لەسەرچاوەکانی تر زیاتر شوێنی جوگرافیایان بەدیارخستووە، بەشێوەیەك باس لەوە دەکەن شارۆچکەیەکە دەکەوێتە نزیك چیای جودی لە نزیك جەزیرەی ئیبن عومەرە لە سەرووی موسڵەوەیە[6]، هەروەها ئەو شارۆچکەیە مێژوویەکی کۆنی هەیە کاتێك باس لەوە دەکرێت یەکەم شوێنە ئاوەدانکراوە دوای لافاوی پێغەمبەر نوح (خوا لێی ڕازی بێت)، دوای ئەوەی دەچوو لە کەشتیەکەی هەشتا کەسی لەگەڵدا بوو ئەو شوێنەیان ئاوەدانکردەوەو خانوویان تێدا دروست کرد[7]، هەرچی بوونی کوردە تێدا ئەوا مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر کۆن و لە هەشتایندا نیشتەجێبوونە[8].

---

١ تقويم البلدان، ص٢٨٧، بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی قەڵاو شورەی شارەکە بڕوانە: بەشی چوارەم، ل١٦٩.

٢ الثعاليي: ثمار القلوب في المضاف والمنسوب، تحقيق: محمد ابو الفضل ابراهيم، (القاهرة:١٩٦٥)، المستوفي القزويني، نزهة القلوب، ص١٠٣، القلقشندي: صبح الاعشى، ٣٢٧/٤.

٣ ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٥.

٤ تا ئێستا وەکو گوندێك ماوەو ژیان تێدا بەردەمەو دەکەوێتە قەزای شرناخ لە خاکی تورکیا، سلام حسن طه: جزيرة ابن عمر، ص٣٢.

٥ تقويم البلدان، ص٢٧٥.

٦ الهروي: الاشارات الى معرفة الزيارات، تحقيق: جانين سورديل، (دمشق:١٩٥٣)، ص٦٩، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٨٤.

٧ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٦، المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٢٧، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٨٤.

٨ الهمذاني: صفة الجزيرة، ص٢٤٧.

# تەوەرەی چوارەم

## هەرێمەکانی ئەرمینیاو ئاران و ئازربیجان

ئەو هەرێمانەش بەشێکی دیکە بوونە لەو ناوچانەی کورد هەر لە سەردەمانێکی کۆندا تیایاندا نیشتەجێبوونەو بوونیان هەبووە.

ئەبولفیدا لە کتێبەکەی خۆیدا وەکو ژمارەیەك لە وڵاتناسانی دیکە هەرسێ هەرێمی بەیەکەوە باسکردووەو لەم ڕووەوە ئاماژە بەوە دەکات ((ئەوانەی لەو بوارەدا کاریان کردووە هەر سێ هەرێمیان بەیەکەوە باسکردووە، لەبەرئەوەی لە تەنیشت یەکترن و هاوتێنکی یەکترو زەویەکانیان تێکەڵاوی یەکترە))[1]، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە لە زۆر لایەنەوە لەیەکتر نزیکت وەکو لایەنی جوگرافی و کارگێڕی و ڕامیاری و نەژادیەوە[2]، سەرەڕای ئەوەش لای هەندێك وڵاتناس ناوێکی تایبەتی بۆ بەکارهێنراوە، هەروەکو ئەلمقدسی هەرسێ هەرێمی کردووە بەیەك و لەژێر ناوێکدا بەناوی (الرحاب)، لەبەرفراوانی و خۆشی و زۆری بەروبوومەکانی، لە هەمان کاتدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئاران سێیەکی ڕووبەری ئەو هەرێمە پێك دەهێنێ[3]، ئەوەش لە کاتێکدایە هەندێك لە وڵاتناسی دیکە هەریەکێك لەو

---

١ تقويم البلدان، ص٣٨٦.

٢ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١٠٨، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٥، مؤلف مجهول: حدود العالم، ص١١٩.

٣ احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ص٢٨٦.

هەرێمانەیان بە جیا باسکردووە وەکو یاقوتی حەمەوی[1] هەریەك لەو هەرێمانەی بە پێی سنوری خۆی ئاماژە پێکردووە قەزوینیش بە هەمان شێوە[2].

**یەکەم/ دیاریکردنی سنوری جوگرافی:**

هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد، ناوبراو هەرسێ هەرێمی بەیەکەوە باسکردوە لەنێو هەرێمێکداو سنوری بەو شێوەیە دیاریکردووە ((لە ڕۆژئاوای سنوری وڵاتی ڕۆم و بەشێك لە سنوری هەرێمی جەزیرەیە، لە باشوری بەشێك لە سنوری هەرێمی جەزیرەو وڵاتی عێراقە، لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی جیل[3] و دەیلەم بۆ دەریای خەزەرە (قەزوین)، لەلای باکوری دەورەدراوە بە چیای قیتق (قەوقاز)[4]))[5].

دواتر هاتووە سنوری ئازربیجانی[6] بە جیاباسکردووە بەو شێوەی خوارەوە، ئازربیجان دەورەدراوە لەبەشی ڕۆژهەڵاتی وڵاتی جیل و تەواوی سنوری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی دەیلەمە، لە باشوری عێراق لە پشتەوەی حولوان و شتێك لە سنوری جەزیرەیە، لە ڕۆژئاوای ئەرمینیایە[7]، کەچی باس لە سنوری باکوری ناکات ڕەنگە ئەوەشیان زیاتر لەبەر ئەوە بێت لای باکوری ڕووباری (الرس) ئاراسە[8] کە خۆی بۆتە سنورێکی سروشتی جیاکەرەوە لەنێوان ئازربیجان و ئاران[9].

---

١ معجم البلدان، ئازربیجان، ١/ ١٢٨، ئاران، ١/ ١٣٦، ئەرمینیا، ١/ ١٥٩.

٢ اثار البلاد واخبار العباد، ص٢٨٤.

٣ وڵاتی جیل: ناوی وڵاتێکی زۆرەو دەکەوێتە دواوەی وڵاتی تەبەرستان، لەم وڵاتەدا شاری گەورە نیە بەڵکو زیاتر گوندن لە نێوان چیاکاندا، وە لەلای فارسەکان بە وڵاتی جبل دەڵێن (گەیلان) . یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٢/ ٢٠١.

٤ لەگەڵ سروشتی جوگرافی کوردستان لەگەڵ چیاکانی باسی لێوە کراوە.

٥ تقویم البلدان، ص٣٨٦، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: نەخشەی ژمارە (٤) لە لیستی پاشکۆکان.

٦ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی هەرێمی ئازربیجان بڕوانە: ل١٣٢، هەروەها نەخشەی ژمارە (٤) لە لیستی پاشکۆکان.

٧ تقویم البلدان، ص٣٨٦.

٨ لەگەڵ سروشتی جوگرافی کوردستان لەگەڵ رووبارەکان باسی لێوە کراوە .

٩ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٥، بۆ زیاتر زانیاری بروانە: حسام الدين النقشبندی: ئازربیجان، (٤٢٠-٦٥٤هـ/ ١٠٢٩- ١٢٥٦م) دراسة في احوالها السياسية والحضارية، اطروحة دكتوراة غير منشورة، مقدمة الى كلية الاداب- جامعة بغداد، (بغداد:١٩٨٤)، ص٣٧.

هەرچی ئەرمینیایە[1] ئەوا دابەشیکردووە بۆ سێ بەش، یەکەمیان پێك هاتووە لە (قالیقلا- خەلات – شیمشات)، دووەم پێك هاتووە لە (خزران- تەفلیس – باب اللان)، وە سێیەم پێك هاتووە لە (بەرذەعە- بەیلەقان – باب الابواب)[2].

هەروەها ئاماژە بەوە دەکات هەندێك لە وڵاتناسان ئەرمینیا دابەش دەکەن بۆ چوار بەش، لە یەکەمەوە تاوەکو چوارەم و هەریەکەیان چەند شارێك لە خۆ دەگرێت[3].

لەبەر ڕۆشنایی دابەشکردنەکان و دیاریکردنی سنوری هەرسێ هەرێمەکە بە گشتی دەکرێت سنوری جوگرافی ئەرمینیا بەو شێوەیە دیاریبکرێت، لە ڕۆژهەڵاتی دەورەدراوە بە هەردوو هەرێمی ئازربیجن و ئاران، لە ڕۆژئاوای هاوسنورە لەگەڵ وڵاتی ڕۆم بەتایبەتی ناوچە سنوریەکان (ثغور)، لە باکوری چیای قەوقازە، لە باشوری دەڤەری بەکرە لە هەرێمی جەزیرە[4].

دەربارەی ئارانیش[5] لەبەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانی ناوبراو دەکرێت بەو شێوەیە سنوری دیاریبکرێت، لە ڕۆژهەڵاتی دەریای خەزەر (قەزوین) لە ڕۆژئاوای ئەرمینیایە، لە باکوری زنجیرە چیاکانی قەوقازە، لە باشوری باشوری ڕۆژهەڵاتی ئازربیجانە[6].

**دووەم / دیارترین شارەکانی:**

بەو پێیەی ئەبولفیدا هەرسێ هەرێمی بەیەکەوە باسکردووە، لە هەمان کاتدا شارەکانیشی بەیەکەوە باسکردووە، لە هەمان کاتدا شارەکانیشی بەیەکەوە باسکردووە، بەڵام لێرەدا ئەو

---

١ بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی هەرێمی ئەرمینیا بڕوانە:ل١٣٧.

٢ تقويم البلدان، ص٣٨٧.

٣ ابن خرداذبة: المسالك والممالك، ص١٠٨، منجم باشي: جامع الدول، (باب في الشدادية) نشرة جمال رشيد احمد مع كتاب لقاء الكرد واللان (اربيل :٢٠٠١)، ص٢٥٤.

٤ تقويم البلدان، ص ص ٣٨٦- ٣٨٧ وڵاتناسانی تریش بەو شێوەیە سنوریان دیاریکردووە، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٥، القزوينى : اثار البلاد، ص٤٩٥، القلشندى: صبح الاعشى، ٤/ ٣٥٤، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: نەخشەی ژمارە (٤) لە لیستی پاشکۆکان .

٥ بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی هەرێمی ئاران بڕوانە: ل١٣٦.

٦ تقويم البلدان، ص٣٨٧، وڵاتناسانی پێشوو تریش بەو شێوەیە سنوریان دیاریکردووە. ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٦، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ١٣٦، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە نەخشەی (٤) لە لیستی پاشکۆکان.

شارانەی لەو هەرێمانەدا کوردیان تێدا ژیاوە هەوڵ دەدەین هەر هەرێمێك بە جیا باسی لێوە بکەین بۆ ئەوەی زیاتر ڕوونتره بەرچاوتر بێت بەو شێوەیەی خوارەوە:

أ- ئازربیجان[1]:

یەکێکە لەو هەرێمانەی کەوا کورد لە کۆنەوە تێدا ژیاوەو بە نیشتمانی دایکی زانیوەوە، زیاتر کورد لەو هەرێمەدا لەبەشەکانی باشورو رۆژئاوای نیشتەجێبوونە، ئەو ناوچەیەش زیاتر درێژکراوەی هەردوو هەرێمی چیاو جەزیرەن کە دوو نیشتمانی ڕاستەقینەی کوردن[2].

دیارە ئاماژەکردنی کوردیش لەو هەرێمەدا لەلایەن مێژوونووس و وڵاتناسان دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری فتوحاتی ئیسلامی بۆ ئەو ناوچەیە کاتێك ئاماژەیان بە کوردەکانی دەشتەکانی بلاسجان و ساترودان و چیای سبلان کردووە[3]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی مەسعودی ئاماژە بە ژمارەیەك هۆزی کوردی دەکات کە لەو ناوچەیەدا ژیاون، وەکو هۆزی جەلالی و هەزبانی زرزاری و ماجردانی[4].

سەبارەت بەو شارانەی کە لەو هەرێمەدا کوردیان تێدا ژیاوە بریتین لەمانەی خوارەوە :

١- ارمیە (ورمێ)[5]:

یەکێکە لە شارە گەورەکانی ئەو هەرێمەو دەکەوێتە کەناری رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ لە کۆتایی سنوری ئازربیجان، باس لەوە دەکرێت زەردەشت پێغەمبەر خەڵکی ئەو شارەیە و شانزە فەرسەخ/٩٦ کیلۆمەتر لە سەلماس دوورەو چل فەرسەخیش/٢٤٠ کیلۆمەتر لە موسڵ دوورە[6].

---

١ سەبارەت بەناوی کۆنەوە بە زۆر شێوە هاتووە. وەکو (ئەتروپاتین) لای بۆتانەکان و (ئەتروباتکان) لای ئەرمەنەکان، بەڵام ئازربیجان زاراوەیەکی عەرەبیەو لەوانی دیکە وەرگیراوە لە هەموویان زیاتر باو بووەو بەکارهاتووە. حسام الدین النقشنبدی: ازربیجان، ص ص٣٤- ٣٨.

٢ حکیم احمد خۆشناو: الکورد وبلادهم، ص١١٠.

٣ البلاذري: فتوح البلدان، ص١٩٦، ابن الفقیة: مختصر کتاب البلدان، ص٢٨٦، قدامة بن حعفر : الخراج وصناعة الکتابة، ص٣٧٨.

٤ التنبیة والاشراف: ص ص ٧٨، ٩٤. وینظر ایضا کتابه: مروج الذهب، ٢/ ١٠٨.

٥ بەچەند شێوەیەك ناوی هاتووە وەکو (ارمیە- ارومیە)، بەڵام ئەوەی زیاتر باو بووە (ارمیە) و کوردەکانیش پێی دەڵێن (ورمێ) حسام الدین النقشبندی: اژربیجان، ص٧٨.

٦ تقویم البلدان، ص٣٩٧.

وڵاتناسانی تریش هەمان بۆچوونیان هەیە لە بارەی وتەکانی ئەبولفیدا[1] و تەنانەت مستەوفی قەزوینی لەسەردەمی خۆیدا وەکو ((شارێکی گەورەو ئاوەدان)) باسیکردووە[2]، هەروەها دیارترین هۆزی کوردی نیشتەجێی ئەو شارەش هەزبانیەکانن[3].

٢- سلماس (سەلماس):

ئەو شارە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ، ئەوەش دوایین سنوری ئازربیجانە لە رۆژئاوا، نێوانی لەگەڵ شاری خۆی حەوت فەرسەخە/٤٢ کیلۆمەتر، لەگەڵ شاری ورمێ شانزە فەرسەخە/٩٦ کیلۆمەتر[4].

جێگای ئاماژە پێکردنە کورد بە رێژەیەکی بەرچاو لە ناوەوەو دەرەوەی شارەکەدا نیشتەجێی بوونە[5].

٢- مەراغە:

بەبنکەو پایتەختی هەرێمی ئازربیجان دادەنرێت و دەکەوێتە رۆژئاوای شاری تەورێز[6] و نێوانیان حەڤدە فەرسەخە/ ١٠٢ کیلۆمەتر، هەروەها باس لەوە دەکرێت مەراغە شارێکی نوێیەو پێشتر گوندبووە مەروانی کوڕی محەمەد (١٢٧- ١٣٢ك/ ٧٧٤- ٧٤٩ز) لە کۆتایی دەوڵەتی ئومەویەکان سەربازگەی خۆی تێدا دامەزراندو لەوێدا وڵاغ و ئاژەڵەکانیان دەلەوەڕاند، دواتر شارەکەیان بنیادناو ناوی لێنرا مەراغە کە شارێکی پاك و پێگەردو بەخێرو بێر بووە[7]، لە هەمان کاتدا کوردەکانی هۆزی ڕەوادی و هەزبانی تێدا نیشتەجێ بوونە[8].

٤- تبریز (تەورێز):

---

١ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٩، القزويني: اثار البلاد، ص٤٩٥، القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/٣٦٠.

٢ نزهة القلوب، ص٩٩.

٣ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٩.

٤ تقويم البلدان، ص٢٩٧. سەرچاوەکانی تریش جەخت لەسەر قسەکانی ناوبراو دەکەنەوە. المقدسی: احسن التقاسيم، ص٢٨٤، القزويني: اثار البلاد، ص٣٩١.

٥ ابن حوقل: صورة الارض،ص٢٨٩، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٨٤، لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ص٢٠٠.

٦ شاری تەورێز لە لاپەڕەکانی دواتر باسی لێوە دەکەین، ل١٣٤.

٧ تقويم البلدان، ص٣٩٩، دەربارەی ئەو شارە وڵاتناسانی تریش هەمان بۆچوونیان هەیە. المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص٨٧، الحميری: الروضی المطار في خير الاقطار، تحقيق: احسان عباس، (بيروت:١٩٨٤)، ص٥٣٥.

٨ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٩، حسام الدين النقشبندي: اذربيجان، ص١١٤.

یەکێکە لە شارە گەورەو بەناوبانگەکانی هەرێمی ئازربیجان و دەکەوێتە باکوری خۆرهەلاَتی دەریاچەی ورمێ و لە گەورەیا هێندەی شاری خوی دەبێت[١].

شایەنی باسە بیروبۆچوونی ولاَتناسان لەبارەی ئەو شارەدا جیاوازە، ئەوەتا ولاَتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زاینی لە شارە گەورەو بچووك باسیان کردووە[٢]کەچی گەڕیدەو ولاَتناسانی سەردەمی دواتر بە یەکێك لە شارە گەورەو ئاوەدان و بەناوبانگەکانی ئەو هەرێمە باسیان کردووە[٣]، ڕەنگە بۆچوونەکانی ئەبولفیداش لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کەوا لە سەردەمی ئەودا شارێکی گەورەو ئاوەدان بووە، هەر بۆیە بە شاری خۆی بەراوردی دەکات.

٥- مرند (مەرند):

شارێکە لە هەرێمی ئازربیجان و نزیکە لە شاری تەورێز، هەروەها ئەو کەسانەی بینیوویانە باس لەوە دەکەن شارێکی بچووکە[٤] ونێوانی لەگەلْ شاری تەورێز چواردە فەرسەخە/٨٤ کیلۆمەتر[٥].

٦- خۆی :

ئەو شارەش لەلایەن خۆیەوە دەکەوێتە رۆژئاواو مەرندو نێوانیان دوانزە فەرسەخە/٧٢ کیلۆمەتر[٦].

دیارە ئەو شارە لە سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زاینی شارێکی مام ناوەند بوو لە گەورەیا[٧]، بەلاَم دواتر گەشانەوەیەکی بەرچاوی بە خۆیەوە بنیووە، هەربۆیە ولاَتناسانی سەردەمی دواتر بە شاری گەورەو بەناوبانگ لە قەلْەمیان داوە[٨].

---

١ تقويم البلدان، ص٤٠١.

٢ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١٠٨، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٩، مولف مجهول: حدود العالم، ص١٢٠.

٣ ناصر خسرو: سفرنامة، ترجمة: يحيى الخشاب، (القاهرة: ١٩٤٥)، ص٥، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١٣/٢، المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص٧٥.

٤ ئەو بۆچوونە ولاَتناسانیش پشت راستی دەکەنەوە کاتێك باس لەوە دەکەن یەکێك بووە لە شارە بەناوبانگەکان، بەلاَم تووشی تێکچوون هاتووە تەنیا ماوە. ياقوت الحموى: معجم البلدان، ٥/ ١١، المستوفى القزويني: نزهه القلوب، ص٨٨.

٥ تقويم البلدان، ص١٠٤.

٦ المصدر نفسه، ص٣٩٧.

٧ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٩، مولف مجهول: حدود العالم، ص١٢١.

٨ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٤٠٨، القزويني: اثار البلاد، ص٣٥٤.

٧- میانه (میانج — مەیانه):

یەکێکی دیکەیە لـە شـارەکانی ئـەو هەرێمـەو دوو رۆژە ڕێ لـە شـاری مەراغـە دووره، هەروەها خەڵکی شارەکە پێی دەڵێن (مەیانه)[١] و شارێکی گەورەیە[٢].

ب- هەرێمی ئاران[٣]:

یەکێکی ترە لەو هەرێمانەی کورد لە پاڵ نەتەوەکانی تردا تێدا ژیاوە[٤]، هەروەها دیـارترین هۆزی کوردی نیشتەجێی ئەو هەرێمە کوردەکانی شەدادین کە بنەماڵەیەکن لە تیرەکانی ڕەوادی و ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە تیرەیەکن لە هۆزی هەزبانی[٥].

دیارترین شارە کوردنشینەکانی ئەو هەرێمەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- البیلقان (بەیلەقان)[٦]:

یەکێکە لە شـارە بەناوبانگـەکانی ئـەو هەرێمـەو نێـوانی لەگـەڵ شـاری وەرثـان[٧] شـەش فەرسەخە/٣٦ کیلۆمەتر، خاکێکی بەپیت و بەرهەمی هەبووه[٨].

٢- گنجه (جنزه):

---

١ مەیانه: بەمانای ناوەراست دێت، لەبەرئەوەی لە هەردوو شاری مەراغە و تەورێز بیسـت فەرسـەخە/ ١٢٠، کیلۆمەتر دووره.

٢ تقويم البلدان، ص٤٠١.

٣ لەسەرچاوە کۆنەکاندا بەتایبەتی یۆنانیەکان بە (البانيا) ناوی هاتووە واتە (نەتەوە، گەل) دواتر لای یۆنانیە نوێیەکان بوو بە (اربانا) و لە سەرچاوە عەرەبیەکانیش بە (الران ياخود ئـاران) نـاوی هـاتووە، مولـف مجهـول: حدود العالم، ص١١٩، ياقوت الحموي: المشترك وضحا، ص١٩، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: اسماعيل شـكر رسـول: الاماره الشداديه الكرديه في بلاد اران، (اربيل:٢٠٠١)، ص٣٤.

٤ قدامة بن جعفر: الخراج وصناعة الكتابة، ص٣٢٨، المسعودي: التنبية والاشراف، ص٩٤.

٥ ابن حوقل: صورة الارض،ص ص ٢٠٥، ٢٨٩، بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی شوێنی بڵاوبوونەوەیان بڕوانـە: زرار صديق توفيق: القبائل والزعامات القبليه في العصر الوسيط، (اربيل:٢٠٠٧)، ص ص٩٧- ٩٩، ١٧٣- ١٧٤.

٦ لەسەرچاوە ئەرمەنیەکان ناوی بە (فیداکاران) هـاتووەو نـاوێکی کوردیـە، اسماعيـل شـكر رسـول: الامـارة الشدادية، ص٤٠.

٧ وەرثان: شارێکە لە کۆتایی سنوری ئازربیجان، یاقوتی حەمەوی نێوانیان بە حەوت فەرسەخ/٤٣ کیلۆمـەتر مەزەندە دەکات، معجم البلدان، ٥/ ٣٧١.

٨ تقويم البلدان، ص٤٠٥.

یەکێکی دیکەیە لە شارە بەناوبانگەکانی هەرێمی ئاران و دەکەوێتە رۆژئاوای شاری بەرذەغمەو دوو قۆناغ لێیەوە دوورە[1].

دیارە لای ناوبراو تەنیا بە کنجە ناوی هاتووە، کەچی لای هەندێك ولاّتناس بە(جنزە) ناوی هاتووە[2]، هەروەها ئەو شارە پێش ئیسلامیش بوونی هەبووەو گەورەترین ئاگردانی زەردەشتی لێبووە، دوای فەتحکردنی لەلایەم موسڵمانەکان لە ساڵی (٣٩ك/٦٥٩ز) دووبارە نۆژەنیانکرایەوە، هەر بۆیە پێی گوتراوە کنجە، واتە شارە نوێیەکە[3].

٣- باب الابواب (دەربەند):

یەکێکە لەو شارانەی دەکەوێتە ئەوپەڕی باکوری ئاران لەسەر کەناری دەریای خەزەر (قەزوین)، باس لەوە دەکرێت ئەو شارە بۆتە سنورێکی لێکچیاکەرەوە لەنێوان تەتەرەکانی باکورو تەتەرەکانی باشور، ئەبولفیدا ئاماژە بەوە دەکات لە رۆژگاری ئەودا ئەو شارە چەند ناوێکی تری هەبووە وەکو باب الحدید و دەربەند[4].

سەرچاوەیەکی دیکەش هەمان بۆچوونیان هەیەو باس لەوە دەکەن کە کیسرا ئەنوشیروان بنیادی ناوە بۆ ئەوەی ببێ بە بەربەستێك لەنێوان خۆی و دوژمنەکانی[5].

٤- شمکور(شەمگور):

بە گوێرەی وتەکانی ئەبولفیدا شارێکە لە هەرێمی ئاران و نزیکە لە شاری بەرذدەغە[6]، لێرەدا تەنیا ئەوەی نیشانداوە کە تەنیا دەکەوێتە هەرێمی ئاران، بەلاّم لەسەرچاوەکاندا ئاماژە بەوە دەکەن ئەو شارە دە فەرسەخ / ٦٠ کیلۆمەتر لە کنجەوە دوورە، شارێکی کۆن بووە لە ساڵی (٣٤٠ك/ ٨٥٤ز) لەلایەن سەرداری هەرێمەکە لەسەردەمی خەلیفەی موتەوەکیلی عەبباسی (٢٣٢- ٢٤٧ك/ ٨٤٦- ٨٦١ز) دووبارە نۆژەنکرایەوەو ناوی لێنرا (المتوكلیە)[7].

ج- هەرێمی ئەرمینیا:

---

١ نفس المصدر والصفحة.

٢ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٤٨٢.

٣ القزوینی: اثار البلاد، ص٥٢٢.

٤ تقویم البلدان، ص٤٠٥.

٥ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٣٠٤، الحمیری: الروض المطار في خیر الاقطار، ص٧٧.

٦ تقویم البلدان: ص٤٠٣.

٧ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٠، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٣٦٤، الانصاري: نخبة الدهر، ص١٨٩.

یەکێکی دیکەیە لەو ناوچانەی بەشێکی تر لە وڵاتی کورد لە خۆ دەکرێت، ئەو هەرێمە بە ئەرمینیا ناسراوە، چونکە ئەوانیش وەکو کورد زۆر لە کۆنەوە تێدا نیشتەجێ بوونەو ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی پێك دەهێنن[1]

جێگای ئاماژەپێکردنە ئەو ناوچەیە هەر لە چوار چێوەی وڵاتی کاردۆخیەکان بوو، کاتێك زینفۆن (م٣٥٦پ.ز) فەرماندەی یۆنانی لە کاتی گەڕانەوەی بۆ وڵاتەکەی پێدا تێپەڕی[2]، هەر بۆیە ڕۆژهەڵاتناس مینورسکی باس لەوە دەکات ((بەشەکانی سەروو لە رووباری فورات و ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی وان (ئەرمینیای کۆن) ئەو زەویە کۆنانەن کە کورد لە سەریاندا بەدیارکەوتوون))[3]، ئەوەش ئەوەمان نیشان دەدا کە کورد لە سەردەمانێکی زۆر کۆندا بوونیان هەبووە لەم ناوچەیەدا.

هەرچی هۆزە کوردیەکانی ئەو هەرێمەیە لە دیارترینیان ڕەوادیەکانە[4] و لە پاڵ ئەوانیش چەند هۆزێکی دیکەش ژیاون وەکو رۆژەکی و بوختی و بەشنەوی[5].

هەروەها دیارترین شارە کوردنشینەکانی ئەو هەرێمەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- بدلیس (بەدلیس):

یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی ئەرمینیاو دەکەوێتە نێوان میافارقین و خەلات[6]، ئەو شارە بە چیا دەورە دراوە، هەربۆیە زۆر ساردەو لە زستاندا بەفری زۆرە، نێوانی لەگەڵ شاری خەلات حەوت فەرسەخە/٤٢ کیلۆمەتر[7].

---

١ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی شوێنی نیشتەجێبوونی ئەرمەنیەکان لەو هەرێمەدا بڕوانە: صلاح الدین امین طه: الحیاة العامة في ارمینیة دراسة في اوضاعها الاداریة والاجتماعیة والاقتصادیة(٣٠- ٢٤٧هـ/ ٦٥١- ٨٦٢م) اطروحة دکتؤراه غیر منشورة، مقدمة الی کلیة الاداب، جامعة بغداد(بغداد:١٩٧٩)، ص ص ٤٩- ٥٠.

٢ زینفۆن : گەشتەکەی زینفۆن، ل١٣٤.

٣ الاکراد ملاحظات وانطباعات، ترجمة وقدم له وعلق علیه: معروف خەزنەدار، (بغداد:١٩٦٨)، ص١٤.

٤ المسعودي: التنبیة والاشراف، ص٩٤، ابن خلکان: وفیات الاعیان، ٧/ ١٣٩.

٥ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ١٥٨، شەرەفخانی بەدلیسی : شەرەفنامە، وەرگێرانی : هەژار، (هەولێر:٢٠٠٦)، ل٤٧٦، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: نیشتمان بەشیر محەمەد : کوردو سەلجوقیەکان، وەرگێڕانی : ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا (هەولێر:٢٠٠٦)، ل١٧.

٦ دەربارەی ئەو شارە لە لاپەڕەکانی دواتر قسەی لەسەر دەکەین، ل١٣٨.

٧ تقویم البلدان، ص٣٩٥.

شایەنی باسە پێکهاتەی دانیشتوانی ئەو شارە زۆربەیان کوردن[1]، ئەوە لە کاتێکدایە شەرەفخانی بەدلیسی (م١٠١٠ك/ ١٦٠١ز) لە رۆژگاری ژیانی خۆیدا باس لە خێزانەکەی دەکات کە لە هۆزی (رۆژەکی) ین و ئاماژە بەوە دەکات ئەمرۆ ئەو خێزانە، کە مێژووی ئەو کات سالّی (١٠٠٥ك/ ١٥٩٦ز) بوو، بەر لە حەوت سەدو شەست سالّ تاکەکانی هۆزی رۆژەکی فەرمانرەوایی بەدلیس و ناوچەکانی دەوروبەریان کردووە[2] ئەوەش بۆمان بەدیاردەخات بوونی ئەو هۆزە لەو شارەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەمی کۆچی /نۆیەمی زاینی.

٢- خلات (ئەخلات – خەلات)[3]:

شارێکی گەورەو ئاوەدان و بەناوبانگە لە هەرێمی ئەرمینیاو دەکەوێتە دەشتایی شورەیەکی وێرانی هەبووە بەقەد شورەی شاری دیمەشق دەبێ، نێوانیشی لەگەلّ شاری ملازگرد حەوت فەرسەخە/٤٢ کیلۆمەتر[4].

هەرچی بوونی کوردە لەو شارەدا ئەوا هۆزی بەشنەوی لە دانیشتوانە دیارەکانی ئەو شارەن[5].

٣- وان:

بە گوێرەی وتەکانی ئەبولفیدا، شارێکی بچووکەو قەلاّیەکی تێدایە لەسەر چیاو دەکەوێتە کەناری دەریاچەی ئەرجیش (وان)[6]، کوردیش بەرێژەیەکی بەرچاو بوونی هەبووە لەو شارەدا و مێژووی نیشتەجێی بوونیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی کۆن[7].

---

١ ئەولیا چەلەبی : سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل١١٨.

٢ شەرەفنامە، ل٤٧٦.

٣ باس لەوە دەکرێت ناوی شارەکە کوردییەو بەواتای (خەلات و دیاری) دێت، خەلّکی شارەکەش هەمان بۆچوونیان هەیە. عبدالرقیب یوسف: الدولة الدوستكية في كوردستان الوسطى، (بغداد:١٩٧٢)، ١/ ١٥.

٤ تقويم البلدان، ص٣٩٥.

٥ ئەولیا چەلەبی : سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەپی، ل١٦٠، محەمەد مەردۆخی : مێژووی کوردو کوردستان، ل١٣١.

٦ تقويم البلدان، ص٣٨٩، سەبارەت بە دەریاچەی وان لەگەلّ سروشتی جوگرافیای کوردستان باسی لێوە کراوە بڕوانە: ل١٠٥.

٧ مینورسکی : الاكراد، ص١٧، باسیلی نیکتین: الكرد، ص٩٠.

٤- دوین[١] (دبیل)

ئەبولفیدا لە بارەی ئەو شارە هەمان بۆچوونی یاقوتی حەمەوی خستۆتەڕوو کاتێك باس لەوە دەکات ((ئەو شارە دەکەوێتە هەرێمی ئەرمینیاو هاوسنورە لەگەڵ ئاران و مەلیکەکانی ماڵباتی ئەیوبی بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شارە))[٢].

بە گوێرەی وتەی یەکێك لە وڵاتناسان ئەو شارە لەژێر دەسەڵاتی کوردان دابووە[٣]، لە هەمان کاتدا ڕووبارێك لە ڕۆژئاوایی ئەو شارە بەیدەکرێت و ناسراوە بە (نهر الاکراد)[٤].ڕووباری کوردانیش لە کاتی فتوحاتی ئیسلامی بۆ ئەو ناوچەیە ناوی هاتووە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێش هاتنی ئیسلامیش کورد بوونی هەبووە لەو شارەدا.

٥- ملازگرد[٥]:

یەکێکی دیکەیە لە شارە بەناوبانگەکانی هەرێمی ئەرمینیاو دەکەوێتە نێوان خەڵات و وڵاتی ڕۆم، لە گەورەیی هاوشێوەی شاری خەڵاتەو نزیکە لە شاری ئەرزن، نێوانیان دوو تا سێ ڕۆژە ڕێیە لەگەڵ خەڵاتیش ڕۆژو دانێکە[٦].

دیارە لەو شارەدا پێکەوە ژیان هەبووە، بە جۆرێك باس لەوە دەکرێت موسڵمان و کریستانەکان پێکەوە ژیانیان دەگوزەراند[٧].

---

١ ئەو شارە لەسەرچاوەکاندا بەچەند شێوەیەك ناوی هاتووە، وەکو (دبیل)، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٧، احسن التقاسیم، ص٢٨٣، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٤٣٨، هەروەها بە (دون) یش ناوی هاتووە، مولف مجهول: حدود العالم، ص١٢٠، وە بە (دفین) ناوی هاتووە. احمد کسروي: شهریاران گمنان، (تهران:١٩٢٩)، ٣/ ٢٧٦. بەهەمان شێوە بە (دوین) ناوی هاتووە. یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٤٩١، ابو الفداء: تقویم البلدان، ص٣٩٩.

٢ المشترك وضعا، ص١٧٥، تقویم البلدان، ص٣٩٩.

٣ المقدسي: احسن التقاسیم، ص٢٨٣.

٤یاقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ١٤٦.

٥ بەچەند شێوەیەك ناوی هاتووە وەکو (ملازجرد- ملازطرد- منازجرد- منازکرد) الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١١، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٥، المقدسي: احسن التقاسیم، ٢٨٣، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٢٠٢.

٦ تقویم البلدان، ص٣٩٥.

٧ المقدسي: احسن التقاسیم، ص٢٨٣.

# تەوەرەی پێنجەم

## هەرێمەکانی دیکە

دەربارەی بوونی کورد لە هەرێمەکانی تر، مەبەستمان ئەوە نیە کە کورد لەهەر وڵاتێك یاخود ناوچەیەکی ئەو جیهانە ژیابێ باسی بکەین، بەڵکو تەنیا باس لە هەندێك لەو ناوچەو هەرێمانە دەکەین کە شوێنەکانیان درێژبوونەوەیەکی سروشتی و مرۆییە بۆ هەرێمە کوردنشینەکانی دیکە بەتایبەتی هەرێمی چیا، هەر بۆیە لێرەدا دیارترین ناوچە کوردنشینەکانی تر دەخەینە ڕوو بەتایبەتی ئەوانەی ئەبولفیدا باسی کردوون.

**یەکەم/ وڵاتی لورستان:**

یەکێکە لەو ناوچانەی کەوا کوردی تێدا ژیاوە، دەبوایە لەگەڵ هەرێمی چیادا باسمان لێوەبکردایە، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوبراو وەکو بەشێك لە هەرێمی خۆزستان (ئەهواز) باسی کردووە، بۆیە بە باشتر زانرا لە کاتی خۆیدا ئاماژەی پێی بکەین.

بە گوێرەی وتەکانی ئەبولفیدا، ئەو دەڤەرە بەشێك نەبووە لە خۆزستان بەڵکو بەشێك بووە لە هەرێمی چیا کاتێك ئاماژە بەوە دەکات ((وڵاتی لور زۆرینەی چیایەو بەستراوەتەوە بە خۆزستان، بەڵام لێی جیاکراوەتەوە لە کۆندا سەر بە خۆزستان بووە))[1].

دیارە ئەو بۆچوونە لەلای وڵاتناسانی تریش هەبووە، کاتێك ئاماژە بەوە دەکەن ((لوڕستان دەڤەرێکی فراوانەو دەکەوێتە نێوان خۆزستان و ئەسبەهان، سەرەتا سەربەخۆ بووە دواتر خراوەتە سەر خۆزستان، پاش ماوەیەك لێی جیاکراوەتەوە و خراوەتە سەر هەرێمی چیا، لەبەرئەوەی یەك کەش و هەوان و پەیوەستن بە یەکەوە ))[2].

لە درێژەی قسەکانیدا لە بارەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ئاماژە بەوە دەکات ((خەڵکێکی زۆرن لە کوردان و دەسەڵاتداریش هەر لە خۆیانن))[3]، ئەو بۆچوون و ڕاستیەش[1] لای وڵاتناسانی

١ تقويم البلدان، ص ص ٣١٢- ٣١٣.

٢ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٣٢، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٢٥.

٣ تقويم البلدان، ص٣١٣.

تریش باس کراوە بە شێوەیەك ((زۆرینەی لە ولاَتی لوردا کوردن))، هەروەها یاقوتی حەمەویش ئاماژە بەوە دەکات ((نەتەوەیەکن لە کوردان لەو چیایەدا دەژین لە نێوان ئەسبەهان و خۆزستان ئەو ناوچەیە هەر بەناوی ئەوانەوە کراوە و پێی دەگوترێت ولاَتی لور یاخود لورستان))[٢].

هەرچی سنوری ولاَتەکەیە، ئەبولفیدا لەلایەن خۆیەوە دیاری نەکردووەو تەنانەت ولاَتناسانی تریش زۆر نەپڕژاونەتە سەری، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت بە پێی وتەکانی یەکێك لە توێژەران سنوری بەو شێوەیە دیاری بکەین، لەلای رۆژهەلاَتی ئەسفەهان و ولاَتی فارسە، لە باکوری کرمانشاو هەمەدانە، لە باشوری خۆزستان و ولاَتی فارسە، لە رۆژئاوای عێراقی عەرەبیە، هەروەها لە دیارترین شارەکانیشی بریتین لە (ئیدج- تستر- لیشتر- شوش- شاپور خواست)[٣].

لەلایەکی تر هۆزی لور بە دیارترین هۆزی دانیشتوانی لورستان دادەنرێت و باس لەوە دەکرێت ئەو هۆزە دابەش بووە بۆ زیاتر لە بیست تیرە لە ناوچەکەدا[٤].

جێگای ئاماژەپێکردنە ئەو ناوچەیە لەسەردەمی سەلجوقیەکان کرایە هەرێمێکی سەربەخۆ لە دوو بەشدا، ئەوانیش لورستانی گەورە لە باشورو لورستانی بچووك لە باکورو رووباری کاروان لێکی جیادەکردنەوە[٥].

**دووەم/ هەرێمی خۆزستان (ئەهواز):**

یەکێکی دیکەیە لەو هەرێمانەی بەشێك لە ولاَتی کورد لە خۆدەگرێت، ئەبولفیدا سنوری بەو شێوەیە دیاری کردووە، لە رۆژئاوای ئاوایەکانی واستە لە ولاَتی عێراق، لە باشوری ئەو هێڵە تراویلکەیەی درێژدەبێتەوە لە واست بۆ عەبادان و لەوێشەوە بۆ کەنداوی فاس، پاشان بۆ شاری مەهروباتی نێوان خۆزستان و فارسە، لە رۆژهەلاَتی دەورە دراوە بە هەرێمی فارس و ئەسفەهان، لە باکوری هەردوو کوری سەیمەرەو لورستانە کەسەر بە هەرێمی چیاکان بوون[٦].

---

١ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٣٢

٢ معجم البلدان، ٥/ ١٦.

٣ رمضان شريف زبير الداودي: لورستان الكبرى(٥٥٠- ٨٢٧هـ/ ١١٥٥- ١٤٢٤م)، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل:١٩٩٤)، ص ص ١٩- ٢٨- ٣٤.

٤ بۆ زیاتر زانیاری لە بارەی تیرەکانی بڕوانە: شەرەفخانی بەدلیسی: شەرەفنامە، ل٥٦.

٥ لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية، ص٢٣٥.

٦ تقويم البلدان، ص٣١١.

دیاره وڵاتناسانی تریش هیچ جۆره ناكۆكیەك له نێوانیاندا بەدیناكرێت و له دیاریكردنی سنوری تاڕادەیەكی زۆر هاوڕان لەگەڵ ئەبولفیدا[1].

دیارترین شاره كوردنشینەكانی ئەو هەرێمەش بریتین له :

١- جندیسابور:

یەكێكه له شارەكانی هەرێمی ئەهواز نێوانی لەگەڵ شاری تستر هەشت فەرسەخە/٤٨ كیلۆمەترو لەگەڵ شاری سوس شەش فەرسەخە/٣٦ كیلۆمەتر[2].

هەروەها باس لەوه دەكرێت لەسەدەی چوارەمی كۆچی / دەیەمی زاینی زۆرینەی دانیشتوانی كورد بوونه[3].

٢- رامهرمز:

ئەو شاره له هەرێمی ئەهوازەو باس لەوه دەكرێت سەلمانی فارسی خەڵكی ئەو شارەیە، نێوانی لەگەڵ سوق الاهواز نۆزده فەرسەخە/١٠٤ كیلۆمەتر و لەگەڵ ئاوایەكانی (الزط) حەوت فەرسەخە/٤٢ كیلۆمەتر[4].

شایەنی باسه ئیبن بەتووتەی گەڕیده خۆی لەسەدەی هەشتەمی كۆچی / چواردەهەمی زاینی سەردانیكردووەو ئاماژه بەوه دەكات ((ژمارەیەكی زۆر له گوندی تێدا هەبووەو كورد تێدا نیشتەجێ بوونه))[5].

٣- سوق الاهواز:

یەكێكه له شارەكانی نێو هەرێمی ئەهواز، باس لەوه دەكرێت زۆربەی وێران بووەو نێوانی لەگەڵ شاری ئەسفەهان هەشتا فەرسەخە/ ٤٢٠ كیلۆمەتر[6].

له كاتی هاتنی لەشكری موسڵمانەكان بۆ فەتح كردنی ئەهواز باس لەوه كراوه لەو ناوچەیەدا عەجەمی تێدا بووه، واته كوردو فارس[1].

---

١ اين حوقل: صورة الارض، ص٢٢٥، مولف مجهول: حدود العالم، ص٢٣٤، القزويني : اثار البلاد، ص١٢٥. تقويم البلدان، ص٣١٥.

٢ المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٢٩، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ١٧٠.

٢ تقويم البلدان، ص٣١٥.

٣ المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٢٩، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ١٧٠.

٤ تقويم البلدان، ص٣١٩.

٥ رحلة ابن بطوطة، ص١٢٦.

٦ تقويم البلدان، ص٣١٧.

# بەشی چوارەم

## ڕەهەندە شارستانیەکانی کوردستان لە کتێبی (تقويم البلدان)

هەروەکو دیارە چالاکی شارستانی لای هەر نەتەوەو میللەت و کۆمەڵگایەك چەندین لایەنی گرنگ لە خۆدەگرێت، وەکو لایەنی کارگێڕی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و بیناسازی و زانستی و چەندین لایەنی دیکەش.

بۆ گەڕان بەدوای زانیاری دەربارەی ئەو لایەنانەش، وا پێویست دەکات زیاتر پشت ببەسترێت بە نووسراوی گەڕیدەو وڵاتناسان، ئەوانەی خۆیان سەردانی ناوچەکانیان کردووە یاخود ئەو سەرچاوانەی بە گشتی باسیان لە شارستانیەتی ئیسلامی کردووە، لەبەرئەوەی سەرچاوەکانی دیکەی مێژوونووسان زیاتر گرنگیان داوە بەو هەواڵ و ڕووداوە ڕامیاریانەی کە لەسەردەمە یەك لە دوای یەکەکاندا هاتوونەتە ئاراوەو کەمتر لەو بوارانەدا سوودیان لێوەرگیرێت.

شایەنی باسە، هەرچەندە کتێبی (تقويم البلدان) یش یەکێکە لە سەرچاوەکانی وڵاتناسی و کەچی بەشێوەیەکی فراوان نەپرژاوەتە سەر ئەو لایەنانە بەبەراورد لەگەڵ سەرچاوەکانی دیکەی پێش خۆی، بەتایبەتی ئەوانەی لە سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی نووسراون[1]، هۆکارەکەسی دیارە زیاتر لەبەرئەوەیە کە کتێبێکی تەواو جوگرافییەو تاڕادەیەکیش کورتکراوەی سەرچاوەکانی پێش خۆیەتی لەو بوارەداو تەنانەت خۆی لە قەرەی زۆر لایەن نەداوەو بەڵکو زیاتر تیشکی خستۆتە سەر لایەنی جوگرافییەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەبەر رۆشنایی دەقەکان و ئاماژەپێکردنەکانی ئەبولفیدا دیارترین ڕەهەندە شارستانیەکانی کوردستان بەو شێوەیەی خوارەوە دەخەینەڕوو:

---

١ بە نموونە ئیبن حەوقەل و ئەلمەقدسی لە هەردوو کتێبی (صورة الارض) و (احسن التقاسيم)، زۆر گرنگیان بەو لایانانە داوە.

# تەوەرەی یەکەم

## لایەنی ئابووری

له پێشەوەی هەموو لایەنەکانی دیکە دێن کە لـە کتێبەکەیـدا زۆرتـرین زانیـاری لـە بارەیـەوە خستۆتەڕوو، ئەوەشیان زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە ئـەم لایەنـە پەیوەندیـەکی تونـدو تـۆڵی هەبووە بە جوگرافیاو ئاوهەوای ناوچەکە خۆی کەوا کوردستان ناوچەیەکی ستراتیژی گرنگ و بـەپیت و بەرەکەت و دەوڵەمەند بووە بە سامانە سروشتیەکان و کانزایەکان و تاڕادەیـەکی زۆریـش تـەواوی چالاکیە ئابوریەکانی وەکو کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ و پیشەی دەست و بازرگـانی تێـدا ئـەنجام دراوە. هەر بۆیە تێبینی ئەوە دەکرێت ئەم لایەنە نەوەك تەنیا لەلای ناوبراو بەڵکو لەلای وڵاتناسـانی دیکەش زانیاری زۆری لە بارەیەوە تۆمارکراوە، ئەم لایەنەش پێك هاتووە لە :

**یەکەم / کشتوکاڵ و دیارترین بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:**

کشتوکاڵکردن یەکێکە لەو چالاکیانەی کـەوا ئـادەمیزاد لـە سـەردەمانێکی کۆنـدا پێـی هەڵساوە بە مەبەستی دابینکردنی پێداویستیەکانی بژێوی ژیانی.

دیارە لای کوردانیش لە پێشەوەی چالاکیە ئابوریـەکانی دیکـە هـاتووە کـە بەشـێوەیەکی بەرفراوان پێیەوە خەریك بوونە، ئەوەش زیاتر پەیوەندی هەبووە بە سروشت و ئاوهەوای ناوچەکە کەوا سەرجەم پێداویستیەکانی کشتوکاڵکردن تێدا بوونی هەبووەو وەکو بە پیتـی و بەرەکـەتی خاکەکەی و هەروەها بوونی باران و بەفرێکی زۆر لە وەرزی زستاندا کـە دەبـووە هـۆی بـوونی سەرچـاوەی ئـاوی زۆر لـە ڕووبـار و کانیـاو لـەو بـوارەدا سـوودی زۆریـان لێـوەردەگیرا[1]، هەرلەبەرئەوەشە ئەگەر تەماشای مێژووی کۆن بکرێت، ئەوا بۆمـان بەدیاردەکـەوێت کـۆنترین

١ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٨، تقويم البلدان، ص٣٩٩، القلقشندي، صبح الاعشى، ٤/ ٣٥٧.

گوندی کشتوکاڵی لە جیهاندا لەناوچەی کوردستان بووە کە ئەویش گوندی (جەرمۆ) یە لە نزیك چەمچەماڵ لە هەرێمی کوردستانی عێراق[1].

سەبارەت بە خستنەڕووی زانیاریش لەو بوارەوە لەلایەن ئەبولفیداوە دەکرێت باس لەوە بکرێت بەچەند دەستەواژەو ڕستەیەك ڕوونکردنەوەی داوە لە بارەی تایبەتمەندی هەریەك لە شارە کوردنشینەکان لە ڕووی بەپیتی زەویەکانی و بوونی باغ و بێستان و کێڵگەی کشتوکاڵی و ئەو سەرچاوە ئاویانەی کە یارمەتیدەربوونی لە بوونی ئەو جۆرە زەویانەو لە هەمان کاتدا لە هەندێك شاردا تیشکی خستۆتە سەر دیارترین بەرووبوومەکانیشی.

ئەوەتا لە بارەی هەرێمی جەزیرە، کە یەکێك بووە لەو هەرێمانەی کەوا چالاکی کشتوکاڵکردنی بەشێوەیەکی بەرفراوانی تێدا ئەنجام دراوە لەبەربوونی تەواوی پێداویستیەکانی کشتوکاڵکردن تێدا[2] وەسفی چەند شارێکی کردووە وەکو میافارقین لە بارەیەوە ئاماژە بەوە دەکات وەکو شاری نەسیبین وایە لە زۆری سەرچاوەی ئاوی و باغ و بێستانەکانی[3]، ئەو بۆچوونە وڵاتناسانی دیکەش پشت ڕاستیان کردۆتەوە[4]، کەچی ئەلمقدسی لەلایەن خۆیەوە باس لەوە دەکات کە ((بێستانی کەم بووە))[5].

لەڕاستیدا ئەو بۆچوونە یەك ناگرێتەوە لەگەڵ قسەکانی ئەبولفیدا و تەنانەت بۆ جەخت کردنەوە لەسەر وتەکانی، ئەولیا چەلەبی ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو شارە ئاو و رووبار و کانیاوی زۆر بووە و باغ و بێستانەکانی بێ ئاو دەدرا[6].

---

١ طه باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ١/ ١٧٧، عامر سليمان واحمد مالك الفتيان: محاضرات في التاريخ القديم، (بغداد:١٩٧٨)، ص٢٢٠

٢ مولف مجهول: حدود العالم، ص١١٧، عبدالله بن ناصر بن سليمان الحارثى: الاوضاع الحضارية في اقليم الجزيرة الفراتية من القرنين السادس والسابع للهجرة/ الثاني عشر للميلاد، تحقيق: سعيد عبدالفتاح عاشور، (بيروت:٢٠٠٧)، ص١٦٩.

٣ تقويم البلدان، ص٢٧٩.

٤ الاصطخرى: المسالك والممالك، ص٥٣، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٢.

٥ احسن التقاسيم، ص١٢٨.

٦ سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل٨٩.

هەروەها لەبارەی شاری نەسیبین باس لەوە دەکات ((ئاو و باغ و بێستانی زۆر بـووە))[١]، وە بۆ دەرخستنی زۆری باغ و بێستانەکانی ئەو شارە یەکێك لە ولاتناسان پێیوایە کە ((زیـاتر لـە چل هەزار بێستانی هەبووە))[٢].

هەرچی شاری شنگارە ئەوا چیاکانی بە پیترین ناوچە ئاوزەند دەکات و جەخت لەسەر ئـەوە دەکاتەوە باغ و بێستان و ئاویشی زۆر بووە[٣]، ئیبن بەتووتەی گەڕیدەش خۆی شارەکەی بینیووەو لەم ڕووەوە باس لەوە دەکات، شاری ژەنگار لە هەرێمی جەزیرە وەکو شـاری دیمەشـق وایـە لـە زۆری سەرچاوەی ئاوی و باغ و بێستانەکانی[٤].

شاری ئامەدیش لەو هەرێمەدا وەکو زۆرێك لە شارەکانی دیکەی کانی و سەرچاوەی ئاوی و باغ و بێستان و کێڵگەی کشتوکاڵی زۆر بووە[٥]، هەروەها جەزیرەی ئیبن عومەریش لە شارە بـە پیت و بەرەکەتەکانی ئەو هەرێمەیەو باغ و بێستانی زۆر بووە[٦]، لەبـەر بـە پیتـی و بەرەکـەتی خاکەکەی و سەرچاوەی ئاوی زۆر داروبارو بەروبوومی ئیجگار زۆر بووە[٧].

شاری سیعرتیش یەکێك بووە لەو شارانەی داروبارو سەرچاوەی ئاوی زۆر بـووە، هـەر بۆیـە جۆرەها بەروبوومی هەبووە[٨].

شایەنی باسە کشتوکاڵکردن لە شارەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاش بەشێوەیەکی بـەربڵاو بـوونی هەبووەو خەڵکانێکی زۆر پێیەوە خەریك بوونەو جۆرەها بەروبوومیات تێدا بەرهەم هێناوەو تەنانـەت هەندێك لە شارەکانی بەجۆرە بەروبوومێکی تایبەت بـەناوبانگ بـووە، هـەر بۆیـە لێرەشـدا بۆمـان بەدیاردەکـەوێت کـەوا لـەو بارەیـەوە ستایشـی زۆر لـە شـارەکانی کـردووەو تایبەتمەندیـەکانی

---

١ تقویم البلدان، ص٢٨٣.

٢ القزوینی: اثار الـبلاد، ص٤٦٧، هەرچەندە ئەو ژمارەیە زێدەڕۆیی تێدایە، بەڵام دەیەوێت وا نیشان بدات کە بێستانی تێدا زۆر بووە.

٣ تقویم البلدان، ٢٨٧.

٤ رحلة ابن بطوطة،ص١٠٢.

٥ تقویم البلدان، ص٢٨٧، هەروەها بڕوانە: القزوینی: اثار البلاد، ص٤٩١، القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/ ٣٢٧.

٦ تقویم البلدان، ص٢٨٣.

٧ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٢، مولف مجهول: حدود العالم، ص١١٩.

٨ تقویم البلدان، ص٢٨٩.

بەدیارخستوون، هەروەك شاری سەیمەرە لە بارەیەوە باس لەوە دەكات ((شـارێكی بچـووكەو كـانی و سەرچاوەی ئاوی و كێڵگەی كشتوكاڵی و هەروەها میوەجاتی زۆر بووە))[١].

شاری دینەوەریش لە شارە كشتوكاڵیەكانی ئەو هەرێمەیەو خاكێكی بە پیت و سەرچـاوەی ئـاوی زۆر بـووە، هـەر بۆیـە بـەروبوومی زۆر بـووە[٢]، ئـەوەش زیـاتر لەبـەربوونی سروشـت و ئاوهەوایەكی لەباری هەبووە، لەبەرئەوە بەروبوومی جۆراو جۆری تێدا بەرهەم هاتووە[٣].

هەرچی شاری نەهاوەندە، ئەوا سەرچـاوەی ئـاوی و بـاغ و بێسـتان و جۆرەهـا میوەجـاتی هەبووە[٤]، بەهەمان شێوە شاری هەمەدانیش لە شارە گەورەكانی ئەو هەرێمەیە و باغ و بێستان و كێڵگـەی كشـتوكاڵی تێـدا زۆر بـووە[٥]، شـاری سـیروانیش كانیـە ئاوییـەكانی كەوتۆتـە ناوەڕاستیەوە[٦]، ئەوەش ڕێگا خۆشكەر بووە بـۆ ئـەوەی لـە پـرۆژەی ئـاودێری بـەكاربهێنرێن و كێڵگەی كشتوكاڵی لەناوەوەیدا زۆر بێت[٧].

لەلایەكی دیكە لە بارەی هەرێمە كوردنشینەكانی تـریش لـەم ڕووەوە وەسـفی زۆرێـك لـە شارەكانی كردووە، بەشێوەیەك لە بارەی شاری بەدلیس لە هەرێمی ئەرمینیا باس لەوە دەكـات ((لەبەرئەوەی سەرچاوەی ئاوی زۆر بووە، هەر بۆیە خاكەكەی بە پیت بووەو باغ و بێستانی تێدا زۆر بووە))[٨]، هەروەها لەبارەی شاری خەلاتیش هەمان بۆچوون دەخاتەڕوو[٩].

---

١ تقویم البلدان، ص٤١٣، وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی كۆچی/ دەیەمی زاینی پـێش ئەبولفیـدا باسـیان لـەو زانیاریانە كردووە. ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٤، المقدسي: احسن التقاسیم، ص٢٩٥.

٢ تقویم البلدان، ص٤١٥.

٣ المقدسي: احسن التقاسیم، ص٢٩٥، المستوفي القزویني: نزهة القلوب، ص١٠٧.

٤ تقویم البلدان، ص٤١٧، سەرچاوەی پێشووتریش هەمان بۆچوونیان هەیە، قدامه بن جعفـر: الخراج وصـناعة الكتابة، ص٣٧٠، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٣، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٣١٣.

٥ تقویم البلدان، ص٤١٧، وڵاتناسانی دیكەش جەخت لەسەر ئەوە دەكەنـەوە كـە ئـەو شـارە میوەجـاتی زۆر بووە. المقدسي: احسن التقاسیم، ص٢٩٤، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٤١١.

٦ تقویم البلدان، ص٤١٥.

٧ الحمیری: الروض المعطار، ص٣٥١.

٨ تقویم البلدان، ص٣٩٥.

٩ نفس المصدر والصفحة.

شاری مەراغەش لە ئازربیجان، باغ و بێستان و کێڵگەی کشتوکاڵی تێدا زۆر بووە[1]، شاری مەرندیش رووبارو داری بەرێژەیەکی بەرچاو هەبووە[2]، هەروەها شاری کنجەش یەکێك بووە لەو شارانەی باغ و بێستان و بەربووم و مێوەجاتی هەبووە[3].

هەرچی شاری بەرزەعەیە لە هەرێمی ئاران، ئەوا بەیەکێك لە شارە بەناوبانگەکانی ئەو هەرێمە دادەنرێت لە ڕووی زۆری کێڵگەی کشتوکاڵی و بەروبوومی جۆراو جۆر[4]، هۆکارەکەشی زیاتر لەبەر ئەوەیە کە دەکەوێتە سەر یەکێك لە لقەکانی رووباری (الکر)، ئیتر ئەوەش رێگاخۆشکەر بووە بۆ ئەوەی خاکێکی بە پیت و بەروبوومی جۆراو جۆری زۆر بێت[5].

سەبارەت بە دیارترین بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی شارە کوردنشینەکانیش، دەکرێت باس لەوە بکرێت، هەرچەندە ئەبولفیدا تایبەتمەندی و وەسفی زۆرێك لە شارەکانی کردووە لە ڕووی بوونی زەوی کشتوکاڵی و بوونی سەرچاوەی ئاوی، بەلاّم زۆر تیشکی نەخستۆتە سەر ئەو بەرووبوومانەی کە تیایاندا بە شێوەیەکی دیار بەرهەم هاتوون تەنیا لە چەند شارێك نەبێ، بۆیە لێرەدا بە پشت بەستن بەوتەکانی ناوبراو سەرچاوەکانی دیکەی وڵاتناسی دیارترین بەرهەمەکانیان دەخەینەڕوو، بەتایبەتی ئەوانەی شارەکان ناویان پێیەوە دەرکردووە و بە بەرهەم هێنانی بەشێوەیەکی دیار بەناوبانگ بوون.

دیارترین ئەو بەرووبوومانەی لەم هەرێمانەدا بەرهەم هاتوون گەنم و جۆیە، بەتایبەتی گەنم لە هەندێك کاتدا جۆ، لەبەرئەوەی سەرچاوەیەکی سەرەکیە بۆ دروستکردنی نان و ئەویش خواردنێکی بەردەوامی رۆژانەیە و سەرەڕای ئەوەش یەکێکە لەو بەروبوومە دێمیانەی کە زیاتر بە ئاوی باران دەڕوێت و زۆر پێویستی بە جۆگەو پرۆژەی ئاودێری نیە تەنیا لە کاتی بێ بارانی نەبێت، دیارە هەرێمە کوردنشیش بە گشتی بارانیان زۆر بووە لە وەرزی زستان و بۆ بەرهەم هێنانی گەنم و جۆش زیاتر پشتیان بە ئاوی باران دەبەست.

---

١ تقويم البلدان، ص٢٩٩، وڵاتناسانی دیکەش هەمان بۆچوونیان هەیە.ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٩، الحميري: الروض المعطار، ص٥٣٥.

٢ تقويم البلدان، ص٤٠١.

٣ المصدر نفسه، ص٤٠٥.

٤ المصدر نفسه، ص٤٠٣.

٥ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٠، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٢٧٩.

لەگەڵ ئەوەی گەنم و جۆ لە پێشەوەی هەموو بەرهەمەکانی دیکە هاتوون لەم هەرێمانـەدا، بەڵام ناوبراو بە هیچ شێوەیەکی ئاماژە بەوە ناکات لـە چ شـارێکدا یـاخود لـە چ هەرێمێکـدا زۆرترین بەرهەمی هەبووە، کەچـی لـە هەنـدێك سەرچـاوەی دیکـەی وڵاتناسـی زۆر بـەڕوونی تیشکی خراوەتەسەر، بەشێوەیەك لـە بـارەی شـارەکانی رۆژئـاوای چـیا بـاس لـەوە دەکرێـت ((لەشاری دینەوەرو گوندەکانی دەوروبەری گەنم بەڕێژەیەکی بەرچاو بەرهەم هاتووە))[١].

هەروەها لە بارەی شاری هەمەدانیش باس لەوە دەکرێت کە ((شارێکی دەگمەنە و نان تێدا هەرزانە))[٢]، ئەوەش بۆمان بەدیاردەخات کەوا گەنم لەو شارەدا بەڕێژەیەکی زۆر بەرهەم هاتووەو سەرچاوەی سەرەکی بووە بۆ دروستکردنی نان، جا ئەگەر نان هەرزان بێت مانای وایە کە گەنم تێدا زۆر بووە.

بەهەمان شێوە لـە هـەرێمی جـەزیرەش، گـەنم و جـۆ بەڕێژەیـەکی زۆر بەرهـەم هـاتووە، بەتایبەتی لە شـارەکانی نەسـیبین و جـەزیرەی ئـیبن عومـەر، ئـەوەش لەبـەربوونی سـەرجەم پێداویستیەکانی چاندنی ئەو جۆرە دانەوێڵەیە[٣].

هەرچی هەرێمە کوردنشینەکانی دیکەیە، ئەوا بێبەش نەبوونە لەو جۆرە بەرهەمە، بەڵکو لە زۆرێك لە شارو دێهاتەکانی هەرسێ هەرێمی ئازربیجان و ئاران و ئـەرمینیا ئـەم جـۆرە دانەوێڵەیـە چـێنراوەو لەبەربوونی بارانێکی زۆر و سەرچاوەی ئاوی بەرهەم بەڕێژەیەکی بەرچاو تێیاندا بەرهەم هاتووە[٤].

جگە لەبەربوومی دانەوێڵە، جۆرەها بەرووبوومی دیکەش بوونی هەبووە لـەم هەرێمانـەدا، ئەوەتا ئەبولفیدا لەبارەی شاری سیعرت لە هەرێمی جەزیرە ئاماژە بەوە دەکـات ((ئـەو شـارە کۆمەڵێك داری هەبووە، وەکو دار هەنجیرو هەنارو مێو))[٥]، بێگومان ئەو جۆرە بەرووبوومانە لە شارە کوردنشینەکانی دیکەش بوونی هەبووە، بە نموونە شاری حولوان جۆرێکی تایبەت و باشی لە هەنجیرو هەناری هەبووە[٦]، تەنانەت یاقوتی حەمەوی لەلایەن حولوان جۆرێکی ستایشی ئـەو جۆرە بەرهەمانەی کردووە لەو شارەدا و باس لەوە دەکات ((شاری حولوان هەنجیر و هەناری زۆر

---

١ المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص١٠٧.

٢ المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٩٤.

٣ ابن حوقل: صورة الارض، ص ص ١٩١، ٢٢٩، القزويني: اثار البلاد، ص٢٨٤، بۆ زیـاتر زانیـاری بڕوانـە: عبدالله بن ناصر: الاوضاع الحضارية في اقليم الجزيرة الفراتية، ص١٦٩.

٤ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٨، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٨١، لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ص٢١٥.

٥ تقويم البلدان، ص٢٨٩.

٦ القزويني: اثار البلاد، ص٣٥٧.

بووه، بەشێوەیەك هەنارەكەی وێنەی نیە لە جیهان و هەرچی هەنجیرەكەیەتی لەبەرنایابی و باشی و گەورەیی پێدەگوترێت شا هەنجیر))[1].

شاری كنجەش لە هەرێمی ئاران بەناوبانگ بووە بە هەنجیر، تەنانەت لە بارەی وەصفی هەنجیری ئەو شارە ئەبولفیدا باس لەوە دەكات ((جۆرە هەنجیرێكی تێدا هەبووە ئەگەر یەكێك بیخواردایە یەكسەر تووشی تایەكی گەرم دەبوو))[2].

هەروەها لە شارەكانی نەسیبین و شنۆ ترێ زۆر بووە، هەر بۆیە نرخی زۆر هەرزان بووە[3].

هەرچی شاری هیزانە لە هەرێمی جەزیرە ئەوا بوندقی زۆر بووە، لەبەرئەوەی كەوتبووە ناوچە چیاییەكانەوە[4]، ئەوا بەروبوومە نەك تەنیا لەو شارە بەڵكو لە جەزیرەی ئیبن عومەریش هەبووە[5]و تەنانەت لەشاری بەرزەعەش زۆر بووە[6].

شاری شنگاریش لەبەر پێگەو جۆری ئاوهەواكەی وایكردووە بەروبوومی زستانەو هاوینەی هەبێ[7]، هەر بۆیە لە هەرێمی جەزیرە هیچ شارێك نیە دارخورمای هەبێ تەنیا شاری ژەنگار نەبێت[8]، نەك تەنیا خورما بەڵكو ئەو شارە بەروبوومی دیكەشی هەبووە، وەكو گوێزو باوی و سماق و هەنار و ترێ[9]ئەوە سەرەڕای ئەوەی زەیتوونیسی زۆر بووە[10]، بەهەمان شێوە باس لەوە دەكرێت پرتەقاڵ و لالەنجیشی زۆر بووە[11].

---

١ معجم البلدان، ٢/ ٢٩١.

٢ تقويم البلدان، ص٤٠٥.

٣ ابن حوقل: صورة الارض، ص ص ١٩١- ٢٨٩.

٤ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٥ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٣.

٦ تقويم البلدان، ص٤٠٣.

٧ ابن حوقل: صورة الارض، ص١١٩، المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٢٧.

٨ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٩ المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٣١.

١٠ المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص١٠٧.

١١ القزويني: اثار البلاد، ص٣٩٣.

لەبارەی بوونی دار بەڕووش ناوبراو ئاماژەی بەچەند شارێك كردووە، لەوانە شاری بەرزەعە بوندق و داربەڕووی زۆر بووە [1]، بەهەمان شێوە لە شاری هیزانیش ئەو جۆرە دارە زۆر بووە [2].

شارەكانی رۆژئاوای هەرێمی چیاش جۆرەها بەروبوومیان هەبووە، بەتایبەتی شاری نەهاوەند مێوەجاتی زۆربووە [3]، تەنانەت باس لەوە دەكرێت جۆرە ترێیەكی باش و نایەبی هەبووە [4].

هەروەها شاری كرمانشا بەناوبانگ بووە بە ڕووەكی زەعفەران [5]، هەرچی خورماشە، ئەوا یەكێك بووە لەو بەروبوومانەی كەوا بوونی هەبووە بەڵام بەشێوەیەكی كەم، هۆكارەكەشی دیارە زۆربەی هەرێمە كوردنشینەكان ئاوهەوایەكی ساردیان هەیەو خورماش زیاتر لە ناوچە گەرمەكاندا بوونی هەیە و دەچێنرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەهەندێك لە شارە كوردنشینەكان ئەوانەی جۆرە ئاوهەوایەكی تایبەتیان هەبووە وایكردووە ئەو بەروبوومەش بوونی هەبێ وەكو شاری ژەنگار لە هەرێمی جەزیرە [6]، هەروەها لە هەندێك شاری دیكەش وەكو جندیسابور [7] و حولوان [8]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی لە هەردوو شاری سەیمەرەو سیروانیش لە رۆژئاوای هەرێمی چیابوونی هەبووە [9].

---

١ تقويم البلدان، ص٤٠٣. وڵاتناسانی دیكەش باس لەوە دەكەن كەوا بەروبوومی شاری بەرزەعە باشتر و نایابتر بووە لە بەروبوومەكانی وڵاتی شام. ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٠، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٨٦.

٢ تقويم البلدان، ص٢٨٦، سەرچاوەكانی دیكەش باس لەوە دەكەن ((شاری هیزان لەنێوان شارەكانی وڵاتی عێراق و جەزیرە بەناوبانگ بووە بە ڕوو)) ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٣٣١، القزويني: اثار البلاد، ص٣٦٠.

٣ تقويم البلدان، ص٤١٧.

٤ المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص٧٤.

٥ تقويم البلدان، ص٤١٣، سەبارەت بە رووەكی زەعفەران: رووەكێكی ناسراوەو لە چەشن و جۆری گوڵی بەهاریە، ڕەگەكەی وەكو پیاز وایە و بۆنێكی خۆش و رەنگێكی جوانی هەیە بەكاردێن بۆ بۆیەكردن و ڕەنگكردنی جلوبەرگ و هەروەها وەكو چارەسەریش بەكاردێت بۆ جەستەو ژانی سەر دڵ. الدمشقي: الاشارة الى محاسن التجارة، تحقيق: البشري الشوربجي، (الاسكندرية : ١٩٧٧)، ص٣٩، القزويني : عجائب المخلوقات وغرائب الموجودات، ص٢٨٥، رزگار كريم : فەرهەنگی دەریا، (هەولێر:٢٠٠٦)، ١/ ٣٦٩.

٦ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٧ المصدر نفسه، ص٣١٥.

٨ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨، القزويني : اثار البلاد، ص٢٢٦.

٩ الاصطخري: المسالك والممالك،ص١١٨، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٩٥.

هەرچی ئەو بەروبوومانەیە کە دەچوونە چوارچێوەی دەستیەوە، ئەوا لە هەردووشاری ئەسەد ئاباد و نەهاوەند لۆکە چێنراوە بەڵام بەشێوەیەکی کەم[1].

بەهەمان شێوە لە هەرێمی جەزیرەش بەرهەم هاتووە بەتایبەتی لە شاری ئامەد ڕێژەیەکی زۆر تێدا بەرهەم هاتووە[2].

لەلایەکی دیکە لە هەرێمە کوردنشینەکانی دیکەش لە هەندێك شاردا چێنراوە، بەتایبەتی لە شاری باب الابواب لە هەرێمی ئاران[3] و هەروەها شاری دوین لە هەرێمی ئەرمینیا[4].

**دووەم/ سامانی ئاژەڵی :**

سامانی ئاژەڵی یەکێکە لەلایەنە گرنگەکانی ئابوری و پەیوەندیەکی توندوتۆڵی هەیە لە کشتوکاڵکردن و تەنانەت لە زۆر کاتا تەواوکەری یەکترن.

لەگەڵ ئەوەی لە زۆرێك لە شارە کوردنشینەکان ئاماژە بە بوونی لەوەڕگا دەکات بەڵام بەهیچ شێوەیەك باس لەوە ناکات چ جۆرە ئاژەڵێکی تێدا بەخێو کراوە، ئەوەشیان زیاتر پەیوەندی هەیە بە ڕێبازی لە خستنەڕووی زانیاریەکان کە زیاتر تیشکی خستۆتە تایبەتمەندی وشتە دیارەکانی شارەکان و کەمتر تیشکی خستۆتە سەر ئەم لایانانەوەو سەرەڕای ئەوەش کتێبەکەی کورتکراوەی سەرچاوەکانی پێش خۆیەتی و زیاتر گرنگی بە زانیاری جوگرافی داوە، بۆیە لێرەدا لەبەرگرنگی و سودێکی زۆری لەلایەنی ئابوریەوە بە پێویست دەزانرێت ئەگەر بە کورتیش بێت تیشکێك بخرێتە سەر دیارترین ئەو ئاژەڵانەی کە بۆ مەبەستی جۆراو جۆر بە خێوکراون لەناوچە کوردنشینەکان بخرێتەڕوو، بەتایبەتی لەوانەی پێداویستیەکانی ئەو سەردەمەیان پڕکردۆتەوە.

یەکێك لەو ئاژەڵانەی کە بەخێوکراوە و سوودی زۆری لێوەرگیراوە مەڕە بە پلەی یەکەم و دواتریش بزن، لەبەربوونی پێدەشت و لەوەرگای فراوان لەناوچەکانیاندا بەتایبەتی لە هەرێمی جەزیرە لە شارەکانی نەسیبین و موسڵ[5].

---

١ المستوفي القزويني : نزهة القلوب، ص٧٤، لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ص٢٣٢.

٢ المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٣١.

٣ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٢، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٣٠٣.

٤ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٢ المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٨٥.

٥ ابن حوقل: صورة الارض، ص١٦٩، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالله بن ناصر: الاوضاع الحضارية في اقليم الجزيرة الفراتية، ص٢٠١.

هەروەها لە هەرێمی رۆژئاوای چیاش بۆ زۆر مەبەست گرنگی دراوە بە بەخێوکردنی مەڕ بەپلەی یەکەم، بەتایبەتی لە شاری کرمانشا و لەسەر ئاباد و چەند شارێکی دیکە[١].

هەرچی هەرێمەکانی دیکەشە بەتایبەتی ئازربیجان گرنگی زۆر دراوە بە بەخێوکردنی مەڕومالاڵن لەبەربوونی لەوەڕگا و پاوانی فراوان[٢].

شایەنی باسە نەك تەنیا مەڕو بزن، بەڵكو ئاژەڵی تریش بەخێوکراوەو پەروەردەکراوە، بەتایبەتی ئەوانەی بۆ کرداری گواستنەوە بەکاردەهاتن لەبەر سروشتی ناوچەکە، بۆیە تێبینی ئەوە دەکرێت گرنگی دراوە بە بەخێوکردنی ولاغ و ئەسپ بۆ دوو مەبەستی سەرەکی، یەکێکیان بۆ کاری گواستنەوەو ئەویتریان لەبەرئەوەی لەناوچە سنوریەکان نزیك بووە بۆ مەبەستی شەڕو کاروچالاکی جەنگی بەکارهێنراون[٣].

بەهەمان شێوە لە هەرێمی ئارانیش ئەو جۆرە ئاژەڵانە بەخێوکراون کە بۆ مەبەستی گواستنەوە بەکارهاتوون وەکو ئەسپ و ولاغ[٤].

هەرچی هەرێمی ئازربیجانە، ئەوا گرنگیان داوە بە بەخێوکردنی چێلیش هەم بۆ گۆشت و شیرەکەی هەم بۆ مەبەستی بەکارهێنانی لە کێڵگە کشتوکاڵیەکان[٥].

جگە لەو ئاژەڵانەی باسکران، سوود وەرگیراوە لە سامانی ماسیش، ئەوەتا لەو بارەیەوە ئەبولفیدا باس لەوە دەکات لە دەریاچەی وان لە هەرێمی ئەرمینیا جۆرە ماسیەك ڕاودەکرا بەناوی **(الطريخ)** لەبەر زۆری شوێن ڕاودەکرا[٦]، لە هەرێمی جەزیرەش لەبەربوونی ڕووباری زۆر ماسی تێدا ڕاوکراوە، هەر بۆیە ئیبن جوبەیری گەڕیدە لەبارەی ماسیەکانی شاری سەرکانی (راس العين) ئاماژە بەوە دەکات ((لەو شارەدا ماسیەکی چاك و باش ڕاو دەکرێت لە جۆرەکانی دیکەی ماسی باشترە))[٧].

---

١ ابن حوقل: صورة الارض، ص٣٠٦، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٤٤٦.

٢ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٢٨، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٨٦.

٣ المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٣١.

٤ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٧.

٥ كوثر اسماعيل حسين: الحياة الاقتصادية والاجتماعية في اقليمى اذربيجان واران خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين/ العاشر والحادي عشر الميلاديين، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى كلية الاداب – جامعة صلاح الدين، (اربيل :٢٠٠٢)، ص٤٧.

٦ تقويم البلدان، ص٤٢.

٧ رحلة ابن جبير: ص١٩٠.

هەروەها لــە هــەردوو هــەرێمی ئازربیجــان و ئــارانیش ســامانی ماســی بــوونی هــەبووە، لەبەربوونی هەردوو ڕووباری ئاراس و (الکر) و لق و پۆپــەکانی، بەتایبــەتی رووبــاری (الکــر) بەناوبانگ بووە لە جۆرێکی تایبەت لە ماسی بەناوی (شورماهی)[1].

جۆرێکی دیکە لە سامانی ئاژەڵی ئەو ناوچانە کــە بــە بــەخێوکردن و پــەروەردەکردنی ســوود و قازانجێکی زۆری لێکراوە مێش هەنگوین بووە، ئەوەتا لە هەرێمی جەزیرە بەتایبــەتی لــە شــارەکانی هیزان و جەزیرەی ئیبن عومەر و موسڵ زۆرترین ڕێژەی هەنگوینی تێدا بەرهەم هاتووە[2].

هەروەها لە شاری بەدلیس ڕێژەیەکی زۆر لە هەنگوین بەرهەم هاتووە بەشێوەیەك ناسر خەســرۆی گەریدە ئاماژە بەوە دەکات ((لە ساڵێکدا ٣٠٠ تا ٤٠٠ گۆزە هەنگوینی لێ بەرهەم هاتووە))[3].

لەهەرێمی ئازربیجانیش بوونی هەبووە بەتایبەتی شاری شــنۆ بــەناوبانگ بــووە لەبەرهــەم هێنانی جۆرێکی باش لە هەنگوین[4].

هەروەها لە رۆژئاوای هەرێمی چیاش لە هەردوو شاری ئەسەد ئاباد[5] و هەمەدان ڕێژەیــەکی چاك لە هەنگوین بەرهەم هاتووە[6].

## سێیەم/ سامانی کانزایی :

لەگەڵ ئەوەی ناوچەکانی کوردستان بەگشتی دەوڵەمەند بووە بەڕێژەیەکی زۆر لــە ســامانی کانزایی بە هەموو جۆرەکانیــەوە، کەچــی تێبینــی ئــەوە دەکرێــت لای خــەڵکی ناوچــەکە بــە شێوەیەکی ڕێژەیی بــەکارهاتووە، ڕەنگــە ئەوەشــیان پەیوەنــدی هــەبێ بــە ئاســتی شــارەزایی خەڵکەکە و یاخود زۆر شتیان لە بارەیەوە نەزانیووە، بەڵام لەگەڵ ئەمــەشدا لــەلای زۆرێــك لــە وڵاتناسان بەڕوونی ئاماژەکراوە بەو ناوچانەی کە دەوڵەمــەند بوونــە لــە جــۆرێکی تایبــەت لــە کەرەستەی خاو و سامانی کانزایی، کەچی ئەبولفیــدا وەکــو زۆرێــك لەلایەنــەکانی دیکــە زۆر نەپڕژاوەتە سەری بەڵکو لە تەواوی ناوچەکەدا تەنیا لە شاری ماردین لە هەرێمی جەزیرە بــاس

---

١ القزويني: اثار البلاد، ص٤٩٣، الحميري: الروض المعطار، ص٨٨.

٢ المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٣١، عمادالدين خليل: الامارات الارتقية في الجزيرة والشام، (٤٦٥-٨١٢هـ/١٠٧٢- ١٤٠٩م)، (بيروت:١٩٨٠)، ص٤٣٦.

٣ سفرنامة، ص٧.

٤ ابن حوقل: صورة الارض، ص ص ٢٨٨- ٢٨٩.

٥ المقدسي: التقاسيم، ص٢٩٥.

٦ ياقات الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٤١٢.

لەوە دەكات ((چیاكانی ماردین دەوڵەمەند بووە بە گەوهەری شووشە))[١]، هەرچی وڵاتناسانی دیكەیە ئەوا لە زۆر شوێندا باسیان لە جۆرەها سامانی كانزایی كردووە، بەشێوەیەك باس لەوە دەكرێت لە چیاكانی بارما (حەمرین) لە هەرێمی جەزیرە كانی قیرو نەفتی تێدا هەبووە[٢]، هەروەها چیاكانی ئامەدیش ڕێژەیەكی زۆر ئاسنی تێدا هەبووە[٣].

جێگای باسە بوونی سامانە كانزایەكان لە ناوچە كوردنشینەكان ڕێژەیی بووە، بەجۆرێك لە بارەی زێڕو زیوو و بوونی نەبووە لە ناوچەكانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیا هەروەك باس لەوە دەكرێت ((لە تەواوی هەرێمی چیادا زێڕوزیو بوونی نەبووە))[٤]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێك لە شارەكانی تێبینی ئەوە دەكرێت پیشەی زێرنگەری بوونی هەبووە لە هەندێك لە شارەكانی وەكو هەمەدان ئەو پیشەیە بوونی هەبووە[٥]. ئیتر ئەوەشیان بۆمان ڕوون دەكاتەوە كەوا زێربوونی هەبووە لەو هەرێمەدا و سەرچاوەكان دركیان پێنەكردووە یاخود لە دەرەوە هێنراوەو لەوێدا كاری پێكراوە.

لەلایەكی دیكە هەر لەو هەرێمەدا چەند كاتێكی كبریتی بوونی هەبووە و سوودی لێوەرگیراوە بۆ زۆر نەخۆشی وەكو كانە كبریتیەكانی شاری حولوان[٦]. بەهەمان شێوە لە شاری ماسبذانیش كانیەكی ئاوی هەبووە، لەناو ئاوەكەیدا چەند جۆرێك لە دەنكۆڵەی سوێری كانزایی تێدا بووە بە كاردەهێنرا بۆ چارەسەركردنی نەخۆشیەكانی گەدە[٧].

هەروەها لە هەرێمی جەزیرەش لە زۆرێك لە شارەكانی سامانی كانزیای بوونی هەبووەو ئەبولفیدا باسی نەكردووە، بەشێوەیەك لە چیاكانی هەكاری لە ڕۆژهەڵاتی موسڵ ئاسن زۆر بووە[٨]، شاری سیعرق بەناوبانگ بووە بە زۆری دەرهێنانی مس، بۆیە لە زۆر بواردا سوودیان لێوەردەگرت بەتایبەتی لە دروستكردنی قاپ و قاچاخ و كەلوپەلی كارپێكردن[٩].

---

١ تقويم البلدان، ص٢٧٩.

٢ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١٥٣، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٣٢٠.

٣ ابن الفقية: مختصر وكتاب البلدان، ص١٢٧.

٤ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١٢٠، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣١٧.

٥ المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص٧١.

٦ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ١٩١، القزويني: اثار البلاد، ص٣٥٧.

٧ القزويني : اثار البلاد، ص٢٦٠.

٨ محمد جاسم حمادي: الجزيرية الفراتية والموصل، ص٢١٨.

٩ المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص١٠٥، لسترنج : بلدان الخلافة الشرقية، ص ص ١٤٥- ١٤٦.

هەرچی هەرێمە کوردنشینەکانی دیکەیە ئەوا لە زۆرێك لـە شـارەکانی جۆرەهـا سـامانی کـانزایی بوونی هەبووە، هەروەکو چۆن شاری تەوریز لە ئازربیجان بەناوبانگ بووە بە زێـڕ[1]، وە لـە نزیکیشـیەوە چەند گەرماوێکی کبریتی هەبووە بۆ چارەسەرکردنی چەند نەخۆشیەك بەکارهاتوون[2].

لەبەررۆشنایی ئەوانەی کەوا باسکران، دەکرێت باس لەوە بکرێـت لەهـەرێمی ئازربیجـان سـامانی کانزایی و کانەکان بەشێوەیەکی بەربلاو بوونی هەبووە بەتایبەتی مس و ئاسن و بەردی بـەنرخ و لەگـەڵ بوونی چەند کانیاوێك بۆ مەبەستی جۆراو جۆر بەکاردەهێنران و سوودیان لێوەردەگیرا[3].

بەهەمان شێوە لە هەرێمی ئارانیش، بەتایبەتی لە شاری تەفلیس چەندین جۆر کانزایی جۆراو جـۆر هەبووە[4]، هەروەها لە گوندی (زریە کاران)[5] کە نزیکە لە شاری بـاب الابـواب چـەندین جـۆر سـامانی کانزایی هەبووە و بەکاردەهێنران لە زۆر بواردا بەتایبەتی لە دروستکردنی کەلوپەلی جەنگی[6].

بەو شێوەیە لە تەواوی ناوچە کوردنشینەکاندا ژمارەیەکی زۆر لە کـان و سـامانی کـازایی بوونی هەبووە و بەپێی پێداویستی و شارەزاییان لە بوارە جۆراو جۆرەکاندا بەکاریان هێنـاون و سوودیان لێوەرگرتوون.

## چوارەم/ بازرگانی و بازاڕ:

### ١- بازرگانی:

بازرگانی بەیەکێك لە چـالاکیە هـەرە گرنگـەکانی ئـابوری دادەنرێـت لـە ژیـانی هـەموو کۆمەڵگەیەك، وە لەبەربوونی پێداویستیەکان هەر لە کۆنەوە ئادەمیزاد پێی هەڵساوە ئـەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە لە هەندێك ناوچە بەرهەمێکی دیاریکراو بوونی زۆرەو لـە هەندێك ناوچەی دیکەدا کەمە، ئەوەش وا دەکات کە چالاکی بازرگانی و کرداری ئـاڵۆگۆڕ لـە نێوان وڵاتان و ناوچەکەدا بوونی هەبێ و لەبەر رۆشنایی ئەمەدا ئیبن قەفیهی هەمـەدانی بـاس

١ المقدسي: التقاسيم، ص٢٨٤.

٢ القزويني: اثار البلاد، ص٣٩٩.

٣ كوثر اسماعيل حسين: الحياة الاقتصادية والاجتماعية في اقليمى اذربيجان واران، ص ص ٥٨- ٥٩.

٤ القزويني : اثار البلاد، ص٥١٩.

٥ زریە کاران: وشەیەکی کوردی لێکدراوە، پێك هاتووە لە (زری) واتە زریپۆش وە (کاران) واتە ئـەو کەسـەی دروستی دەکات، بە لێکدراوی واتە ئەو کەسانەی زرێپۆشی جـەنگی دروسـت دەکـەن. اسماعیـل شـکر رسـول: الاماره الشداديه، هامش (١٩)، ص١٢٥.

٦ ابو حامد الاندلسي: تحفة الالباب، ص٨٥.

لەوە دەکات ((ئەگەر بێتوو خوای گەورە بە سۆز و میهرەبانی خۆی شتێکی دابین نەکردبایە بۆ هەر وڵاتێك لە وڵاتەکان، هەروەها نەیبەخشیایە بە هەر هەرێمێك لە هەرێمەکان شتێك کە نەیداوە بە ئەوانی دیکە، ئەوا هەرگیز کرداری بازرگانی و کاری پیشەگەرایەتی بوونی نەدەبوو))[1] ،لێرەدا بۆمان بەدیاردەکەوێت بوونی بەرهەم لە شارێك یاخود وڵاتێك بەرێژەیەکی بەرچاو و نەبوونی لە ناوچەیەکی دیکە وا دەکات کاری ئاڵوگۆڕ و بازرگانی بێتە کایەوە.

جێگای ئاماژەپێکردنە ناوچەکانی کوردستان بە گشتی بە پیت و بەرەکەت بوونەو بەروبوومێکی زۆری جۆراو جۆری لە بواری کشتوکاڵی و شیرەمەنی و سیپایی و جلوبەرگ و پۆشاکی تێدا بەرهەم هاتووە، ئەوەش وایکردووە زیاد لە پێداویستیەکانی خۆی ڕەوانەی ئەو ناوچانە بکات کە ئەو بەرووبوومانەیان تێدا کەمە.

لەم ڕووەوە ئەبولفیدا ئاماژە بەوە دەکات لە شارەکانی رۆژئاوایی هەرێمی چیا زیاتر بازرگانی کراوە لەگەڵ وڵاتی عێراق، ئەوەشیان زیاتر لەبەر نزیکیانە لە یەکتریەوە، بە نموونەش شاری نەهاوەند لەبەربوونی باغ و بێستانی زۆر جۆرەها میوەجاتی هەبووەو لەبەر باشی جۆرەکەی ڕەوانەی عێراق دەکرا[2]، تەنانەت لەسەرچاوەکانی دیکەشدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بازاڕەکانی عێراق باشترین شوێن بوون بۆ ساغکردنەوەی کاڵاو بەرهەمی میوەجاتی شاری نەهاوەند[3].

نەك تەنیا میوەجات، بەڵکو شارەکانی رۆژئاوای چیا بەناوبانگ بوونە بە هەندێك بەرهەمی نایاب لە شیرو سیپایی بەتایبەتی پەنیری جۆری نایاب، هەر بۆیە لەبەر باشی جۆرەکەی ڕەوانەی ناوچەکانی دیکە دەکرا[4].

هەروەها لە بارەی شاری هەمەدانیش ناوبراو جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە پێگەیەکی ستراتیژی گرنگی هەبووەو دەکەوێتە سەر رێگای کاروانی حاجیان و بازرگانان[5]، ئیتر ئەوەش وایکردووە ڕۆڵێکی کارا ببینێ لە چالاکی بازرگانی ناوچەکەدا، هەر لەبەرئەوەش لە کۆنەوە بنکەیەکی سەرەکی بووە کەوا رێگای هاتووچۆی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای بەیەکەوە

---

١ مختصر كتاب البلدان، ص٢٥١.

٢ تقويم البلدان، ص٤١٧.

٣ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣٠٩.

٤ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨،المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٩٦.

٥ تقويم البلدان، ص٤١٧.

دەبەستێتەوە، لەهەمان کاتدا کەوتبووە سەر ڕێگای خوراسانی بازرگانی کە ناسرابوو بە (ڕێگای حەریر) کاتێك ڕۆژهەڵاتی جیهانی ئیسلامی بە پایتەختی خیلافەت کە بەغدا بوو دەبەستایەوە، ئەوەش وایکردبوو کەوا ببێتە بنکەیەکی بازرگانی گرنگ لەناوچەکەدا خۆی و هەم زۆرێك لە کاروانە بازرگانیەکانی پێدا تێپەڕدەبوو[1].

بەهەمان شێوە لە هەرێمی جەزیرەش زیاد لە پێداویتسی خۆیان ڕەوانەی دەرەوە دەکرد، بەشێوەیەك لە شاری نەسیبین گوڵی سپی زۆر بووە[2]، ئەوەش وایکردووە کە بۆن و بەراوو ئاوی گوڵ کە بۆنێکی خۆشی هەبووە ڕەوانەی ناوچەکانی دیکە بکرێت[3].

هەرچی شاری سیعرتە ئەوا ڕێژەیەکی زۆر لە هەنجیرو هەنارو مێوی هەبووە[4]و بەشێکی زۆری ڕەوانەی دەرەوە کراوە[5].

دیارە هەرێمی جەزیرە لەبەربوونی ئاوهەوایەکی لەبارو جۆراو جۆر زۆرترین بەروبوومی جیاوازی تێدا بەرهەم هاتووە، هەر بۆیە بەشێکی زۆر لەبەروبووم و کاڵای جۆراو جۆری لە دانەوێڵەو بەرهەمی سپیایی و پێکهاتەکانی و میوەجات و جلوبەرگ و پۆشاك و هەنگوین و ئەسپ و ماین و ئەو کەلوپەلانەی لە مس و ماددە کانزاییەکانی دیکە دروست دەکران ڕەوانەی ناوچەکانی دیکە بکرێت[6].

لەبارەی هەرێمە کوردنشینەکانی دیکەش ناوبراو باس لەوە دەکات لە دەریاچەی وان جۆرە ماسیەك تێدا زۆر بووە بەناوی (**الطريخ**) ی بازرگانی پێکراوەو بۆ زۆر ناوچە ڕەوانەکراوە[7]، تەنانەت وڵاتناسانی دیکەش جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە لەو دەریاچەیە لە هەرێمی ئەرمینیا دیاردەیەکی سەرسوڕهێنەر هەیە، بەشێوەیەك لە دە مانگی ساڵدا هیچ جۆرە ماسیەك تێدا نابینرێ، کەچی لە دوو مانگ لە ساڵێکدا ماسی ئەوەندە زۆر دەبێت دەتوانرێت

---

١ القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/ ٣٧٠، لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ص٢٣، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ادريس محمد حسن الدوسكي: همذان من الفتح الاسلامي الى سقوطها بيد المغول، ص ص١٥٤- ١٥٥

٢ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٣ المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٣١.

٤ تقويم البلدان، ص٢٨٩.

٥ المستوفي القزويني: نزهة القلوب، ص١٠٥.

٦ المقدسي: احسن التقاسيم، ص١٣١.

٧ تقويم البلدان، ص٢٩٥.

بەدەستی بگیرێت و بگرە لەوەش زیاتر لەبەرزۆری بازرگانی پێدەکرێت و ڕەوانەی چەندین ناوچە دەکرێت تەنانەت وڵاتی هیندیش[1].

لەلایەکی دیکە ئەو هەرێمانە لە زۆرێك لە وڵاتانی دیکەی ئیسلامی بەخێروبێرتر بوونەو زۆرترین بەروبووم و کاڵایان ڕەوانەی دەرەوە دەکرد، هەر بۆیە زۆرترین بازرگان و کەسانی ڕێبوار ڕوویان تێدەکردو تێداکۆدەبوونەوە[2].

بەگشتی لە هەرسێ هەرێمی ئازربیجان و ئاران و ئەرمینیا ئەو بەروبووم و کاڵایانەی ڕەوانەی دەرەوە دەکران بریتی بوون لە مێوەجات و جلوبەرگ و پۆشاکی ئاوریشم و ئەسپ و وڵاغ و هەنگوینی و ماسی (لەبەربوونی ژمارەیەکی زۆر لە دەریاچەو ڕووبار لەم هەرێمانەدا)[3].

ئەوەی لێرەدا ماوە باس بکرێت چالاکی بازرگانی لە هەرێمە کوردنشینەکاندا زیاتر چالاکی هەناردنە دەرەوەی بەخۆیەوە بینیووەو کەمتر کاڵاو شتیان لە دەرەوە هێناوە، تەنیا هەندێك لەو کاڵایانە نەبێ کە لەلای خۆیان کەم بووە وەکو شارەکانی ڕۆژئاوای چیا شەکر تیایاندا کەم بووە، هەر بۆیە پشتیان بەستووە بە شەکری خوزستان بەتایبەتی شاری جندیسابور، لەبەرئەوەی ڕێژەیەکی زۆری تێدا بەرهەم دەهات[4]، هەربۆیە لێرەدا دەکرێت بووترێت لە کوردستاندا زیاتر تەواوکەری ئابوری بەخۆیەوە بینیووەو زۆرترین بەروبووم و کاڵا ڕەوانەی دەرەوە کراوەو کەمترینیش لە دەرەوە هێنراوە.

بازاڕ گرنگیەکی ئابوری گەورەی هەیە، لەبەرئەوەی پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی بە بازرگانیەوە هەیە کە تێدا کاڵا بازرگانیەکانی تێدا ساغ دەکرێتەوە و کرداری کڕین و فرۆشتن ئەنجام دەدرێت، لەبەرئەوە دەکرێت بووترێت بازاڕ بەیەکێك لە ڕووخسارە دیارەکانی شار دادەنرێت، لەبەرئەوەی وەکو بنکەیەکی سەرەکی بازرگانی وایە کە تێدا کرداری ئاڵوگۆڕو بازرگانی ئەنجام دەدرێت و بوونی ئەو چالاکیەش لە هەرشارێك لە ڕێگای بازاڕەکەیەوەیە[5].

نەك تەنیا لە ڕووی ئابوری بەڵکو لە زۆر ڕووی دیکەشەوە بازاڕ ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە، بەشێوەیەك لە ڕێگا خۆشکەر بووە بۆ نەش و نماکردنی شارەکان، هەروەکو چۆن ئیبن حەوقەل لە

---

١ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٣٨٠- ٣٨١، القزويني : اثار البلاد، ص٥٢٤.

٢ مولف مجهول: حدود العالم، ص١١٩.

٣ المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٨٦، مولف مجهول: حدود العالم، ص١١٩.

٤ المقدسي: احسن التقاسيم، ص٣٠٤.

٥ صباح ابراهيم الشيخلي: الاصناف في العصر العباسي نشاتها وتطورها، (بغداد:١٩٧٦)، ص٣٨.

بارەی شاری دونیسر[1]باس لەوە دەکات ((لەسەرەتادا گوندێك بوو خەڵك تێدا کۆدەبوونەوە بە مەبەستی کڕین و فرۆشتن))[2]، بەهەمان شێوە یاقوتی حەمەوی ئاماژە بەوە دەکات لەو کاتەی کە منداڵ بووە وەکو گوندێك وابووە، بەڵام دوای نزیکەی سێ ساڵ دووبارە بینیوویەتی ئەو جارەیان وەکو شارێکی گەورەو ئاوەدان و بێ وێنە لەگەورەی بازاڕەکانی باسی لێوەکردووە[3]، لێرەدا بۆمان بەدیاردەکەوێت کە بازاڕی چالاك ئەوانەی خەڵکانێکی زۆر ڕووی تێدەکەن دەبێتە هۆی فراوانکردن و ئاوەدان بوونی شارەکان.

شایەنی باسە بازاری شارە کوردنشینەکان پێش ئیسلامیش بوونیان هەبووە، بەڵام لە دوای فتوحاتی ئیسلامی بۆ ئەو ناوچانە زیاتر بەدیارکەوتن و لە ڕووی نەخشەکێشان و دابەشکردنی و شێوازی دروستکردنیان گۆڕانکاریان بەسەرداهات[4].

وە لەبەربوونی ژمارەیەکی زۆر لە بازاڕ لە شارە کوردنشینەکان ستایش و وەسفی زۆر کراون لەلایەن وڵاتناسان، بەشێوەیەك لە کاتی باسکردنی شارەکە ئاماژەیان بە بازاڕەکەشی کردووە وەکو شاری دینەوەر بەناوبانگ بووە بە شارێکی ئاوەدان و زۆری بازاڕەکانی[5] هەروەها گەڕیدەکانیش زۆر ستایشی بازاری شاری تەورێزیان کردووە، بەشێوەیەك باس لەوە دەکرێت بەناوبانگ بووە بە زۆری بازاڕەکانی و تەنانەت هەر بازارێك تایبەت بووە بە پیشەو کاڵایەکی تایبەت و هیچێکیان تێکەڵی یەکتر نەبوونە، هەر بۆیە بە ((بە باشترین و جوانترین بازاڕەکانی جیهانیان ناوزەند کردووە))[6].

بەهەمان شێوە شاری کرمانشا لە هەرێمی رۆژئاوای چیا بازاڕێکی جوان و هێمنی هەبووە[7]، شاری هەمەدانیش بازارێکی ئاوەدانی تێدا بووە[8].

---

١ دونیسر: شارێکی گەورەو بەناوبانگە لە هەرێمی جەزیرەو دەکەوێتە نزیك شاری ماردین و نێوانیان دوو فەرسەخە/١٢ کیلۆمەتر، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٤٧٨.

٢ صورة الارض، ص٢٠٢.

٣ معجم البلدان، ٢/ ٤٧٨.

٤ فرهاد حاجي عبوش: المدينة الكوردية من القرن ٤-٧هـ/ ١٠- ١٣م دراسة حضارية، (دهؤك:٢٠٠٤)، ص١٧٩.

٥ المقدسي: احسن التقاسيم،ص٢٩٥.

٦ ماركوبولو: رحلات ماركوبولو، ١/ ٦٤، ابن بطوطة : رحلة ابن بطوطة، ص ص ١٤٩- ١٥٠.

٧ المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٩٥.

٨ المصدر نفسه، ص٢٩٣.

هەرچی شاری دوینە ئەوا بازاڕەکەی لە شێوەی خاچیدایە و دابەش بووە بۆ چوار لا[1]، بەم شێوەیە هیچێك لە شارە کوردنشینەکان بێ بازاڕ نەبوونە، کەچی ئەبولفیدا تەنیا باسی لەبازاڕی (الكركی)[2]کردووە، کاتێك باس لەوە دەکات ئەو بازاڕە دەکەوێتە دەرگای شاری بەرزەعە لە هەرێمی ئاران و لە ڕۆژانی یەکشەممە خەڵکانێکی زۆر تێدا کۆدبەنەوە بە مەبەستی ئالۆگۆڕکردن و کڕین و فرۆشتن، لە درێژەی قسەکانیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی بەو شێوەیە بووەو لە ڕۆژگاری ئەودا ئەو کەسانەی بینیوویانە باس لەوە دەکەن بەو شێوەیە نەماوەو بەڵکو زۆری تێکچووە[3]، دیارە ئەو بازاڕە لەبەر گرنگی وڵاتناسانی دیکەش باسیان لێوەکردووە کە بازارێکی فراوان بووەو ڕووبەرەکەی فەرسەخ بۆ فەرسەخ بووە واتە نزیکەی دوانزە کیلۆمەتر، تایبەت بووەو لە ڕۆژانی یەکشەممە خەڵکانێکی زۆر ڕوویان تێدەکرد لە هەموو لایەکەوە تەنانەت خەڵکی عێراقیش، لەبەربەردەوامی ناوی (الكركی) لە هەفتەدا شوێنی ڕۆژی یەکشەممەی گرتووە، بەشێوەیەك دەیانگوت ڕۆژی شەممە ڕۆژی (الكركی) ڕۆژی دووشەممە[4].

هەروەها شاری نەهاوەندیش بازارێکی بەناوبانگی هەبووە و زۆرێك لەبەرهەمەکانی ئەو شارەی تێدا دەفرۆشرا بەتایبەتی مێوەجاتەکەی کە لەبەرباشی جۆرەکەی ڕەوانەی عێراقیش دەکرا[5].

---

١ المصدر نفسه، ص٢٨٣.

٢ یەکێك لە ژێدەرکان وای بۆ دەچێت زاراوەی (الكركی) لە زارەوەی قریاقۆس (Kuriakos) یۆنانیەوە هاتووە و بە واتای (ڕۆژی پەروەردگار) دێت، لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ص٢١٢.

٣ تقويم البلدان، ص٤٠٣.

٤الاصطخري: المسالك والممالك، ص١٠٩، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩١، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٨٦، القزويني : اثار البلاد، ص٥١٢.

٥ تقويم البلدان، ص٤١٧، وڵاتناسانی پێش ئەبولفیداش هەمان بۆچوونیان هەیە، الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨، ابن حوقل: صورة الارض، ص ص ٤١٣- ٤١٤.

# تەوەرەی دووەم

## لایەنی بیناسازی و ئاوەدانکاری

لایەنی بیناسازی و ئاوەدانکاری یەکێکە لە دیمەن و ڕواڵەتە دیارەکانی شارستانیەت لە هەر کۆمەڵگەیەك، دیارە شارە کوردنشینەکان بێبەش نەبوونە لەم لایەنە و بەڵکو بە پێی پێشکەوتن و گۆڕانکاریەکانی سەردەم وەکو هەموو شارەکانی دیکەی جیهان گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووەو پێشکەوتنیان بە خۆیانەوە دیوە.

ئەم لایەنانەش وەکو لایەنێکی گرنگی شارستانیەت کۆمەڵێك دامەزراوە لە خۆ دەگرێت کە دەکرێت دابەشیان بکەین بەم شێوەیەی خوارەوە:

دامەزراوە سەربازیەکان، کە زیاتر خۆی دەبینیەوە لە قەڵاو شورەو قایمکاری، کاتێك بۆ شارەکان بنیاد دەنرا بە مەبەستی پاراستنی لە هەر هێرشێکی دەرەکی، هەروەها دامەزراوە مەدەنی و خزمەتگوزاریەکان کە زیاتر پێك هاتبوو لە دروستکردنی پردو خانوو کۆشك و گەرماو ئەو شتانەی کە لە کۆمەڵگا بنیاد دەنرێن و سوود و قازانجی بۆ هەموو لایەکەوە هەیە، دواتر دامەزراوە ئایینی و زانستیەکان کە ئەوانیش زیاتر پێك هاتبوو لە مزگەوت و خانەقاو خوێندگا ئاینیەکان بەگشتی.

دیارە ئەو دامەزراوانەش بە پێی سەردەم گۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە، ئەوەتا لە بارەی شاری کوردنشینەکان لە پێش ئیسلامدا پێك هاتبوو لە پەرستگا یاخود کلێسا، قەڵا، بازاڕ، خانوو، ئەنجومەنی بەڕێوەبردن (مبنى البلديه)، شورەی دەوری شارو خەندەق[1]، بەڵام لە دوای هاتنی ئیسلام گۆڕانکاریان بەسەرداهاتووە پێك هاتن لە مزگەوت، خانەی میر (دار الامارە)، قەڵا، بازاڕ، خانووی نیشتەجێبوون، شورەو خەندەقی دەوری شار[2].

---

١ فرهاد حاجى عبوش: الدينة الكوردية، ص٧٨.

٢ عبدالجبار ناجي: دراسات في تاريخ المدن العربية الاسلامية، (بغداد:١٩٨٦)، ص ص ٦٩- ٧١.

ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت ئەبولفیدا زیاتر باسی لە دیمەن و ڕواڵەتە سەربازیەکان کردووەو کەمتر پڕژاوەتە سەر لایەنەکانی دیکەو تەنیا لە هەندێك شاردا نەبێت باسی لە پێکهاتەو کەرەستەی دروستکردنی خانووەکانیانی کردووە، هەر بۆیە لێرەدا دیارترین سیماو ڕواڵەتە ئاوەدانکاریە شارستانیەکانی شارە کوردنشینەکان دەخەینەڕوو کە ناوبراو زۆرترین زانیاری لە بارەیەوە خستۆتەڕوو.

**یەکەم: قەڵاو قایمکاری:**

یەکێکە لەو سیماو ڕواڵەتە دیارانەی کە لە شارەکاندا زانیاری زۆر لە بارەیانەوە خستۆتەڕوو، ئەوەش زیاتر لەوەدا سەرچاوەی گرتووە لە کاتی باسکردنی شارەکان زیاتر تیشکی خستۆتەسەر ئەو جۆرە بابەتانەوە لەبەرئەوەی لە سیما دیارەکانی شارەکان بوون.

شارە کوردنشینەکان هەر خۆیان بەناوبانگ بوونە بە شاری قایم و سەخت و قایمکاری زۆریان تێداکراوە بە گشتی، ئەوەشیان زیاتر پەیوەندی هەبووە بە دوو هۆکار کە کاری قایمکاری بەو شێوە بەربڵاوە تیایاندا بکرێت، ئەوەتا یەکەمیان شارەکانی ڕۆژهەڵات بە گشتی و شارە کوردیەکان بەتایبەتی بەردەوام تووشی هێرش و پەلاماردانی دەرەکی دەبوونەوە لەلایەن هێزە داگیرکەرەکانی فارس و یۆنان و ڕۆمان و لەسەردەمانی دواتریشدا مەغۆل، ئیتر ئەوەش بووە هاندەر بۆ ئەوەی قەڵاو قایمکاری زۆریان تێدا بکرێت بە مەبەستی پاراستن و ڕووبەڕووبوونەوەیان[1]. دووەمیان دەکرێت باس لەو پێشکەوتنانەی شارەکە بکرێت کە بە دەستی هێناوە لە ڕووی ماددی و بازرگانی و شارستانی و لایەنەکانی دیکە بەتایبەتی سەقامگیری کارگێری کە دەبێتە هۆکارێکی پاڵنەر بۆ ئەوەی قایمکاری بکرێت بە هەموو شێوازەکان لە شارەکاندا[2].

قەڵاکانیش بە گشتی زۆر جار بۆتە هۆکاری دروست بوونی شار، هەر بۆیە وەکو شار وایە لە دەوروبەری شورەو قایمکاری بەهێز دەکرێت و خەندەقیش لە دەوریا لێدەدرێت، بەشێوەیەك کەس ناتوانێ بچێتە ناویەوە تەنیا بە دەرگاو ڕێڕەوە سەرەکیەکانی نەبێ[3]، یاخود وەکو

---

١ عبدالرزاق عباس حسين: نشاة مدن العراق وتطورها، (بغداد:١٩٧٢)، ص٦١.

٢ محمد جاسم حمادي: الجزيرة الفراتية والموصل، ص ص ٣٨١- ٣٨٢.

٣ فرهاد حاجي عبوش: المدينة الكوردية، ص٤٧.

شوێنێکی قایم و گرنگ دەبێت لە شارەکاندا لە کاتی تەنگەتاوی فەرمانڕەواو دەسەڵاتداران ڕووی تێدەکەن و زۆرجار سەروەت و سامانیشی تێدا حەشار دەدەن[1].

هەرچی کاری قایمکاری و کاری لەو جۆرەیە، زیاتر لەو ناوچانەدا بنیاد دەنرێت کە پارێزراو نین یاخود لە ناوچە چیایەکان بۆ پاراستنی ڕێگاوبانەکان و ئەو ناوچانەی لە ڕووی ستراتیژیەوە گرەنگن و پێویستیان بە پاراستن هەیە بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەستی دوژمن[2].

لەبارەی مێژووی بنیادنانیشیان لە هەرێمە کوردنشینەکاندا، ئەوا هەندێکیان مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی کۆن و لە پێش ئیسلامیشدا بنیادنراون، هەر بۆیە پێیانگوتراوە (قەلا کۆنەکان)، هەندێکی دیکەشیان لەسەردەمی ئیسلامدا بنیادنراون و تەنانەت هەندێکیان بوونیان هەبووەو لەسەردەمی ئیسلامدا دووبارە نۆژەنکراونەتەوە[3].

ئەوەتا لەبارەی مۆلگەی (عقر) حەمیدی، ئەبولفیدا باس لەوە دەکات ((قەلایەکی سەخت و بەناوبانگە لە شاری موسلْ و هۆزی حەمیدی کوردی تێدا نیشتەجێنە))[4]، هەر لەبەرئەوەشە ناوچەکە ناسراوە بە عقری حەمیدی[5].

بەهەمان شێوە لەو ناوچەیەدا ناوبراو ناوی قەلایەکی دیکەی هێناوە، ئەویش قەلای شوشە[6] و سەر بە شاری موسڵە[7].

یەکێکی دیکە لە قەلاکانی هەرێمی جەزیرە، قەلای (فنك) ەو دەکەوێتە نزیك شاری جەزیرەی ئیبن عومەر[1].

---

١ حكيم احمد مام بكر: الكرد وبلادهم، ص١٧٠.

٢ شاكر مصطفى: المدن في الاسلام حتى العصر العثماني، (الكويت: ١٩٨٨)، ١/ ٤٥١.

٣ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٢٣٧- ٢٣٨، ابن شداد: الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١/ ٢٤٦، الحميري: الروض المعطار، ص٥٤٥.

٤ تقويم البلدان، ص٢٧٤، یاقوتی حەمەویش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە قەلایەکی سەخت و قایمی چیاکانی موسڵەو کوردەکان پێی دەڵێن (ئاکری) . فائزه محمد عزت: الكرد في اقليم الجزيره وشهرزور، ص٥٧.

٥ ابن الاثير : الباهر، ص٤٨، القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/ ٣٢٩.

٦ شوش: یەکێکە لە قەلا گەورەو بەرزەکان و دەکەوێتە نزیك شاری ئاکرێ و سەر بە شاری موسڵە، باس لەوە دەکرێت لە عقری حەمیدی بەرزترو گەورەترە بەڵام لە ئەندازەی بەهێزیا وەکو یەکن. یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٣، ٣٧٢، القلقشندی: صبح الاعشى، ٤/ ٣٢٩.

٧ تقويم البلدان، ص٢٧٤.

دیاره ئەو قەڵایە لەلای سەرچاوەکانی دیکەش ناوی هاتووە[2] و تەنانەت باس لەوە دەکەن قەڵایەکی سەخت و قایمی کوردە بەشنەویەکانە[3] لە نزیك جەزیرەی ئیبن عومەرو نێوانیان دوو فەرسەخە/ ۱۲ کیلۆمەترەو نزیکەی سێ سەد ساڵە لە ژێر دەستی کوردانە و بەوە ناسراون کە ڕێزی ئەو کەسانە دەگرن کە ڕوویان تێدەگەن و پارێزگاریشیان لێدەکەن[4].

قەڵای عیمادیە (ئامێدی) یەکێکی دیکەیە لەو قەڵایانەی ئەبولفیدا ناوی هێناوەو باس لەوە دەکات ((قەڵایەکی ئاوەدانەو سێ قۆناغ لە موسڵەوە دوورەو دەکەوێتە بەشی باکوری خۆرهەڵاتی موسڵ و باکوری شاری هەولێر، هەڵکەوتەکەشی لەسەرچیایەو لە دامێنی باغ و بێستانی زۆرە))[5].

جێگای ئاماژەپێکردنە پێش ئەو قەڵایە لەو ناوچەیەدا قەڵایەکی دیکە هەبووە بە ناوی (ئەشب)، کە یەکێك بووە لە قەڵا گەورەکانی دەوروبەری موسڵ و هۆزی هەکاری[6] کوردی تێدا نیشتەجێ بوونە و لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا بووە[7].

لەباری گۆڕینی ناویشی بۆ عیمادیە ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری عیمادەددین زەنگی کوڕی ئاق سنقر (۵۲۱- ۵٤۱ك/ ۱۱۲۷- ۱۱٤٦ز)، دوای ئەوەی دەستی بەسەر ناوچەکەدا گرت قەڵای نەشیب لەبەر گەورەیی و کۆنی زۆری تێدا چوو بوو ئەویش لە ساڵی (۵۳۷ك/ ۱۱٤۲م) لە شوێنی ئەو قەڵایە

---

١ نفس المصدر والصفحة .

٢ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١/ ٢١٥، القلقشندي: صبح الاعشى، ٤/ ٣٢٩.

٣ بەشنەویەکان: یەکێکە لە هۆزە گەورەو بەهێزەکانی هەرێمی جەزیرەو زیاتر لە دەوروبەری جەزیرەی ئیبن عومەر نیشتەجێ بوون و چەند قەڵایەك لە ژێر دەستیاندا بووە، شەرەفخانی بەدلیسی : شەرەفنامە، ل٢٠٩، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەیانەوە بڕوانە: زرار صديق توفيق: القبائل والزعامات القبليه الكرديه، ص ص ٤٠- ٤٣.

٤ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٢٧٨، القزويني : اثار البلاد، ص ص ٣٤١- ٣٤٢.

٥ تقويم البلدان، ص٢٧٥.

٦ هەکاریەکان: یەکێکە لە هۆزە کوردیە گەورەو بەناوبانگەکان، لەبەر زۆری دەسەڵاتی و فراوانیان ئەو ناوچانەی تێدا نیشتەجێ بوونە هەر بەناوی ئەوانەوە ناسراوە و قەڵا و شوێنی قایمیان لە موسڵ و بەشەکانی ڕۆژهەڵاتی لە ژێر دەستدا بووە بەتایبەتی شاری جولەمێرگ و عیمادیە لە پێشتریشدا قەڵای ئەشیب.ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٣/ ٣٤٥، بۆ زیاتر زانیاری لە بارەیانەوە بڕوانە: درويش يوسف حسن هروری: بلاد هەکاری، (دهۆك:٢٠٠٥) ص ص ٤٠- ٤٢.

٧ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٥٤.

یەکێکی دیکەی دروستکرد، بۆیە بەناوی (عیمادیە) کراوە[1]، هەرچی شارناس حەمەدوڵڵای مستەوفی قەزوینیە ئەوا ناوی دەگێڕێتەوە بۆ عیمادو دەولەی بویەهی (م٣٣٨ك/ ٩٤٩ز)[2].

هەروەها قەڵای کوشاف یەکێکی دیکەیە لەو قەڵایانەی کەوا ناوبراو ناوی هێناوە، بەڵام ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت لە هەردوو هەرێمی چیاو جەزیرە باسی لێوە کردووەو یەکلایی نەکردۆتەوە لە کامە هەرێمەو هەمان زانیاری لە بارەیەوە دەخاتەڕوو کاتێك باس لەوە دەکات ((قەڵایەکی ئاوەدانەو دەکەوێتە نێوان زێی گەورەو لە قەرداغی ڕووباری دیجلەو نزیکە لە ڕێچکەیەی دەڕژێتە نێو ڕووباری دیجلەو دوو قۆناغ لە هەولێرەوە دوورە، لە دەوروبەریشیەوە لە وەرگاو پاوان زۆرە))[3]، هەرچی بیروڕای سەرچاوەکانە ئەوا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەوا دەکەوێتە هەرێمی جەزیرە[4].

هەر لەو سەروبەندەدا ناوی قەڵایەکی دیکە هاتووە ئەویش (هەتاخ)ە ناوبراو لە بارەیەوە زۆر زانیاری نەخستۆتەڕوو بەڵکو تەنیا باس لەوە دەکات قەڵایەکی سەخت و قایمە لە دەڤەری بەکر (دیاربکر)[5].

حسنکێف قەڵایەکی دیکەی هەرێمی جەزیرەیە[6] و شاخە بەرزەکان لە سێ لاوە دەوریان داوە[7]، ئیتر هەڵکەوتەی قەڵاکەش لەو ناوچەیەدا وایکردووە شوێنێکی ستراتیژی گرنگ و پارێزراو سەخت و قایم و دژواری هەبێت کە دوژمن نەتوانێت بە ئاسانی زەفەری پێ ببات[8]، هەربۆیە لەبەر سەختی و قایمی قەڵاکە ((بەیەکێك لە قەڵا سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان ناوزەند کراوە))[9].

---

١ المصدر نفسه،٤/ ١٤٩، القلقشندي: صبح الاعشى، ٣٢٨/٤.

٢ نزهة القلوب، ص١٠٥.

٣ تقوم البلدان، ص ص ٢٧٥- ٢٧٦.

٤ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٤٦١، القلقشندي:صبح الاعشى، ٤، ٣٢٨.

٥ تقوم البلدان، ص٢٨١، لەسەرچاوەکانی دیکەش باسی کراوەو دەکەوێتە نزیك شاری میافارقین، یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٣٩٢/٥، ابن شداد : الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١/ ٢٥١.

٦ تقوم البلدان، ص٢٧٩.

٧ ياقوت الحموي: معجم البلدان،٢٦٥/٢.

٨ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٢، ابو الفداء: المختصر في اخبار البشر، ٢/ ٢٥٣.

٩ الانصاري: نخبة الدهر في عجائب البرو البحر، ص٢٥٧.

هەروەها قەڵای ماردینیش لە قەڵا دیارەکانی هەرێمی جەزیرەیەو لەسەر چیایەك بنیادنراوە کە بەرزیەکەی لەسەر زەوی بۆ سەرووی دوو فەرسەخە/ ١٢ کیلۆمەتر، لە هەمان کاتدا پێگەیەکی سەخت و قایمی هەیەو ئاستەمە بە زۆر و بەهێز بەسەریدا زاڵ بێت[١].

دیارە ئەو قەڵایە ستایشی زۆری کراوە بە شێوەیەك باس لەوە دەکرێت ((لەسەر زەوی هیچ قەڵایەکی دیکە نیە هێندەی قەڵای ماردین باشتر و گەورەتر و قایمتر و سەختر بێت ))[٢]، لەهەمان کاتدا ئەو قەڵایە ناوێکی دیکەشی هەبووەو پێیەوە ناسراوە ئەویش (قەڵای باز)ە[٣].

لەبارەی شاری ژەنگاریش، ئەبولفیدا تەنیا ئاماژە بەوە دەکات قەڵایەکی تێدا هەبووە بەبێ ئەوەی هیچ زانیاریەك بخاتەڕوو[٤]،کەچی لە یەکێك لەسەرچاوەکاندا باس لەوە کراوە کە لەو شارەدا دوو قەڵا هەبووەو هەردووکیان لەسەردەمی ئیسلامیدا بنیادنراون[٥] و ئەولیا چەلەبیش هەرچەندە لەسەردەمانی دواتر هاتووە، بەڵام ئاماژەی بە قەڵای ژەنگار کردووەو باس لەوە دەکات ((قەڵایەکی قایم و سەختە لەسەر کێوێکی بەرزو بڵندی بێ خەرەند بنیادنراوە))[٦].

لەبارەی شاری ئامادیش، ناوبراو باس لەوە دەکات لەو شارەشدا قەڵایەکی گەورە هەبووە[٧]، دیارە ئەو قەڵایە لەلایەن خۆیەوە بیروڕای جیاوازی بەدیدەکرێت لە بارەی کات و سەردەمی دروستکردنی، ئەوەتا باس لەوە دەکرێت کە لەسەردەمی ئیسلامدا بنیادنراوە لەسەر چیایەکی بەرز لەبەردی ڕەش نە ئاگرو نەئاسن کاری تێناکات، وە لەبەر ڕەنگی قەڵاکەش پێیگوتراوە (قەرە ئامێدی)[٨]، لەلایەکی دیکە

---

١ تقويم البلدان، ص٢٧٩، ئەو ژمارەیە دوورە لە ڕاستی، چونکە هیچ چیایەك لە جیهان ئەوەندە بەرزنابێت .

٢ القزويني: اثار البلاد، ص٣٥٩.

٣ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١/ ١٢٤.

٤ تقويم البلدان، ص٢٨٣.

٥ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١/١٥٥.

٦ سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل٧٨.

٧ تقويم البلدان، ص٢٨٧.

٨ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١/٣٥٤، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ئەولیا چەلەبی : سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل ل ٣٨- ٤٠.

یەکێك لە توێژەران مێژووی بنیادنانی دەگێڕێتەوە سەردەمانێکی زۆر کۆن کاتێك باس لەوە دەکات کـە ئەو قەڵایە لەسەردەمی خوریەکان[1] بنیادنراوە[2].

لەگەڵ ئەوەی ئاماژەی بە ژمارەیەکی زۆر لە قـەڵاکانی هـەرێمی جـەزیرە کـردووە، بـەڵام لەهەمان کاتدا چەند قەڵایەکی دیکەی گرنگ لە ناوچەکەدا بوونی هەبووەو ناوی نەهێناون، لە دیارترین ژمارەیەك لە قەڵایە بەناوی (الجرامیە- فرح- برخو- فنك[3]- جدیـدە- قصـر- اروح- کنکور) کە دەکەوێتە ناوەوەو دەرەوەی جەزیرەی ئیبن عومەر[4].

بەهەمان شێوە قەڵای (ئەرموشت) یەکێکی دیکەیە لـە قـەڵا قـایم و سـەختەکانی نزیـك جەزیرەی ئیبن عومەر و دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەو لەسـەر چـیای جودیـەو لـە ژێـر دەسەڵاتی سەرداری موسڵ بووە[5].

سەرەڕای ئەو قەڵایانەی کەوا باسکران چەندان قەڵای دیکەش لە ناوچـەکەدا هـەبوون و لـە ژێر دەسەڵاتی کوردان بووە وەکو قەڵای بشر[6] و جلصوری[7] و سەرجە[8] و هرور[1].

---

١ خوریەکان: یەکێکە لە نەتەوە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات و لەناوچە چیاکان لە باکوری ڕۆژهەڵاـتی نێوان دوو ڕووبار بوون. دواتر لە چارەگی یەکـەمی هـەزارەی دووەم(پ.ز) هـاتوون لـە سـوریا نیشـتەجێ بـوون و کردویانەتـە نیشتمانی خۆیان، دوای مانەوەیان لەو ناوچایەدا توانیان مەملەکەتێکی سنور فراوان دابمەزرێنن کە سنورەکەی درێژ دەبێتەوە لە باکوری سوریا بۆ ڕۆژهەڵات بۆ باکوری عێراق، شـاری (نـۆزی) لـە نزیـك کـەرکوکیان کـردە بنکەی دەسەڵاتی خۆیان، طة باقر: مقدمة في تاريخ الحضارات القديمة، ١/ ٧٨- ٧٩ جمال رشـيد احمـد و فـوزی رشيد: تاريخ الكرد والقديم، (اربيل :١٩٩٩)، ص ص ٦٧- ٦٨.

٢ فرهاد حاجی عیوش: المدينة الكوردية، ص٥٥.

٣ فنك: لە پێشتردا باسی لێوە کراوە.

٤ ابن شداد: الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١/٢١٥.

٥ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ١٤٦.

٦ بشير: یەکێکە لە قەڵایەکی دەوروبەری ناحیەی زۆزان و لەژێر دەسەڵاتی کوردە بەشنەویەکان دابووە، یـاقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٤٢٩.

٧ جلصوری: دەکەوێتە هەرێمی جەزیرەو لە چیاکانی هەکاریە لە زەویەکانی موسڵ، المصدر نفسه، ٢/ ١٥٤.

٨ سەرجە: زاراوەیەکی فارسیە لە (سروجە) وەرگیراوە واتە سەری بیر، ئەو قەڵایە دەکەوێتـە نێـوان نەسـیبین و دونیسر و دارا، لە دروستکراوی ڕۆمانەکانەو تاوەکو ڕۆژگاری یاقوتی حەمەوی بـوونی مـابوو جوتیـاران تێـدا نیشتەجێبوون، المصدر نفسه، ٣/ ٢٠٧ .یەکێك لە توێژەران وای بۆدەچێت زاراوەکە کوردییە نەوەك فارسی و لە

هەروەها قەڵای کرخینی (کەرکوك) یەکێکی دیکەیە لە قەڵا سەخت و جوانەکانی نێوان داقوق و هەولێر[2]، باس لەوە دەکرێت مێژووی بنیادنانی دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵانی (٤٥٠٠- ٣٥٠٠پ.ز)[3].

لەبارەی رۆژئاوای هەرێمی چیاش، ئەبولفیدا باس لەقەڵای (ئەزناو)[4] دەکا و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لە دەوروبەری شاری هەمەدانە[5]، بەهەمان شێوە قەڵایەکی دیکە لەو ناوچەیەدا بوونی هەبووە بەناوی (قروجان)[6] و ناوبراو لەلایەن خۆیەوە ئاماژەی پێنەکردووە.

هەروەها قەڵای هەولێر یەکێکە لە قەڵا دیارەکانی شاری هەولێر و لەسەر گردێکی خۆڵ بنیادنراوە[7]، سەرچاوەکانی دیکەش هەمان بۆچوونیان هەیەو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە زۆرینەی دانیشتوانی شارەکەشی کورد بوونە[8].

جێگای ئاماژە پێکردنە ئەو ڕووداوە مێژوویانەی بەسەر شارەکەدا هاتووە خۆی شایەنی قایمی و سەختی ئەو قەڵایە دەدات. بە جۆرێك دوای ئەوەی مەغۆلەکان ڕوویان لە جیهانی ئیسلامی کرد زۆرێك لە شارە کوردنشینەکان بەرئەو شاڵاوە کەوتن، شاری هەولێریش یەکێك بوو لەو شارانەی لە ساڵی (٦٣٤ك/ ١٢٣٦ز) بەر ئەو شاڵاوە کەوت، دوای ئەوەی مەغۆلەکان بەهێزێکی گەورە گەمارۆی شارەکەیاندا بە ژمارەیەکی زۆر لە مەنجەنیق توانیان دەستی

---

بنەڕەتدا لە (سەرچاوە)وە هاتووە واتە سەرکانی، خۆشی ئەو ناوچەیەش کوردیە و شوێنی فارسەکان نیەن بۆیە ئەو بۆچوونە زیاتر نزیکە لە ڕاستی، حکیم احمد خۆشناو: الكردوبلادهم، هامش(٩)، ص١٨٦.

١ هرور: ناوی دوو قەڵایە لە ناوچە کوردنشینەکاندا یەکێکیان قەڵایەکی سەخت و دژوارەو دەکەوێتە بەشی باکوری موسڵ و نێوانیان سێ فەرسەخە/ ١٨ کیلۆمەتر و لەگەڵ شاری ئامێدیش سێ میلە/ ٦ کیلۆمەتر، ئەویدیکەیان سەر بە هەولێرەو لە ناوچە چیاکانیەتی لەبەشی باکوری. یاقوت الحموی: معجم البلدان، ٥، ٤٠٣، لە کاتی ئێستادا ناسراوە بە (هەریر) حکیم احمد خۆشناو، الكورد وبلادهم، ص٢٠٨.

٢ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٤٥٠.

3 Herzfeld:The persion Emoire,(wiesbaden: 1968),p.75.

٤ ئەزناو: بەدوو شێوە لەلای یاقوت ناوی هاتووە (ئەزناو وە ئەزن) معجم البلدان، ١/ ١٦٩

٥ تقويم البلدان، ص٤٠٩.

٦ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٤/ ٢٤٧.

٧ تقويم البلدان، ص٤١٣.

٨ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ١٣٨، الانصاري: نخبة الدهر في عجائب البر والبحر،ص٢٥٥، ابن عبدالحق البغدادي: مراصد الاطلاع على اسماء الامكنة والبقاع، حققه: علي محمد البجاوي، (بيروت:١٩٥٤)، ١/ ٥١.

بەسەردا بگرن[1]، بەڵام ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت بۆ ماوەی چل ڕۆژ گەمارۆی قەڵاکەیان دا نەیان توانی دەستی بەسەردابگرن لەو ساڵەدا، ئەوەشیان لەبەربەهێزی و قایمی قەڵاکەو هەروەها خەڵکی خۆڕاگری ناویەوە بوو کە بە هەموو شێوەیەك بەرگریان دەکرد، هەر ئەوەش وایکرد مەغۆلەکان لەو ساڵەدا پاشەکشەبکەن لە شارەکەدا[2].

بەهەمان شێوە دوو قەڵای دیکەش بوونیان هەبووەو ئەوانیش سەر بە شاری هەولێر بوونە، یەکێکیان لە ڕێگای مەراغەیەو ناسراوە بە (خوفتیانی زرزاری) و ئەوی دیکەیان لە ڕێگای شارەزوور بۆ هەولێرەو ناسراوە بە خوفتیانی سورخابی کوڕی بەدری عەنازی (٤٥٥- ٥٠٠ك/ ١٠٦٣- ١١٠٦ز)، ئەوەشیان لەوەی پێشتووتر گەورەتر بووەو زۆرجار بە (خوفتیندکان) دەنووسرێت[3].

هەرچی قەڵای (سرماج)ە، ئەوا یەکێکە لە قەڵا دیارەکانی ناوچە چیاکان و ئەبولفیدا ئاماژەی پێنەکردووە، ڕەنگە ئەوەشیان لەبەرئەوەبێ لەسەردەمی ئەودا بوونی نەمابێ و تێکچووبێ، ئەو قەڵایە لە لایەن خۆیەوە دەکەوێتە نێوان هەمەدان و خۆزستان و لە هەمووی کاتدا بە یەکێك لە قەڵا قایم و سەخت و دژوارەکان دادەنرێت[4].

دیارە مێژووی بنیادنانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیسلام لەلایەن یەکێك لە میرە کوردیەکان بەناوی حەسنەوی کوڕی حسێنی بەرزیکانی (٣٤٨- ٣٦٩ك/ ٩٥٩- ٩٧٨ز)، دوای ئەوەی هەندێك لە بەرەی دارماوی لە گوندی ئەبو ئەیوب هێنا کە ناسراوە بە (الدکان) ئەو قەڵایەی پێی دروست کردو کردی بە پێگەی دەسەڵاتی خۆی [5].

لەگەڵ ئەوەی یاقوت ئاماژە بەوە دەکات کە دەکەوێتە نێوان هەمەدان و خۆزستان، بەڵام یەکێك لە توێژەران دەیەوێت زیاتر شوێنەکەی دیاری بکات، بەشێوەیەك باس لەوە دەکات کە ئەو قەڵایە دەکەوێتە سەر چیایەك کە دەڕوانێتە سەر گوندی ئەبو ئەیوب، ئەو گوندەش دەکەوێتە لای ڕاست لە چیای بێستون بۆ شاری کنگور، هەر بۆیە وا نیشان دەدات کە

---

١ المقريزى: السلوك لمعرفة دول الملوك١/ ٣٧٨، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ٥/ ١٥٩.

٢ ابن العبري: تاريخ مختصر الدول، ص٢٥٠، ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة، ٦، ٢٩٦- ٢٩٧، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: عبدالله علياوي: كوردستان في عهد المغول، تقديم: محسن محمد حسين (السليمانية:٢٠٠٥)، ص ص ١٢٢- ١٢٤.

٣ ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/٣٧٩- ٣٨٠.

٤ المصدر نفسه، ٣/ ٢١٥.

٥ ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ٨/ ٧٠٦.

دەكەوێتە نزیك چیای بێستون، بۆ ڕاستی ئەوەش بەڵگەی شوێنەواری دەهێنێتەوە كە دوو پارچە لەبەرد دۆزراوەتەوە كە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مزگەوتەی هەمان میر بنیادی ناوە لە دەوری نۆ كیلۆمەتر لە باشوری ڕۆژهەڵاتی چیای بێستون، ئەوەشیان دەكاتە شوێنی قەڵاكە[1].

لەلایەكی دیكە لە هەرێمە كوردنشینەكانی دیكەش قەڵا بەدیدەكرێت بەشێوەیەك باسكردنی شاری بەدلیس لە ئەرمینیا وا نیشان دەدات كە شارێكی قایم و سەخت بووە بەڵام تیشك ناخاتە سەر قەڵای شارەكە[2]، كەچی باس لەوە دەكرێت ئەسكەندەری مەقدونی (٣٣٦- ٣٢٣پ.ز) بڕیاریدا قەڵایەك لەو شارەدا دروست بكات ئەوەندە قایم و بەهێز بێت ئەگەر خۆی هێرش بكاتە سەری نەتوانێ دەستی بەسەردا بگرێت، بەم شێوەیە قەڵاكە بنیادنرا[3]، بەهەمان شێوە ئەلمقدسی ئاماژە بەوە دەكات قەڵایەكی لە بەرد دروستكراوی هەبووە، بەڵام باس لەوە ناكات كەی بنیادنراوە[4].

هەروەها لە هەرێمی ئازربیجانیش لە شاری ورمێ ناوی قەڵایەكی هێناوە بەناوی (تلا)، كە هەمان ناوی دەریاچەكەی ئەو ناوچەیە و خۆی ورمێیە، بەڵام ئەو بەتلاش ناوی هێناوەو باس لەوە دەكات ((ئەو قەڵایە لەسەر چیایەو لەبەر قایمی و سەختی و دژواری قەڵاكە هۆلاكو (م٦٦٣ك/ ١٢٦٥م)، سەروەت و سامانی خۆی تێدا حەشار دابوو))[5].

بە گشتی هەرێمەكانی ئازربیجان و ئاران قایمكاری سەربازی زۆریان تێداكرابوو، لەبەرئەوەی ئەو ناوچانە سنوری بوونە **(ثغور)** بەردەوام تووشی هێرشی كورج[6] و ڕۆم و خەزەر و ڕووس و

---

١ حسام الدين النقشبندي: مدن وقلاع مندرسة في اقليمى شهرزور و لورستان الشمالية (الصغرى) ومعاولـه في تعيين مواقعها، مجلة (هزار ميرد)، العدد(٢) للسنة السادسة، (السليمانية :٢٠٠٢)، ص١٨٥.

٢ تقويم البلدان، ص٣٩٥.

٣ شەرەفخانی بەدلیسی : شەرفنامە، ل٤٤٧، ئەولیا چەلەبی : سیاحەتنامە، ل ل ١٠٣- ٣٠٥,

٤ احسن التقاسيم، ص٢٨٤.

٥ تقويم البلدان، ص٣٩٧ . ولآتناسانی دیكةش هـةمان بؤضوونیان هةیـة لـة بـارةی سـةختی و قـایمی قةلآكـة. المقدسی: احسن التقاسيم، ص٢٨٤، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ١/ ٣٥١، القزوينى: اثار البلاد، ص٣٩٤.

٦ كورج: نەتەوەیەكی كریستیان بوون، لە چیاكانی قەوقاز لە وڵاتی سریر نیشتەجێ بوون، دواتر توانیان دەست بەسەر شاری تەفلیس دابگرن، ياقوت الحموى: معجم البلدان، ٤/ ٤٤٦.اسماعيل شكر رسول: الامارة الشدادية، ص ص ١٢٨- ١٢٩، احمد عبدالعزيز محمود: الامنارة الهذبانية، ص ص ١٥٠- ١٥١.

ئەرمەنەکان دەبوونەوە. هەر بۆیە دوای فەتح کردنی ئەو ناوچانە لەلایەن موسلمانەکان زۆرێک لە شارەکانی قایمکاری زۆریان تێداکرا بەمەبەستی پاراستنیان لە هێرشی دوژمنان[1].

**دووەم/ شورەکان (الاسوار):**

شورە بە یەکێك لە تایبەتمەندیە دیارەکانی شار دادەنرێت و هەر لە کۆنەوە بە دەوری شاردا دروست دەکرا و تاڕادەیەکیش بۆ دوو ئەرك و مەبەستی بەجێدەهێنا، یەکەمیان وەکو ئامادەکاریەکی سەربازی بنیاددەنرا بۆ پاراستنی شارەکە لە هەر هێرشێکی دەرەکی، دووەم لە ڕێگایەوە دەتوانرا چاودێری و سەیتەرە لەسەرخەڵکی شارەکە بکرێت[2].

دیارە شورەش وەکو یەکێك لە دامەزراوە سەربازیەکان گرنگی پێدراوە لەلایەن ئەبولفیدا لە زۆرێك لە شارە کوردنشینەکان ئاماژەی پێکردوون.

ئەوەتا لە بارەی شاری میافارقین جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە شورەیەکی لەبەرد دروستکراوی هەبووە[3]، هەرچی گەڕیدەی فارسی ناسر خەسرۆیە ئەوا زیاتر زانیاری لە بارەیەوە خستۆتەڕوو کاتێك ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو شارە دەوردراوە بە شورەیەکی گەورەو دروستکراوە لە بەردی سپی، هەر بەردێك بە پێنج سەد مەن[4] مەزەندە دەکرێت[5].

لەگەڵ ئەوەی ستایشی زۆری شورەی شارەکە کراوە لەلایەن وڵاتناسان[6]، بەڵام تێبینی ئەوە دەکرێت کە ئەلمقدسی لەلایەن خۆیەوە بیروبۆچونێکی جیاوازی هەیە بەشێوەیەك باس لەوە دەکات ((دامەزراوەکانی ئەو شارە لە بەردو قووڕ دروستکراوە و شورەی شارەکەش بەهێزو قایم نیە))[7].

هەروەها شاری موسڵیش شورەدار بووە، هەروەکو ناوبراو باس لەوە دەکات ((سورەی شارەکە گەورەتر بووە لە شورەی شاری دیمەشق، بەڵام لە ڕۆژگاری ئێمەدا سێ لە سەر چواری تێکچووەو وێران بووە))[8].

---

١ فرهاد حاجي عبوش: المدينة الكوردية، ص٥٩.

٢ تقويم البلدان، ص٢٧٩.

٣ پێنج سەد مەن: دەکاتە یەك تەن و نیو، واتە هەر مەنێك سێ کیلۆغرامە، لسترنج : بلدان الخلافه المشرقيه، ص١٤١.

٤ سفرنامة، ص٨.

٥ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٢، مولف مجهول: حدود العالم، ص١٢١.

٦ احسن التقاسيم، ص١٢٨.

٧ .تقويم البلدان، ص٢٨٥.

٨ المصدر نفسه، ص٢٨٣.

هەرچی شاری ژەنگارە، ئەوا شورەیەکی لەبەرد دروستکراوی هەبووە[1]، تەنانەت باس لەوە دەکرێت ((ئەو شارە دوو شورەی هەبووە یەکێکیان بەرزتربووە لەوەی دیکەیان))[2]، ئەوەشیان شتێکی ئاساییە زۆرێك لە شارەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا زیاتر لە شورەیەکیان بۆ دروست دەکرد بە مەبەستی پاراستنی زیاتری شارەکە، بەشێوەیەك ئەگەر شورەی یەکەم تووشی وێرانکردن هات لە شورەی دووەمدا بەرگری کردن بەردەوام بێت.

لەبارەی شورەی شاری ئامەدیش ستایشی زۆری کردووە بەشێوەیەك باس لەوە دەکات ((ئەو شارە شورەیەکی هەیە لەبەردی ڕەش دروستکراوەو نە ئاگر و نە ئاسن کاری تێناکات، هەربۆیە لەو پەڕی بەهێزی و قایمی دایە))[3].

دیارە ئەو شورە لەلای وڵاتناس و گەڕیدەکانی دیکەش زۆر ستایش کراوە بەتایبەتی ناسر خەسرۆی گەڕیدە لە کاتی چوونی بۆ حەجی ماڵی خوا لە ساڵی (٤٣٨ك/ ١٠٤٦ز) بەو شارەدا تێپەڕیووە ئاماژە بەوە دەکات ((ئەو شارە دەورەدراوە بە شورەیەك لەبەردی ڕەش، هەر بەردێك مەزندە دەکرێت بەسەد تاوەکو هەزار مەن، زۆربەی ئەو بەردانەش بەیەکەوە لکێنراون و بەستراونەتەوە بەبێ قوڕ و گەچ، بەرزی ئەو شورەیە بیست باڵ (گەز[4]) دەبێت و پانیەکەشی دە گەز دەبێت))[5].

ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت ئەو شورەیە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمرۆمانـدا مـاوە لـە دەوری شـارە کۆنەکەو هەر ئەوەش وایکردووە کە ئەو گەشتیارانەی کەسەردانی دەکەن زیادەڕۆیی بکەن.

لە ستایشکردنی بەجۆرێك بەیەکێك لە دیاردە سەرسوڕهێنەرەکانی جیهانی دادەنێت و تەنانەت لە دوای شورە بەناوبانگەکەی وڵاتی چین بەپلەی دووەمی دادەنێن[6].

---

١ ابن حوقل: صورة الارض، ص١٩٩، ابن شداد، الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١/ ١٥٥.

٢ تقويم البلدان، ص٢٨٧، وڵاتناسانی دیکەش جەخت لەسەر بەهێزی شورەکەی دەکەنەوە، الاصطخرى : المسالك والممالك، ص٥٣، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠١، تەنانەت یەکێك لە وڵاتناسان ئاماژە بەوە دەکات لەسەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زایینی لەبەربەهێزی و قایمی شورەی شارەکە موسڵمانەکان هیچ شارێکیان ئەوەندی ئامەد قایم و سەخت نەبووە، المقدسی: احسن التقاسيم، ص١٢٨.

٣ باڵ(گەز)، زیاتر بۆ پێوانەکردنی بیناو دامەزراوەکان بەکارهاتووەو دەکاتە (٥٠ بۆ ٥٤ سانتیمەتر) ڤالتر هانتس: المكاييل و الاوزان الاسلاميه، ص٨٨، بەو پێیە بەرزی شورەکە دە مەترەو پانیەکەشی پێنج مەترە.

٤ سفرنامة، ص٨.

٥ زهير عبدالملك: الاكراد وبلادهم كردستان بين سوال وجواب (ستوكهولم:١٩٩٩)، ص٣٠٨.

٦ تقويم البلدان، ص٤١٧.

بەهەمان شێوە لە بارەی شاری هەولێریش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە شارێکی شورەدار بووە[1].

لەبارەی هەرێمی رۆژئاوای چیاش، تەنیا باس لەوە دەکات کە شاری هەمەدان شارێکی گەورەیەو چوار دەرگای هەبووە[2]، ئەوەش مانای وایە کە شارێکی شورەدار بووە، هەربۆیە باس لەوە دەکرێت ((ئەو شارە شورەیەکی وەکو سنور لە دەوریدا هەبووەو چوار دەرگای ئاسنیشی هەبووە))[3].

هەروەها لە هەرێمە کوردنشینەکانی دیکەش شاری شورەدار هەبووە، بەشێوەیەك شاری بەدلیس لە ئەرمینیا بە شورە دەورەدراوە، بەڵام لە رۆژگاری ئەبولفیدا نیوەی تێکچووبوو[4].

بەهەمان شێوە شاری خەلاتیش شورەیەکی وێرانی هەبووەو لە گەورەیا بەقەد شورەی شاری دیمەشق دەبێ[5]، ڕەنگە ئەوەشیان لەبەرئەوە بووبێ ماوەیەك ژیانی لەو شارە بردۆتە سەر و زۆر سەرسام بووە بە شورەی شارەکە لە ڕووی سەختی و گەورەی، لەبەرئەوە شورەی زۆرێك لە شارەکانی بەشورەی دیمەشق بەراورد کردووە.

سەرەڕای ئەوانەی کە باسکران، شورەی دیکەش بوونی هەبووەو ناوبراو لەلایەن خۆیەوە ئاماژەی پێنەکردووە، وەکو شاری دوین لە ئەرمینیا کە شورەیەکی لە قوڕ دروستکراوی هەبووە، بەڵام کەرجەکان لە ساڵی (٥٥٠ك/ ١١٥٥ز) تێکیانداو دووبارە لە شوێنی ئەو شورەیەکی دیکە بۆ شارەکە دروستکرا[6]، هەروەها شاری سەلماسیش لە ئازربیجان شورەیەکی لەبەرد دروستکراوی هەبووە[7].

لە کۆتاییدا ماوە بڵێین زۆرێك لە شورەی شارە کوردنشینەکان تووشی وێرانکردن و تێکچوون هاتوون بەهۆی دوو هۆکارەوە، یەکەمیان: هۆی هۆکاری سروشتی وەکو بوومەلەرزەو تۆفان زۆرێك لە شورەکان تووشی تێکچوون یاخود تێکچوونی بەشێکیان بوون، دووەم بەهۆی

---

١ الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٧، ابن حوقل: صورة الارض، ص٣٠٨.

٢ تقويم البلدان، ص٣٩٥.

٣ نفس المصدر والصفحة.

٤ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٠، المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٨٣.

٥ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٨٩، شاكر مصطفى : المدن في الاسلام، ١/ ٤٥٤.

٦ فرهاد حاجي عبوش: المدينة الكوردية، ص ص٦٠- ٦١.

٧ تقويم البلدان، ص٣٩٥.

هۆكاری مرۆڤیش كە زیاتر خۆی دەبینییەوە لەو هێرش و پەلاماردانە سەربازیەكان ژمارەیەك لە شورەكان تووشی وێرانكردن و تێكچوون بوون[١].

**سێیەم / خانووبەرەو ساختمانەكان:**

هەروەكو لە پێشتردا ئاماژەمان پێكرد لایەنی بیناسازی و ئاوەدانكاری سەرجەم سیماو ڕواڵەتە دیارەكانی شارەكان لە خۆدەگرێت، بەڵام ئەوەی لێرەدا تێبینی دەكرێت ئەبولفیدا نەهاتووە باس لە خانووبەرەو كۆشكەكانیان بكات، بەڵكو لە هەندێك شاردا باسی لەو پێكهاتانە كردووە كە لە دورستكردنی خانووبەرەكانیان بەكاریان هێناوە، هەروەكو شاری مەلازگرد لە ئەرمینیا باس لەوە دەكات ((بیناو دامەزراوەكانی بە گشتی لەبەردی ڕەش دروستكراوە))[٢]، لەوەشیاندا بۆمان بەدیاردەكەوێت كە ئەو جۆرە بەردە لەو شارەدا بوونی زۆر بووە، بۆیە لە دروستكردنی خانووبەرەو كۆشكەكانیان بەكاریان هێناوە.

لەبارەی شاری تەورێزیش لە ئازربیجان تیشكی خستۆتە سەر ئەوەی لە كاتی دروستكردنی بیناو ساختمانەكانیان گەچكاری و سپیكاری و كاری ڕازاندنەوەیان تێداكراوە، سەرەڕای ئەوەی تەنیا لەو شارەدا باس لەوە دەكات كە قوتابخانەیەكی جوانی تێدا هەبووە[٣].

بەم شێوەیە تەنها وردەكاری لە بارەی ئەو دوو شارە خستۆتەڕوو و باسی لە دامەزراوە مەدەنیە شارستانیەكانی دیكە نەكردووە و تەنها باسی لەو پێكهاتانە كردووە كە لە دروستكردنیان بەكارهاتوون، دیارە لە سەرچاوەكانی دیكەش باس لەوە كراوە كە بە گشتی لە شارە كوردنشینەكان زیاتر خانووەكانیان لەبەردو قوڕو دار دروست دەكرد ئەو پێكهاتانەش سروشتی بوون لە ناوچەكەدا بوونیان هەبووە وە بەنرخێكی گونجاویش دەست دەكەوتن[٤]، ئەوە سەرەڕای ئەوەی زۆر جار بۆ مەبەستی ڕازاندنەوەو جوانكردنی خانوو ساختمانەكانیان بەردی مەڕمەڕو گەچكاریشیان بەكاردەهێنا، بێگومان ئەوانەش لە ناوچەكەدا بوونیان هەبوو[٥].

---

١ المصدر نفسه، ص٤٠١.

٢ فرهاد حاجي عبوش: المدينة الكوردية، ص ص ٦٠- ٦١.

٣ تقويم البلدان، ص٣٩٥.

٤ المصدر نفسه، ص٤٠١.

٥ ابن حوقل: صورة الارض، ص ص ٢٩٢، ٣٠٨، المقدسي: احسن التقاسيم، ص ص ١٢٨، ٢٨٤.

# تەوەرەی سێیەم

## لایەنەکانی دیکە

هەندێك لایەنی دیکەی شارستانی هەرێمە کوردنشینەکان لە کتێبەکەیدا بەدیدەکرێت بە بەراورد لەگەڵ لایەنەکانی کە لە پێشتردا باسیان لێوەکرا زانیاری کەمتر لە بارەیانەوە خستۆتەڕوو، بەڵام لەبەر گرنگی ئەو لایەنانەو تیشك خستنەسەریان لەلایەن ئەبولفیداوە دەکرێت لێرەدا بەو شێوەیە بیانخەینەڕوو:

**یەکەم/ لایەنی کۆمەڵایەتی:**

لایەنی کۆمەڵایەتی هەر میللەت و کۆمەڵگایەك بەیەکێك لەلایەنە هەرە گرنگەکانی شارستانیەت دادەنرێت، لەبەرئەوەی پەردە لەسەر زۆر لایەنی کۆمەڵگا لادادەدات وەکو پێکهاتەی دانیشتوان و چین و توێژەکانی و ئایین و بیروباوەڕو هەروەها داب و نەریت و هەڵسوکەوت و خورەوشتیان و بۆنەو یادە گرنگەکانیان.

سەرەڕای گرنگی ئەو لایەنە،ناوبراو کەم پرژاوەتە سەری بەبەراورد لەگەڵ سەرچاوەکانی دیکەی پێش خۆی لەم بوارەدا، بەتایبەتی ئەلمەقدسی لە دوای باسکردنی هەر هەرێمێك لەو پانزە هەرێمەی باسیکردووە بابەتێکی تەرخانکردووە زانیاری زۆر وردی خستۆتەڕوو، هەروەها ئیبن حەوقەلیش لە بارەی پێکهاتەی هەرێمەکان زانیاری زۆری خستۆتەڕوو، کەچی ئەبولفیداش کتێبەکەی لە بارەی وڵاتناسیە، بەڵام زۆر خۆی لە قەرەی ئەو بابەتانە نەداوە، بەڵکو زیاتر زانیاری جوگرافی خستۆتەڕوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێرەدا بە گوێرەی وتەکانی خۆی دیارترین سیماو تایبەتمەندیەکانی ئەو لایەنەش بەو شێوەیە باسیان لێوەدەکرێت:

١-  پێكهاتەی مرۆیی:

سەبارەت بە پێكهاتەی مرۆیی هەرێمە كوردنشینەكان، دەكرێت باس لەوە بكرێت لەم هەرێمانەدا لە پاڵ كورد نەتەوەیی دیكەش ژیاون وەكو فارس و عەرەب و تورك و ئەرمەن و سریان، لە هەمان كاتدا بە پێی سەردەم و گۆڕانكاریە ڕامیاریەكان گۆڕانكاری بەسەر پێكهاتەی مرۆیی ناوچەكە هاتووە.

لەلایەكی دیكەش ئەبولفیدا خۆی كتێبەكەی لە نیوەی یەكەمی سەدەی هەشتەمی كۆچی / چواردەهەمی زایینی نووسیوە، بەڵام نەهاتووە باس لە بارودۆخ و پێكهاتەی دانیشتوانی ئەو كات بكات، بەڵكو زیاتر زانیاری سەرچاوەكانی پێش خۆی دووبارە كردۆتەوە و شتی زیاتری نەخستۆتەسەریان تەنیا لە هەندێك شوێن هەڵەو كەم و كوڕیەكانی چارەسەركردووە.

ئەوەی لێرەدا بەلای ئێمەوە گرنگە چۆنیەتی ناوهێنانی كوردو هۆزە كوردیەكانە لەو هەرێمانەدا، بەڵام ئەوەی تێبینی دەكرێت لەگەڵ ئەوەی كە خۆی كورد بووە، كەچی زۆر ڕەنگدانەوەی بەسەریەوە نەبووەو تەنیا لە تەواوی كتێبەكەیدا چەند جارێك ناوی هێناوە، ڕەنگە ئەوەشیان پەیوەندیی هەبووە بە ڕێبازی نووسینی ئەو كات و لە هەمان كاتدا دەكرێت باس لەوە بكرێت كە هەستی نەتەوایەتی لەو كاتدا ئەوەندە پەرەی نەسەندبوو بۆ ئەوەی لە نووسینەكانیان ڕەنگدانەوەی هەبێ بەسەریان بە جۆرێك زیاتر لە نەتەوەكانی دیكە تیشك بخاتە سەر نەتەوەی خۆیان، هەر بۆیە لێرەدا بەدیاردەكەوێت لەم ڕووەوە هەمان ڕێچكەی وڵاتناسانی پێش خۆی گرتۆتەبەر.

ئەوەتا لەبارەی چیاكانی لورستان باس لەوە دەكات ((خەڵكانێكی زۆرن لە كوردان و دەسەڵاتداریش هەر لە خۆیانە))[1]، ئەو بۆچوونە لای وڵاتناسانی دیكەش پشت ڕاستكراوەتەوە بەشێوەیەك باس لەوە دەكرێت ((زۆرینەی لە وڵاتی لوڕدا كوردن))[2]، هەروەها یاقوتی حەمەویش جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە نەتەوەیەكن لە كوردان و لەو چیایانەدا دەژین كە كەوتۆتە نێوان ئەسفەهان و خۆزستان، بەو ناوچەیە گوتراوە وڵاتی لوڕ یاخود لوڕستان[3].

---

١ تقويم البلدان، ص٤١٣.

٢ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٣٢.

٣ معجم البلدان، ٥/ ١٦.

هەروەها لەبارەی هەردوو شاری شارەزوور و سوهرەوەردیش ناوی کوردی هێناوە و باس لەوە دەکات ((زۆرینەی دانیشتوانیان پێکهاتبوو لە کوردان))[1].

لەبارەی شاری دوینیش لە هەرێمی ئەرمینیا ئاماژە بەوە دەکات ((مەلیك و ئەندامانی ماڵباتی ئەیوبییەکان دەدرێنە پاڵ ئەو شارە))[2]، دیارە ڕەچەڵەکی ئەو بنەماڵەیە هەمان ڕەچەڵەکی خۆیەتی کە دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی ڕەوادی کوردی[3].

بەم شێوەیەك تەنیا لەم چەند شوێنە ناوی کوردی هێناوە، لە بارەی هۆزە کوردیەکانی دیکەو شوێنی نیشتەجێبوونیان ئەوا لە پێشتردا باس لە هەرێمە کوردنشینەکان و دیارترین هۆزەکانیان کراوە، هەر بۆیە لێرەدا پێویست ناکات دووبارە باسیان لێوەبکرێت[4].

سەرەڕای بوونی کورد نەتەوەی دیکەش لە پاڵ کورد لەو هەرێمانەدا ژیاون و ئەبولفیدا ئاماژەی پێنەکردوون وەکو عەرەب کە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری فتوحاتی ئیسلامی و لە دواتردا لە چەند شوێنێك نیشتەجێ بوون، تەنیا هەرێمی جەزیرە نەبێت لە پێش فتوحاتیش بوونیان هەبووە تیایدا، ئەوەشیان پەیوەندی هەیە بەو هۆزە عەرەبە مەڕدارانەی کە لە دوای لەوەڕگاو ئاوی زۆر دەگەڕان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان لە هەرێمەدا نیشتەجێ بوون، ئەوە سەرەڕای نزیکی سنوریان لەو هەرێمەوە، هەر بۆیە تێبینی ئەوە دەکرێت بەشێکی زۆری شارە کوردیەکان بەناوی ئەوانەوە کراوە بەتایبەتی هۆزەکانی بەکردو ڕەبیعەو موزەر، تەنانەت چەند هۆزێکی دیکەش لەو هەرێمەدا نیشتەجێ بوون بۆ هەمان مەبەست[5].

لەبارەی هەرێمەکانی دیکەش زیاتر لەدوای کرداری فتوحات، هەندێك لە هۆزە عەرەبەکانی بەخاو خێزانیان لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بوون بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی کۆڵکەو بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وێڕای ئەوەش لە هەندێك هەرێمدا زۆر بە کەمی نیشتەجێ بوون بەتایبەتی لەرۆژئاوای هەرێمی چیا، لەبەرئەوەی سروشت و ئاوهەوای ناوچەکە جیاواز بووە

---

١ تقويم البلدان، ص٤١٥، ولآتناسانی ئێشوو تریش هەمان بۆچوونیان هەیە، الاصطخري: المسالك والممالك، ص١١٨، ابن خوقل :صورة الارض، ص٣١٤.

٢ تقويم البلدان، ص٣٩٩

٣ ابن خلكان: وفيات الاعيان، ٧/ ١٣٩

٤ بۆ زانیاری لەبارەی بوونی کورد لە شارو هەرێمە کوردنشینەکان بڕوانە: بەشی سێیەم.

٥ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٠٥، المقدسي : احسن التقاسيم، ص١٢٥، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ٤٩٤.

لەگەڵ ئاوهەوای دوورگەی عەرەب و ڕانـەهاتبوون لەگـەڵ ئـەو جـۆرە ناوچـانەوە، هـەر بۆیـە بەڕێژەیەکی کەم لە بەشێك لە شارەکانی ئەو هەرێمە نیشتەجێ بوون[1].

سەبارەت بە نەتەوەی فارسیش، ئەوا پێکهاتەیەکی زۆریان لە دانیشـتوانی ناوچـەکە پێـك دەهێنا، لەبەرئەوەی هاوتخوبی یەکتر بوونەو هەر لە کۆنـەوە لەگـەڵ یـەکترداژیاون، ئـیتر هـەر ئەوەش وایکردووە یەکێك لە رۆژهەڵاتناسان باس لەوە بکات ((ئەگەر کوردو فارس برانەبن ئەوا زۆر لەیەکترەوە نزیکت))[2]، بەتایبەتی لە ناوچەکانی رۆژئاوای چیا، بۆیە تێبینی ئەوە دەکرێـت لە کۆتایەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی / نۆیەمی زاینی باس لە پێکهاتەی مرۆیی زۆرێـك لـە شارەکانی ئەو هەرێمە کراوە وەکو شارەکانی سەیمەرەو حولوان و دینەوەر و نەهاوەندو فارس لە پاڵ کوردا ژیاون[3].

سەرەڕای نزیکیان لە یەکتریەوە هۆکارێکی دیکەش هەبووە بۆ بوونی فارس لـەو ناوچـانەدا ئەویش ڕێگای بازرگانییـە، کاتێـك ئـەو رێگایانـەی رۆژهـەڵاتی جیهـانی ئیسـلامی بـەناوە ئیسلامیەکان دەبەستایەوە بە زۆرێك لە شارە کوردیەکانی وەکـو هەمـەدان و چـەند شـارێکی دیکە تێپەڕدەبوو، ئەوەش وایدەکرد لە زۆرێك لە شارەکاندا نیشتەجێ بن[4].

لەبارەی بوونی نەتەوەکانی دیکەش وەکو تورك و ئەرمـەن و سـریان و چـەند نەتەوەیـەکی دیکەش، ئەوا بە پێی پێشهات و گۆڕانکرایەکانی سەردەم لە ناوچەکەدا بوونیان بـە ڕێژەیـەکی دیار بەدیار کەوتووە.

٢- ئایین و بیروباوەڕ:

لە بارەی ئایین و بیروباوەڕیش، تێبینی ئەوە دەکرێت کە ئەبولفیدا کەم پرژاوەتە سـەر ئـەو بابەتەو تەنیا لە هەندێك شاردا ئاماژەی بە ڕێژەی کڵێساو مزگەوتەکانی کردووە کە دەکرێت لە ڕێیانەوە دیاری بکرێت کە لەو شارەدا کامە ئایین زۆر بڵاوبووە تێدا، بەڵام لەوەشیاندا دەکرێـت باس لەوە بکرێت ڕەچاوی کات و سەردەم نەکراوە بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی باسی لێوەکراوە.

---

١ نیشتمان بشیر محمد: الاحوال السیاسیة والاجتماعیة والاقتصادیة، ص٨٣.

٢ مینورسکي: الاکراد احفاد المیدیین، ترجمة وتعلیـق: کمـال مظهـر، مجلـة مجمـع العلمـي الکـردي، العـدد (١)، (بغداد:١٩٧٣)، ص٥٥٦.

٣ الیعقوبي: البلدان، ص ص ٧٢، ٧٥، ٧٦، ٨٣.

٤ ارثـر کریستنسـن: ایـران في عهـد الساسـانیین، ترجمـة : یحیـی الخشـاب، راجعـة : عبـدالوهاب عـزام، (القاهرة:١٩٥٧)، ص١١٥.

دیاره پێش فتوحاتی ئیسلامی بۆ ناوچەکە چەند ئایین و ئاینزایەك بە گشتی بوونیان هەبووە وەکو ئایینی زەردەشتی [1] و مەسیحی یەهودی.

وە لە دوای فەتح کردنی ناوچە کوردنشینەکان ئایینی پیرۆزی ئیسلام بووە ئایینی سەراپاو ئەو خەڵکانەی لەسەر ئایینی خۆیان مانەوە بوونە کەمینەو لە پاڵ موسڵمانەکان ژیانیان بەسەردەبردو پێیان دەگوترا خاوەن کتێب (اهل الذمە) بە درێژایی مێژووش لە کۆمەڵگای ئیسلامی ئازادبوونە لە بەجێهێنانی تەواوی ئەرك و مەراسیم و بۆنە و شعائرە ئایینیەکانی خۆیان[2].

بوونی ئەو ئایینانەش لە هەرێمەکاندا وەکو یەك نەبووە، بەڵکو لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی دیکە جیاواز بووە، ئەوەتا لە بارەی هەرێمی رۆژئاوای چیا پێش بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام تێدا زۆربەیان لەسەر ئایینی زەردەشتی بوون، ئەوەش لەوەدا سەرچاوەی گرتووە کە ئایینی فەرمی دەوڵەتی ساسانی بووە و ئەو ناوچانەش زیاتر لە ژێر دەسەلاتی ئەواندا بووە[3]، کەچی دوای کرداری فتوحات لەو هەرێمەدا زۆربەیان بوونە موسڵمان و هەندێکیش هەر لەسەر ئایینی خۆیان مانەوە و زیاترینی ناوچەکانیشیان هەرێمی فارس بووە، لەبەرئەوەی مەڵبەندی دەسەلات و ئایین و پەرستگا ئاگرینەکانیان بووە[4]، نەك تەنیا لە هەرێمی فارس بەڵکو لە هەرێمی چیاش بوونیان زۆر بووە، هەر بۆیە ئەلمەقدسی لەسەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایینی ئاماژە بەوە دەکات ((ئاگر پەرست تێدا زۆر بووە))[5]

---

١ ئایینی زەردەشتی: ئەوانەی لە پەیڕەکەرانی زەردەشت پێغەمبەر بوون، خۆی زەردەشت کوڕی بورشابسا (٦٦٠- ٥٨٣پ.ز) خاوەن کتێبی (ئاڤێستا) لە ناوچەکانی ئازربیجان لە نزیك دەریاچەی ورمێ بەدیارکەوت و هەڵسا بە بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی، دواتر ڕووی لە ناوچەکانی ئێران کردو پەری بە بانگەشەکەی دا تاوەکو تەواوی هەرێمی فارس هاتنە سەر ئەو ئایینەو لە قۆناغەکانی دواتریشدا بووە ئایینی فەرمی دەوڵەتی ساسانی، نوری اسماعیل: الدیانە الزرادشیتیە مزدینسا، (دمشق: ١٩٩٥)، ص ص ٦- ١٨، ارثر کریستنسن: ایران في عهد الساسانیین، ص١٣٠.

٢ الماوردي: الاحکام السلطانیة والولایات الدینیة: تحقیق: سمیر مصطفی رباب(بیروت:٢٠٠٣)، ص ص ١٦٤- ١٦٧، توفیق سلطات البوزبکي: دراسات في النظم العربیة الاسلامیة، (بغداد:١٩٧٩)، ص ص ٢٢٩- ٢٤٠.

٣ ارثر کریستنسن: ایران في عهد الساسانیین، ص١٣٠.

٤ الاصطخري: المسالك والممالك،ص٨٤، ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٥٥.

٥ احسن التقاسیم، ص٢٩٦.

جگە لەم ئایینە لەو هەرێمەدا ئایینی دیکەش بـوونی هـەبووە، وەکـو ئـاییـنی جوولەکـە، لێرەدا ئەبولفیدا باس لەوە دەکات کە لە شاری ئەسفەهان[١] پەیڕەوکـەرانی زۆر بـووە[٢]، لێـرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە هەرچەندە ئەو شارە لـە رۆژئـاوای هـەرێمی چـیا نـەبووەو تەنانـەت کوردنشینش نەبووە، بەڵام بوونی لەو شـارەدا واتـای وایـە کـە لـە شـارەکانی دیکەشـی ئـەو هەرێمەدا بوونی هەبووە، بۆیە باس لەوە دەکرێت ((لەو هەرێمەدا جوولەکە زۆر زیاتر بـووە لـە کریستیانەکان (مەسیحی) و کەمتر بوونە لە ئاگرپەرستەکان))[٣].

بەهەمان شێوە بۆ دەرخستنی ئـەو ڕاسـتیەش، گەڕیـدەی جوولەکـە بنیـامین توتـەیلی (م٥٦٩ك/ ١١٧٣ز) لە گەشتەکەیدا بۆ ناوچەکانی رۆژهەڵات ئاماژەی بە ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکە کردووە لـەم هەرێمەدا، بەشێوەیەك لە بارەی شاری هەمەدان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە.

پەنجا هەزار جوولەکە تێـدا بـووەو نەهاوەنـدیش لـە ناوچـەکانی دەوروبـەری چـوار هـەزار جوولەکە لە چیاکانیدا نیشتەجێ بوونە[٤].

هەرچـی بـوونی ئـایینی مەسـیحیە، ئـەوا لـە ئاماژەکردنـەکانی یـەکێك لـە وڵاتناسـان بەدیاردەکەوێت کەوا بوونی هەبووە، بەڵام ڕێژەی کەمتر بـووە لـە یـەهودی و ئاگرپەرسـتەکان (زەردەشتی)[٥].

لە هەرێمی جەزیرەش، تێبینی ئەوە دەکرێت ئایینی مەسـیحی تێـدا زۆر بڵاوبـووەو بگـرە لەوەش زیاتر بە چەند سەدەیەك پێش هاتنی ئیسلامیش لـەو هەرێمـەدا بـوونی هـەبووە، لـە یەکێك لە شارەکانی ئەبولفیدا باس لەوە دەکات مەسیحی تێدا زۆر بووە، ئەوەشیان لەبەربوونی کڵێساو ژمارەیەکی زۆر لە دێری کریستیانەکان، تێیدا باس لەوە دەکات لە شاری روها (ئورفە) کڵێسایەکی گەورەو زیاتر لە سێ سەد دێری تێدا بووە[٦]، هۆکاری بڵاوبوونی ئەو ئایینـەش بـەو

١ ئەسفەهان: شارێکی گەورەو بەناوبانگە لە هـەرێمی چـیا (تەنانـەت وەکـو ناوچـەیەکی پـان و بـەرین وایـەو دوو شـار دەگرێتەخۆ) یەکێکیان شاری (جیا) بوو دواتر ناوی گۆڕا بۆ (الیهودیه)، یاقوت الحموی: معجم البلدان، ١/ ٢٠٦.

٢ تقویم البلدان، ص٤١١.

٣ المقدسي : احسن التقاسیم، ص٢٩٦.

٤ رحله بنیامین التطیلي، ص ص ١٥٤- ١٥٨، هەرچەندە ئەو ژمارانە زیدەڕۆیی زۆری تێدایە، بەڵام دەیەوێت وا نیشان بداتکە جوولەکە تێدا زۆر بووە.

٥ المقدسي: احسن التقاسیم، ص٢٩٦.

٦ تقویم البلدان، ص٢٧٧.

شێوەیە لەو شارەدا، دەکرێت باس لەوە بکرێت زیاتر لەبەر نزیکی سنوری بووە لە دەوڵەتی ڕۆمی بێزەنتی و تەنانەت وەکو مەڵبەندێکیش وابووە بۆ کریستیانەکانی ئەو هەرێمە.

هەروەها ئایینی یەهودیش بوونی هەبووە لەو هەرێمەدا، بەلاّم بەشێوەیەکی کەمتر لە مەسیحیەکان، هەروەکو چۆن لە شارەکانی ئاماژەی ئاوا بەرچاو دەکەوێت کە جوولەکە بوونی هەبووە وەکو شاری ئامێدی نزیکەی بیست و پێنج هەزاری تێدا هەبووە[1]، لە جەزیرەی ئیبن عومەریش چوار هەزارو لە موسڵیش حەوت هەزار جوولەکە هەبووە[2].

هەرچی هەرێمە کوردنشینەکانی دیکەیە، ئەوا دوای فتوحاتی ئیسلامی تیایاندا ئایینی ئیسلام بووە ئایینی سەراپاو ئەوانی دیکە بوونە کەمینەو لەسەر ئایینی خۆیان مانەوە بە جۆرێك ئەبولفیدا لە بارەی شاری دوین لە ئەرمینیا باس لەوە دەکات ((لەو شارەدا کریستیانی زۆر بووەو مزگەوتی شارەکە دەکەوێتە لایەکی کڵێسای شارەکەوە))[3]، ئەو بۆچوونە لای ولاّتناسانی دیکەش هەبووەو جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە زۆرینەی پێکهاتەی دانیشتوانی شارەکە کریستیان بوون[4]، لە بارەی بوونی ئایینی زەردەشتیش، بوونی مابوو لەو هەرێمانەدا، بەتایبەتی لەشاری شیز لە ئازربیجان پەرستگای ئاگری تێدا هەر مابوو[5].

هەرچی بوونی جوولەکەیە لەم هەرێمانەدا، ئەوا لەسەرچاوەکاندا تێبینی ئەوەمان نەکرد بەڕێژەیەکی ئاوا هەبێ کە شیاوی باسکردن بێت.

٣- سیفات و خوڕەوشت و مۆرکە گشتیەکان:

یەکێکی دیکەیە لەو لایەنە کۆمەلاّیەتیانەی ناوبراو لە لایەن خۆیەوە تیشکی خستۆتە سەر، بەتایبەتی لە هەندێك لە شاری هەرێمە کوردنشینەکان باسی لە هەندێك سیفات و خورەوشت و مۆرکە گشتیەکانی خەڵکەکەی کردووە.

دیارە بوونی هەندێك تایبەتمەندی لەم لایەنەدا زۆرجار پەیوەندی هەیە بە سروشت و ئاوهەوای ناوچەکە بەشێوەیەك کاریگەری و ڕەنگدانەوەی دەبێ لەسەر تاکەکانی کە هەندێك

١ بنيامين التطيلي: رحلة بنيامين التطيلي، ص١٥٤.

٢ المصدر نفسه، ص ص ١٢٦- ١٢٧.

٣ تقويم البلدان، ص٣٩٧.

٤ ابن حوقل: صورة الارض، ص٢٩٤، المقدسي: احسن التقاسيم،ص٢٨٣.

٥ ابن خرداذبة: المسالك والممالك، ص١٠٦، ياقوت الحموي: معجم البلدان، ٣/ ٣٨٣.

سیفات و مۆرکی ئاوایان لێ بەدیاربکەین و جیابکرێتەوە لە خەڵکانی ناوچەکانی دیکە، لەوەشیاندا ئەبولفیدا ئاماژە بە شاری شارەزوور دەکات لە رۆژئاوای هەرێمی چیا کە شارێکی سەخت و سارده و هەر ئەوەش وایکردووە کوردەکانی ئەو شارە تووندو دڵڕەق بن[1]، ئەو بۆچوونە لای وڵاتناسی دیکەش جەختی لەسەر کراوەتەوە کاتێك باس لەوە دەکرێت ((هەرێمی چیا سەخت و ساردو سۆڵە و ماڵی کوردە دڵڕەقەکانە))[2]، لێرەشدا بە ڕوونی بەدیاردەکەوێت کە ژینگەو ئاوهەوای ناوچەکە کاریگەری هەبووە لەسەر ئەوەی کە کوردەکان بە توندو دڵڕەق بناسرێن، ئەوەش خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر بەهێزی و خۆڕاگری و پێداگریان بۆ سەختی و ساردو سۆڵی ناوچەکەیان، هەر ئەوەش وایکردووە بە نەتەوەیەکی تووندو بەجەرگ بناسرێن [3].

هەروەها لە بارەی هەندێك شاری دیکە بۆچوون و سیفاتی ئاوا دەخاتەڕوو تا ڕادەیەکی زۆر جیاوازە لە وڵاتناسانی دیکە، هەروەکو چۆن باس لەوە دەکات هەندێك لە گەورە پیاوانی هەمەدان دەڵێن : ((هەمەدان بۆ من شارێکە، دان بە چاکەیەکی دەنێم، بەڵام لە ڕاستیدا خراپترین و ناشیرنترینی وڵاتانە. چونکە منداڵەکانیان لە خراپی و ناشیرینیدا وەکو بەساڵاچووەکانیانن، پیرەکانیش لەلایەنی عەقلیانەوە وەکو منداڵەکانن))[4]، لێرەدا دەیەوێت وا نیشان بدات کە ئاو واناڵێت، بەڵکو هەندێك لە گەورە پیاوانی شارەکە لە بارەی خەڵکەکەوە ئەو بۆچوونەیان هەیە.

لە ڕاستیدا نازانرێت ئەو بۆچوونە لە چیەوە سەرچاوەی گرتووە، هەرچەندە باس لەوە دەکرێت کە خەڵکی دینەوەر باشترین لە خەڵکی هەمەدان[5]، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نیە کە بەو شێوەیە خراپ بوونە، چونکە یەکێك لە وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی / دەیەمی زایینی زۆر ستایشی خەڵکەکەی کردووە بەشێوەیەك باس لەوە دەکات ((نەتەوەیەکن خەڵك دۆستن و کەسانی ڕێبواریان زۆر خۆش دەوێت))[6].

---

١ تقويم البلدان، ص٤١٣.

٢ اليعقوبي : البلدان، ص٢٠.

٣ حكيم احمد خوشناو: الكردوبلادهم، ص٢٣٦.

٤ تقويم البلدان، ص٤١٧.

٥ ابن حوقل: صورة الارض، ص٣٠٨.

٦ المقدسي: احسن التقاسيم، ص٢٩٤.

بەو شێوەیە ئەبولفیدا تەنیا باسی سیفات و خوڕەوشت و مۆرکەکانی خەڵکی ئەو دوو شارەی کردووە و گەڕیدە ولاتناسی دیکەش هەبوونە باسیان لەم ڕووانەوە کردووە، بەشێوەیەك لەبارەی خەڵکی موسڵ باس لەوە دەکرێت کە ((بەگشتی خەڵکی موسڵ کەسانی ڕێبواریان خۆش دەوێت و ڕێز لە هەژارنیش دەگرن))[1]، بەهەمان شێوە لە بارەی شاری نەسیبین دەڵێن: ((خەڵکێکی باش و دیندار و ڕاستگۆ و دەست پاکن))[2].

لەبارەی شاری کنجەش لە هەرێمی ئاران جەخت لەسەر ئەوە دەکرێتەوە کە ئەو شارە لە ناوچە سنوریەکان بووەو بەردەوام تووشی هێرش و پەلاماردانی دەرەکی بووە، هەر بۆیە خەڵکی ئەو شارە مەیلیان بۆ شەڕ دەچێت و خۆڕاگر و ئازاو چاونەترس بوونە[3].

**دووەم/ لایەنی زانستی و رۆشنبیری:**

وەکو یەکێك لە لایەنە گرنگەکانی شارستانیەت کۆمەڵێك زانست و دامەزراوەی زانستی گرنگ لە خۆدەگرێت، وەکو دامەزراوە فێرکاریەکان و ئەو زانستە دیارانەی کەوا تێیاندا لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە ئەبولفیدا تەواوی بوارەکانی ئەو لایەنەی نەخستۆتەڕوو، بەڵکو تەنیا تیشکی خستۆتە سەر ئەوەی کە لە هەندێك شاری هەرێمە کوردنشینەکان چەند زاناو بیرمەندێك بەدیارکەوتوون و تەنانەت ناونیشان ناهێنێ، تەنیا لە شاری مەیانە (میانج) نەبێ لە هەرێمی ئازربیجان باس لەوە دەکات ((لەو شارەدا چەند زانایەك بەدیارکەوتوون و لە دیارترینیان دادوەر ئەبولحەسەن بووە))[4] و هیچ وردەکاریەکی دیکە ناخاتەڕوو، کەچی لەسەرچاوەی دیکەدا ئاماژە بەوە کراوە کە ناوی عەلی کوڕی حەسەن کوڕی عەلی مەیانجیەو ناسراوە بە ئەبوحەسەنی مەیانجی، لەبەرئەوەی خەڵکی ئەو شارە بووە[5].

لەبارەی ساڵی لەدایك بوونی لەسەرچاوەکانی ژیننامەو چینەکان هیچ زانیاریەکی ئەوتۆی ناخەنەڕوو، بەڵکو تەنیا باس لەوە دەکرێت کە کەسێکی ناودارو خانەدان و چاکەکەرو جوامێر بووە، وە شارەزاییەکی چاکی لە فیقهی ئیسلامی و لە بواری و هۆنراوەدا هەبووە، هەروەها لە

---

١ ابن بطوطة : رحلة ابن بطوطة، ص١٥١.

٢ المصدر نفسه، ص١٥٢.

٣ القزويني: اثار البلاد، ص٤٩١.

٤ تقويم البلدان، ص٤٠١.

٥ ياقوت الحموي، معجم البلدان، ٥/ ٢٤٠.

ماوەی ژیانیدا کاری دادوەری کردووە لـە شـاری هەمــەدان و هــەر لەوێدالــە سـاڵی (٤٧١ك-١٠٧٨ز) لە مزگەوتی شارەکە شەهیدکرا[١]

بەهەمان شێوە عەبدوڵڵا کوڕی محەمەد کوڕی عەلی کـوڕی حەسـەن، لـە نـەوەی ئەبوحەسـەنی مەیانجیەو یەکێك بووە لە زانا دیارەکانی ئەو شارەو کاری دادوەری کردووە لە شـاری هەمــەدان، زۆر شارەزا بووە لە فیقهی ئیسلامی و هۆنراوەبێژیش بووە، هەر بۆیە لە زیرەکیا وێنەی نەبووە[٢].

هەروەها باس لەوە دەکرێت چەند کتێبێکی داناوە لە شێوەی فەیلەسوفەکان لـە ژێـر نـاوی (زبده الحقائق) و (مدار العیون فی التصرف) و (الرساله الیمینه)، ئەوانــەش بوونــە هۆکـار بـۆ ئەوەی تۆمەتبار بکرێ بەوەی کە بۆتە بێباوەڕ و لە دیـین وەرگـەڕا، هــەر بۆیــە قۆڵبەسـتکراو ڕەوانەی زیندان کرا لە بەغدا، دواتر لە ساڵی (٥٢٥ك/ ١١٣٠ز) گەڕاندیانەوە شاری هەمەدان و لەوێدا لە خاچ درا[٣].

لەبارەی شاری ئەسەد ئابادیش لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیا، باس لەوە دەکات لـەو شارەشـدا چەند زانایەك بەدیارکەوتوون و بەبێ ئەوەی هیچ زانیاریەك لـە بارەیانــەوە بخاتــەڕوو[٤]، کەچـی لەیەکێك لەسەرچاوەکاندا ئاماژە بەوە کراوە کە ((چەند زانایەك بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شارەو لە بواری فەرموودەدا دا زۆر شارەزا بوونە))[٥].

لە دیارترین زاناکانی ئەو شارەش، زوبیر کوڕی عەبدولواحید کوڕی محەمەد کوڕی زەکەریایە و ناسراوە بە (ئەبو عـەبدوڵڵای ئەسەد ئابادی)[٦]، زۆر لێهاتوو بووەو توانایەکی باشی هەبووە لە بەرکردن و دەربڕینداو بۆ گەڕان بەدوای فەرموودە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا گەڕاوەو چاوی بە چەندان کەسایەتی کەوتووە لەو بوارەدا و تەنانەت بەرهەمێکی داناوە بەناوی (الشیوخ والابـواب)، لــە ساڵی (٣٤٧ك/ ٩٥٧ز) لە شاری ئەسەد ئاباد کۆچی دوایی کردووە[٧].

---

١ السمعانی: الانساب، مج٥/ ٣٢٢.

٢ نفس المصدر والصفحة.

٣ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٥/ ٢٤٠، الزرکلي: الاعلام، ٤/ ١٢٣.

٤ تقویم البلدان، ص٤١٧.

٥ یاقوت الحموي: معجم البلدان، ٢/ ١٦٧.

٦ الذهبي: تاریخ الاسلام(حوادث٣٤١- ٣٥٠هـ) ص٣٧٧، ابن العماد الحنبلي: شذرات الذهب، ٢/ ٣٧٥.

٧ الخطیب البغدادي: تاریخ بغـداد ٤٧٢/٨- ٤٧٣ الصـفدي: الـوافي بالوفیـات ٤/ ١٢٥ ابـن العمـاد الحنبلـي: شذرات الذهب، ٢/ ٣٧٥.

